باس و توێژینەوە بڵاوکراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی
دەربڕی بیر و بۆچوونی توێژەرانن نەك دەستەی نووسەرانی گۆڤار


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتیی هونەری: عوسمان پیرداود کواز.
- نەخشەساز: عیسام موحسین نادر.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، شیلان جەلال، ئیمان نەجات.
- ئیمیل و پەیوەندی: شیلان جەلال – موبایل: ٠٧٥٠٤٩٠٢٠٧٥
- ئیمیل: govary.ak@gmail.com
- چاپ: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر.

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی

## ڕێنمایی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

- گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی، گۆڤـارێکی زانسـتی وەرزییـە، بـاس و توێژینـەوەی زانستی تایبەت بە مەسەلەکانی کـورد و کوردسـتان بـڵاو دەکاتـەوە، بەمـەرجێك لـە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یاخود بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
- زمانی بڵاوکردنەوەی باس و توێژینەوەکان لە گۆڤارەکەدا کوردی و عەرەبییـە، ئـەو باس و بابەتانەش کەوا سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کورد و کوردستان هـەبێت، ئەگەر بە زمانی دیکەش بن، بڵاودەکرێنەوە.
- پێویستە توێژەر لە لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکەیدا، ناونیشـانی باسـەکەی، نـاو و ناسناوی زانستی، شوێنی کارەکەی، ئیمێڵ و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی بنووسێت.
- لـە هەڵبـژاردنی ناونیشـان و نووسـینەوەی توێژینەوەکانـدا، پێویسـتە ڕەچـاوی بنـەماکانی میتـودی زانسـتی بکرێـت. لەمەسـەلەکانی پەیوەسـت بـە ڕێکخسـتنی سەرچاوە و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان، وەکو چۆن پێویسـتە نووسـینی بـاس و بابەتـەکان بـە زمـانێکی زانسـتی شـیاو بێـت، بـە پێچـەوانەوە هـەر توێژینەوەیـەك پێڕەوی لەم بنەمایانە نەکات لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە وەلادەندرێت.
- پێویسـتە توێـژەر پوختـەی توێژینەوەکـەی بـە دوو زمـانی دیکـە، جگـە لـە زمـانی نووسـینی دەقەکـەی لـە کۆتـایی توێژینەوەکەیـدا بنووسـێت، بەمـەرجێك لـە یـەك لاپـەڕەی A4 زیـاتر نـەبێت و تیایـدا گرینگـی باسـەکە و ئەنجامـە سـەرەکییەکانی توێژینەوەکەی بخاتە ڕوو.
- هـــەر بـــاس و بابـــەتێك لـــەبارەی ســـاغکردنەوەی (پەیـــدۆزی، تحقیـــق) ی دەستنووسـەکانەوە بێـت. پێویسـتە پەیدۆزییەکـە بـە گـوێرەی بنـەما زانسـتییە کارپێکراوەکانی ئەو بوارە ئەنجام بدرێت. هەروەها چەند لاپەڕەیـەکی کـۆپیکراو و، زانیاری تەواو سەبارەت بە دەستنووسەکە و شوێنی هەڵگرتنی بخرێتە ڕوو.
- دەبـێ بـاس و بابەتـەکان بـەجۆری فـۆنتی یونیکـورد بنووسـرێن. لەمەسـەلەی بـەکارهێنان و ڕێکخسـتنی سەرچـاوەکان پێـڕەوی لـە شـێوازی هارفـارد بکرێـت. ناونیشـانی بـاس و توێژینـەوەکان بـە فـۆنتی قـەبارە (١٥) بێـت، نـاوی توێـژەر و توێژەران لەگەڵ ناونیشانە لاوەکییەکان بە فۆنتی (١٤) و دەقی باسەکەش بە فۆنتی (١٣) بێت.

- لەکاتی سوود وەرگرتن لەو باس و بابەتانەی کە لە گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە، بەم شێوەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکرێت: ناسناو و ناوی نووسەر، ڕێکەوتنی دەرچوون، ناونیشانی باسەکە، ناوی گۆڤارەکە (لەنێوان دوو کەوانەدا)، ژمارەکەی، شوێنی دەرچوون.
- هەموو باس و بابەتێك بە (٣) دانەی سەرکاغەز و دانەیەکی سەر (CD) پێشکەش دەکرێت، بەمەرجێك ژمارەی لاپەڕەکانی، بە هەموو وێنە و خشتە و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە تێپەڕنەکات.
- دوا بەدوای پەسەندکردنی هەر توێژینەوەیەك لەلایەن هەڵسەنگێنەرانی پسپۆڕەوە، توێژەر دانەیەك لە نووسراوی پەسەندکردنی توێژینەوەکەی لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە پێدەدرێت. لەدوای ئەوە توێژەر بۆی نییە باسەکەی پێشکەش بە هیچ لایەنێکی دیکە بکات، بە بێ نووسراوێکی ڕەزامەندی لە لایەن سەرنووسەری گۆڤارەکەوە.
- دەستەی نووسەران ئەو مافەی دەبێت کەوا هەندێك برگەو دەستەواژەی توێژینەوەیەك لابدات، یا بگۆڕێت و دووبارە دابڕێژێتەوە تاوەکو لەگەڵ ڕێنماییەکانی بلاوکردنەوە لە گۆڤارەکە دا بگونجێت.
- چۆنیەتی ڕیزکردنی باس و بابەتەکان پەیوەندی بە ڕێبازی بابەتبەندی گۆڤارەکەوە هەیە نەوەکو بابەت و بایەخی توێژینەوەکان، یاخود پلەو پایەی زانستی توێژەرەوە.
- گۆڤاری ئەکادیمیا ئەو باس و توێژینەوانەی کەوا لە نامەکانی ماستەر و دکتۆرا وەردەگیرێن، واتە (مستل) ن، بلاوناکاتەوە.
- هەرباس و بابەتێك کە ڕەزامەندی لەسەر بلاوکردنەوەی نادرێت، بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.

# گەشاوەیی وشەی (ڕێز) و بنج و بێخی لە زمانی کوردیدا

**پ.د. فاروق عومەر سدیق**
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی– هەولێر
زانکۆی سلێمانی

**پێشوتە:**

مــرۆڤ، بەر لەخســتنەگەڕی ئینســترومێنتی زمــان بە ئامــانجی تێگەیاندن و تێگەیشتن لە ئەندامانی کۆمەڵ، کەڵکی لە چەندەها جۆر (ئیشارەت) یا سیگناڵ بینیوە و کردونی بە ئەوزار (وەسیلە)ی دەربڕینی خواست و ویستەکانی.

پاش کەوتنەکاری زمانیش و تاکو ئێستاش، نەیتوانیوە دەست بەرداری بەشێک لەو سیگناڵانە بێت، بەتایبەتی ئەوانەی بەهۆی بەژن و لەشییەوە، مەبەست دەگەیەنن. بەژن و سەر و دەموچاو و دەست و پێ و جوڵە پێکردنیان بەم لاو ئەولاو سەرو ژێرو ڕاست و چەپدا، لە مەتریاڵە سەرەکییەکانی ئیشارەت پێکردنن.

(چارلز داروین)، ئەو کەسە بو کە بۆ یەکەمین جار، وتویەتی: ئادەمیزاد و گیانـدارانی تریش، کاتێک بیانەوێت بەرامبەرەکانیان تێبگەیەنن کە شتێک پەیوەندی بەوانەوە، هەیە، سەریان بەولایەدا لاردەکەنەوە. لە سەرانسەری جیهاندا، دورنییە تەکاندان و جوڵاندنی (سەر) نیشانە بێت بۆ وەڵامی (بەڵێ)و (ڕازی)بونە، ڕاوەشاندنی بەم لاو ئەولادا، مانای (نەخێر)، یا (ڕەفز)ە. ئەم ڕێوڕەسمە، ڕێی تێ دەچێت کە هەر لە منالییەوە، خوی پێوە گیرابێت.

وەختێک، منالی ساوا، بەبەر دایکیەوە، تێر شیر بو، بۆئەوەی سنگی دایکی بەربدات، سەری بەم لاو ئەولادا، بادەدات، دیسانەوە هەر بۆ ئەوەش کە دایک و باوکی وازی لێ بێنن و ئەوەندە کەوچکە خواردن

نەکەن بەدەمیدا، هەر زو بەتەکان بە جوڵەی سەری تێیان دەگەیەنێت کە نایەوێت، شت بخوات و تێرە. (آلن پیز ١٣٩٦: ٢٣، ١٤٦)

کلتور کە بەرامبەری لە لاتیندا: (cultura)یە، سەرجەمی ئەو بەها و قیـیەم و دەسـکەوتە مەتریـاڵی و ڕۆحییـانەی کە کـۆمەڵی مرۆڤـایەتی بەدەستی هێناون، دەگرێتەوە کە نیشانە و سروشتی ئاستی دیاریکراوی پێشکەوتنی کۆمەڵیان تیادا، ڕەنگ دەداتەوە و پێوەیان، دیارە. (فەرهەنگی وشەی بێگانە ١٩٨٠: ٢٧٢)

کلتـور، لقوپـۆپی زۆری لـێ دەبێـتەوە و پەل و پـۆ بـۆ زۆر لایەنـی ژیـــانی مـــرۆڤ، ڕادەکێشـــێت، بەڵام لەبەرئەوەی کە باســـەکەمان، ڕاســـتەوخۆ بەدەوری کلتـــوردا، نـــاخولێتەوە، نـــاچینە نـــاو قـــوڵایی وردەکارییەکـانی، بەڵکو ئەوەنـدە دەسـتی بـۆ دەبەیـن کە خزمەتـی ئەم باسەمان، بکات کە لە زمانناسیدایە.

دیـارە بەهـۆی ئەو کۆنتاکتـانەی کە بە درێژایـی مێـژو لە نێـوان نەتەوە جیاوازەکانـدا، ڕویـان داوە، کلتورەکانیشـیان، بەرئـاڵوگۆڕکردن، کەوتون، هەر لەبەر ئەم ڕاستییەیە کە لە زۆر بواری ژیاندا، هەست بە بونی کلتوری هاوبەش، دەکرێت.

نوانـــدنی (قەدرو حـــورمەت و ئەدەب و ئیحتـــرام) بـــۆ کەســـانی بەرامـبەر بە (دانەوانـدن و چەمیـنەوە)ی (ســەر) و دەسـت بە سـنگەوە گـرتن، لای زۆربەی کـۆمەڵانی گـۆی زەوی، بـوە بە بەشـێکی زینـدو لە دابونەریتیان.

هەڵبژاردنی (سـەر) وەک ئەوزارێک و جێبەجێکەری ئەو مەبەسـتە، بێ بنەما نەبوە. (سەر)، بەشێک لە پڕبەهاترین ئەندامی ڕەگـی سـەرەکی ژیانی وەک: (مێشک، گوێ، چاو، لوت، دەم)ی گرتۆتە خۆی و بەسەختی پارێزگارییان، دەکات و بە نەمانیشی، گیان لەدەست دەدرێت. کاتێکیش دای دەنەوێنێت و دەیچەمێنێتەوە، دەیەوێت کەسـانی بەرامـبەری لەوە تێبگەیەنێت کە ئامادەیە لە پێناویاندا، سەری خۆی دانێت. بونی ئیدیۆمی (سەرم لەڕێتـایە)ش بۆ پێکانی ئەو ئامـانجە و مۆرکردنی ئەو مەبەسـتە هاتۆتە، ئاراوە.

هەرچەندە، دوای هاتنە کایەی زمان، مرۆڤ بۆ نیشاندانی خواست و هەستی، ئەو پێویستییانەی جارانی بە ئیشارەتکردن نەما، بەڵام لەبەر میکانیزمی خێرا گەیاندنی مەبەست و پێکانی ئامانج، نەیتوانیوە دەست بەرداری گشتیان بێت، لەوانە، تەکان و جوڵە و دانەواندنەوەی سەر بوە.

گرنگترین ئەندامی لەشی مرۆڤ و هەمو گیانلەبەرێکیش، هەر (سەر)ە، جا کردنی بە کاراکتەری سەرەکی نیشاندانی (حورمەت و ئیحتیرام) بنەمایەکی ژیریی و دەربڕینی ئاستێکی هەڵچوی زانستیانەی قوڵی گەشاوەیی هۆش و بیر بوە.

کاراکتەرێکیش کە ئەوەندە پڕ بەها بوبێت، دیارە هەر زوش لە زماندا، ناوی لێنراوە. بەپێی ئەو زانیاریانەی کە لەو دەکۆمێنتە نوسراوانەی لە زمانناسی ئێرانیدا لەبەردەستان و تا ئێستا، پشتیان پێ سپێراوە، لە گروپی زمانە ئێرانییە کۆن و ناوەڕاست و نوێکاندا، بە وشەکانی: (کەلە) و (سەر) ناوی لێنراوە. (فاروق عومەر سدیق٢٠١٧: ٢٠٩-٢٦١).

ئەتەکێتی[١] دانەواندنەوەی سەر، یا بەچۆکداهاتن، یا هەردوکیان پێکەوە، یا دەست بەسنگەوە گرتن، یا بەویقار وەستان چەندەها واتای دڵ و دەرونی نیشاندەر بۆ کەسی، یا کەسانی کە لە پلەو پایەدا لەخۆی بەرزتر بن، دەگەیەنن، وەک (گۆران) بەم شیعرە وێنەی کێشاوە:

**هەرکەسێک تازە بێتە دیوەخان**

**کڕنوشی ئەکا بە سەردانەوان** (گۆران ١٣٠)

ئەگەر ئەو جوڵە و نومایشانە، وەربگێڕینە سەر زمان، ئەوا دەشێت گشتیان، بچنەوە باوەشی وشەی (ڕێز)ەوە.

(ڕێز) و (ریز)ی ئەلۆمۆرفی و ئەو وشانەش، کە لەوان سازبون و ئەوانیتریش کە هاوکارو یاریدەدەری گەیاندنی واتای وشەی (ڕێزو ڕێزگرتن)ن، چالاکانە لە زمانی نوسین و قسەکردنی ڕۆژانەدا، لەکاردان.

ئەوەنـدەی ئـێمە ئاگـاداربین، لەگەڵ ئەو گرنگیـی و هەسـتیاریی و زیندویی و ئەکتیڤارییەی وشەی (ڕێز) لە گەیاندن و دەربڕینی چەمک و واتـای ئۆنوڤێرسـاڵی جیهانی (حـورمەتگرتنی بەرامبەر)دا لە کوردیـدا، هەیەتی تـا نوسـینی ئەم باسـەی ئێمە، نە ڕاسـتەو ڕاسـت نە لابەلا، هـیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی لەسەر نەکراوە.

ئەم کەموکورییە لە لێکسیکۆلۆژی کوردیدا، هاندەرمان بو کە ئێمە بەم بـاس و لێکـۆڵینەوەیە کە بـۆ یەکەمجـارە، ڕونـاکیی دەبینێت، بچینە ژێر، ئەو بارەوە:

ئەم باسە، لە پێشوتە و (٣) سێ بەش و ئەنجام، پێکهاتوە:

یەکەم بەش: بـۆ [سـیمانتیک و جێـی (ڕێـز) لە گەنجیـنەی زمـانی کوردیدا]، دانراوە.

دوەم بەش: بـۆ [تەتەڵەکردنـی مۆرفۆلۆژیـانەی سروشـتی (ڕێـز)] دیاریکراوە.

سـێیەم بەش [ئێتمۆلـۆژی و بـنج و بێخـی (ڕێـز)]ی تیـادا، یەکلایـی کراوەتەوە.

## یەکەم بەش

## سیمانتیک و جێی وشەی (ڕێز) لە گەنجینەی زماندا

بە مەبەستی یەکانگیریی باسەکە، بەشێک لەو خواست و ئارەزو و مەبەستانەی کە بە ئەدای[٢] ئەتەکێتی سەردانەواندن و بەچۆک داهاتنی مرۆڤ، نومایش دەکرێت و سەرجەمیان لە زماندا لە وشەی ئەبستراکتی (ڕێز)دا، کۆکراونەتەوە بە پەسەندمان زانی بەم وردەکارییانە، بهێنینەوە یاد:




ئەو واتایانە و ..... هی تریش، دەچنە هەگبەی نواندنی ئەتەکێتی سەر دانەواندنەوەو دەبن بە هەوێنی لەیەکگەیشتنی پلە و پایەداری ئەوانەی لەخواریانەوەن.

(ڕێز)، چەندین وشە کە لە جەوهەردا، گەیەندەری واتای پلەو پایە و پیشەی هەمەڕەنگن، فیلْدە، یا کێڵگە واتایەک، باوەشیان بۆ دەگرێتەوە کە دەشێت سەنتەرەکەیان بە (ڕێزنوما) ناوبنرێت، دەخاتە پێش، یا پاش ناوی پلەو پایەدارەکان و بۆ پەڕاندنەوەی پەیامەکەی دەیانکات، بە پرد.

هەندێک لەو وشانە، بەم دایەگرامە، نیشان، دەدەین:




لە قسەکردندا، ئەو وشانە، بەسەر (٢) پۆلدا، دابەش دەبن و هەریەکێکیشیان، چەند وردە بەشێکی لێ دەبێتەوە، وەک:

**یەکەم پۆل:**

بەپێی پاش و پێشی بەکارهێنانیان لەگەڵ ناودا:

أ- لە پێش (ناو)ەوە: کاک، مامۆستا، جەناب، مام، مەلا، فەقێ، شێخ، کوێخا، دەروێش، وەستا، خەلیفە و ......هی تریش، وەک: کاک دلێر، مامۆستا نەریمان، مەلا قادر، فەقێ جەبار.

ب- لە پاش (ناو)ەوە: ئاغا، بەگ، پاشا، خان، خانم و ..... هی تریش، وەک عەبدوڵا بەگی گۆران، وەسمان پاشای جاف، حەپسەخانی نەقیب.

**دووەم پۆل:**

بەپێی بەکارهێنانیان لەگەڵ جنسی نێرینە و مێینە و هەردوکیاندا

أ- لەپاڵ نێرینەدا: کاک، مام، شێخ، ئاغا، بەگ و ........ هی تریش، وەک کاک سدیق، مام هەژار، شێخ لەتیف.

ب- بۆ مێینە: خانم، خاتون، باجی و ..... هی تریش، وەک عادیلە خانم، سارا خاتون.

پ- لەتەک هەردوکیاندا: مامۆستا، مەلا، حاجی، خان، وەک: مامۆستا سەرکەوت، مامۆستا پەروین، حاجی عومەر، حاجی خەجێ، مەلا حەسەن، مەلا فاتم و ..... هی تریش.[٣]

دەبێت بەهای جێی و شوێنی وشەی (ڕێز) و ئەوانەشی کە لە دەورو فەلەکی ئەو دەخولێنەوە و ئەو بەکارهێنانە ئەکتیڤانەی لە قسەکردنی ڕۆژانەی زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵ بە جیاوازی پلە و پایە و پیشە و تەمەنیان، بەرگوێ دەکەون، تەواو لەبەرچاو بگیرێن.

## دووەم بەش

## تەتەڵەکردنی مۆرفۆلۆژییانەی سروشتی (ڕێز)

(ڕێـز) گەیەنـدەری واتـای (قەدر و حـورمەت) و یەکـێکە لە وشـە زیندوەکانی زمان (language) و چست و چالاکەکانی قسـە (speech) لە دیالێکتی خواروی زمانی کوردیدا.

(ڕێـــز) وشـــەیەکی تـــاکمۆرفێمیە، یەکێـــک لە تـــایبەتێتییە سەرنجڕاکێشـــەرەکانی لەوەدایە کە ئەم بەجیـاواز لە ناوەکـانی تـری کەتیگۆرییەکەی خۆی، ئەوەندەی ئێمە بزانین، سوفیکسی دیـاریکردنی نـاوی تـاک (-ەکە) و ئەلۆمۆرفەکـانی و (-ان)ی نـاوی کـۆش لەتەکیـدا، نـابینرێن، بەڵام (-ێک)ی دیـارینەکردن و شـاردنەوەی نـاوی تـاکە، ئەوا بەئاسایی دەچێتە پاڵی، وەک:

مامۆستا <u>ڕێزێکی</u> تایبەتی هەیە.

لە سینتاکسـدا، سـێتی مـۆرفێمە بەنـدەکانی کلیتیکـی دیـاریکردنی ناویشیان لەگەڵدا، بەکاردەهێنرێن، وەک: ڕێزم، ڕێزت، ڕێزی، ڕێزمـان، ڕێزتان، ڕێزیان. بۆ نمونە:

ئێمە <u>ڕێزمان</u> هەیە بۆتان.

لەبەرهەمداریـدا، چەنـدین وشــە بە بەشـداری (ڕێـز) سـازێنراون: ڕێزگرتن، ڕێزلێگرتن، ڕێزلێنان، ڕێزە، بێ ڕێزی، بەڕێز، ڕێزدار..... هـی تریش.

پێویستە، بوترێت کە وشەی (ڕێزە) لە:

ڕێـــز + (-ەک) <پێکهـــاتوە، بەڵام دوای ئێکـــانۆمی فـــۆنێمی /ک/، پەڕێنراوە و بوە بە (ڕێزە).

(ڕێـــزە) لە نـــیمچە دیـــالێکتی ســـلێمانی بەواتـــای میتـــافۆڕی بەکاردەهێنرێت، دەبێت بە سینۆنیم بۆ (مستوی)ی عەرەبی و (/eve/)ی ئینگلیزی، بۆ نمونە لەم شیعرەدا، بە میتافۆڕ بەکارهاتوە:

**خەیاڵ بێ و بۆربێ و زۆربێ، باخام بێ**

**خەیاڵباز ئەبێ دایم ناکام بێ**

**بایدایەوە سەر خەیاڵی هەنگوین**

**خۆی بردە ڕێزەی خاوەندی نگین** (پیرەمێرد ٤٨٩)

هەروەها: **(کچم لە ڕێزەی کوڕی ئەو دایە.)** (هەژار١٣٨٤: ٣٦٦)

(ڕێز) بە واتای (قەدر و حورمەت)، جاران، وەک ئێستا، ئەوەندە بە گرو فو نەبوە، هەر لەبەر ئەوەشە کە نەچوەتە، قاڵبی (ئیدیۆم) و (پەند)ەوە.

**هاتنەکایەی ئەلۆمۆڕفی (ڕیز)**

زانراوە کە (مۆرفێم) دانەیەکی واتاداری ئەبستراکتی زمانە، کە بە قسە کۆنکرێتکرا، پێی دەوترێت (مۆڕف). بە گشتی هەمو مۆڕفیمێک، بەخستنەگەڕی لەقسەدا، دەبێت بە خاوەنی تەنیا یەک (مۆڕف)، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا بۆی هەیە بەهۆی کاریگەری فاکتەری گۆڕانیی فۆنەتیکی و مۆرفۆلۆژی و میژویی لە مۆرفێک، زیاتریشی هەبێت.

(ڕێز) لە ئەنجامی گۆڕانی فۆنەتیکیی دەنگی /ێ e / > /ی i/، ئەلۆمۆڕفی (ڕیز)ی لێ بوەتەوە، واتە، مۆرفی (ڕێز) و مۆرفی (ڕیز)، دانەی بە کۆنکرێتکراوی (ڕێز)ی ئەبستراکتن.

پەیدابونی لە مۆرفێک زیاتر لەقسەدا، دەتوانرێت بە لەدایکبونی منداڵی (دوانە) لە مرۆڤدا، بشوبهێنرێت. لە دوانەدا، هەمو سیفاتێکی بایۆلۆژییان، وەک یەکە و بە مو جیاوازییان، نییە. ئەلۆمۆرفی دوانەش لەقسەدا، دەشێ هەر ئەو حسابەی بۆ بکرێت، چونکە لەمانیشدا، گشت سیفاتێکی سەرەکیی و گرنگییان کە ڕایەڵەی واتایی لە سەرو هەمویانەوەیە، هەریەکەو ناپچڕێن لەیەکتری کە لەیەکیش ترازان و بەرەو ئازادی و سەربەخۆیی ڕۆشتن، ئەو پەیوەندییە بایۆلۆژییەیان، هەر دەمێنێت.

مرۆڤی دوانە، دو کەسی خاوەن ئیرادە و کەسێتی سەربەخۆیان لێ دەردەچێت و لە ڕەوتی ژیانیشیاندا، بە ئاراستەی جیاوازدا، دەڕۆن.

ئەلۆمۆڕفەکـــانیش، هەر ئەم ڕێگـــایە، دەگـــرن و لە کۆتاییـــدا، هەریەکەیان دەبێت بە دانەیەکی ئەبستراکتی و لە مێشکی ئادەمیزاددا، دەپارێزرێت.

هاتنە ئارای ئەلۆمۆرفی (ڕیز) و دواتر، بونی بە مۆرفێمی (ڕیز)، دەبێت هەر بەچاوی، دوانە لەگەڵ (ڕێز)دا، سەیربکرێن.

بۆ ڕاستی و دروستیی ئەم لێکدانەوەیەمان، با لە فەرهەنگی خاڵ وردبینەوە، بزانین، چی دەربارەیان، نوسراوە:

(ڕێز) رییز (ز)، واتە (زازا- نوسەر)

وردە بەرد (د)، واتە (ئەردەلان)- نوسەر).

حورمەت

(رییز) چەن شتێکە بە قەتارە کە پاڵیان دابێتە یەک.

حورمەت و پایەی مەردوم.

(رییزبوون) پاڵدانی چەن شتێک بەیەکەوە بەڕێکی.

(رییزپێوەگرتن) بەرییزهاتن بەسەر چەن شتێکا بەبێ بوواردنیان.

(رییزکردن) دانانی چەند شتێک لەتەنیشت یەکەوە بە رییز.

(رییزکێن) رییزێن.

(رییزلێگرتن) رییزپێوەگرتن. حورمەت گرتنی یەکێک.

(ڕییزلێنان) حورمەت گرتن.

(رییزێن) یاری سێ رییزکێن، یانۆ رییزکێن کردن. (شێخ محەمەدی خاڵ ۱۹۸۸: ۲۰٤، ۲۰۸)

بەم نوسینەی خاڵ، دەگەینە، ئەو ئەنجامەی کە بڵێین:

۱- خـاڵ، یەک جـار، واتـای (ڕێـز) و سـێ جـار، واتـای (ریـز)ی بەجیاجیا، لێکداوەتەوە.

۲- وا دیارە، لەو ڕۆژانەدا، بۆ گەیاندنی واتای (حورمەت)، (ڕیز) لەبرەوتردا بوە، وەک لە (ڕێز).

۳- جگە لە گەیاندنی واتای (حورمەت) وشەی (ڕیز) مانای (چونە پاڵ یەکی شت و مەک)یان لە سەفێکدا، بەخشیوە.

٤- (ڕێز) بە واتای (پاڵدانی شت و مەک بەیەکەوە) بەکارنەهاتوە.
٥- بەکارنەهێنانی (ڕێز) و (ڕیز) بە واتای (حورمەت و حورمەتگرتن) لەیەک کاتدا، نیشانەی ئەلۆمۆرفیی هەردوکیانن.
٦- لێرەوە، هەست بەڕێچکەگرتنی جیاوازی دوانەی (ڕێز) و (ڕیز) دەکرێت. لە تەنیا گەیاندنی واتای (قەدر و حورمەت)، (ڕێز) دەکرێت. لە تەنیا گەیاندنی واتای (قەدر و حورمەت)، (ڕێز) خۆی یەکلایی کردوەتەوە و سەربەخۆ بوە. بەڵام جارێ (ڕیز)، هەردو واتاکەی هەر لە ئامێزدایە.

بۆ بەدەستهێنانی زانین و زانیاریی زیاتر، دەربارەی چۆنێتی ڕەوتی ژیانی (ڕێز) و (ڕیز)، دەچینە کوردستانی ئێران.
(هەژار) بەم شێوەیە لە هەردوکیان، دواوە:
ڕێز: ١- قەدر و حورمەت ٢- بەتەنیشت یەکەوە، سەف.
ڕیز: ١- سەف، بەپەنایەکەوە ٢- وردیلە بچکەلە.
ڕێزانە: بەخشش لە بەرانبەری کاری چاکدا، یاداشت.
[ڕێزپێوەگرتن] : یەک یەک بە هەموان ڕاگەیشتن.
[ڕیزپیوەگرتن] : ڕێزپێوەگرتن.
ڕێزک: ڕێو شوێن و قانون ٢- ڕێزە خەتی ورد
[ڕیزکردن]: لە تەنیشت یەکەوە دانان
[ڕێزکردن]: ڕیزکردن
ڕێزکێن: ڕسکێن
[ڕیزگرتن]: قەدرگرتن
[ڕێزگرتن]: ڕیزگرتن
[ڕیز لێ گرتن]: ڕێز لێ گرتن
[ڕێز لێ نان] : ڕێز لێ گرتن.
ڕێزە: ١- کەمۆکە، پیچەک، هندکەک ٢- لەبەرانبەری لەپایەدا:
**کچم لە ڕێزەی کوڕی ئەو دایە.** (هەژار١٣٨٤: ٣٦٦)

وادیـارە لە کوردسـتانی ئێـران، (ڕێـز) و (ڕیـز)، هەر وەک (٢) دو ئەلۆمـۆڕف هەڵسـوکەوتیان کـردوە، جـارێ ڕێگـای جیابونەوەیـان، نەگرتوەتەبەر.

لە دیـالێکتی سـەرودا، وشـەی (ڕێـز) بە واتـای (قەدر و حـورمەت) بەکارنەهاتوە، بەڵکو واتای (ڕیز، نیزام، سەف، زنجیرە)ی بەخشیوە.

بۆ نمونە: (ڕیزا چیا rezačiya) واتە (ڕیزە چیا)، ڕێزکرن، ڕێزبـون، ڕێـزگە [ە]، ڕێزگـی [ە]، واتە، (ڕیـز)، ڕێـزەڕەش: (ڕیزێـک ئـالەتی تۆوچەقانـدن، ڕێـزڤەگەر: (نیشـانەی [–]ی گەڕانەوە بـۆ سـەری دێـڕ لە نوسیندا. (باکایڤ١٩٥٧: ٣١١)

دیسـان، لەم دیـالێکتەدا، بەم شـێوەیەش، تەماشـای (ڕێـز)، کـراوە و نمونەی بۆ هێنراوەتەوە:

ڕێز: نیزام، سەف، خەت

کەتینێ ڕێزێ، کرن ڕیزێ، ڕێزبون، ڕێز لێ گرتن (بەدەورا هاتن).

(ڕێـز) و (ڕیـز) بە گەیەنـدەری یەک واتـا، دانـراون، بەڵام نمـونە بـۆ (ڕیز)، نەهێنراوەتەوە. (کوردۆیڤ١٩٦٠: ٦٤١، ٦٤).

کۆتایی ئەم بەشە، بەو ڕاستییە دەهێنین، کە :

آ- لە خـوارودا، لەسـەرەتادا، (ڕێز) و (ڕیـز) بە واتـای (قانونبەنـدی) بەکارهاتون.

ب- لە نیمچە دیالێکتی سلێمانی و زمـانی نوسـین و قسەکردنیشـدا، بەرەبەرە (ڕێـز) لەگەڵ ئەوەدا کە ئەلۆمـۆڕفی (ڕێـز)ە و ڕایەڵەی واتـایی قانونبەندی تائێستا، هەردوکیانی پێکەوە بەستووەتەوە، بەڵام (ڕێـز) بـوە بە مـۆرفێمێکی ئـازاد و سـەربەخۆ، (تەنیـا) بە واتـای (قەدر و حـورمەت) بەکاردێت.

پ- لە دیالێکتی سـەرودا، (ڕێز) و (ڕیز) ئەلۆمـۆرفی یەکتـر بـون و گەیەنـدەری (واتـای قانونبەنـدی) بـون و تـا ئێسـتاش، هەر بەو شـێوەیە ماونەتەوە. بەپێی ئەو دەکۆمێنتانەی لەبەردەستماندان، وشـەی (ڕێز) لە گەیاندنی ئەو واتایەدا، ئەکتیڤتر بوە، بەڵام هیچیـان، گەیەنـدەری واتـای (قەدرو حورمەت)، نەبون.

## سێیەم بەش

## ئێتمۆلۆژی و بنج و بێخی (ڕێز)

(ڕێز)، ئەمڕۆ، یەکێکە لە وشە چست وچالاکەکانی زمانی نوسین و قسە لە دیالێکتی خواروودا. بەم فۆڕم و مانایەی کە دەیبەخشێت لە هیچ زمانێکی هاوگروپی خۆی و خێزانی زمانە هندو ئەوروپاییەکانشدا، توشمان بە توشییەوە، نەبوە.

بە مەبەستی ڕێگا ئاسانکردن بۆ لابردنی تەمومژو غوبار لەسەر جەوهەری بێخی (زێڕ)، بەباشمان زانی سەرەتا لەخستنەڕوی هەندێ تایبەتێتی زمانناسیی ئەلۆمۆڕفەکەی کە (ریز)ە، دەست پێبکەین.

وەک زانیمان، لە سەرەتاوە و تا ماوەیەکی دورو درێژ بە واتای (قانونبەندی و قەدر و حورمەت) پێکەوە لە خواروودا بەکارهێنراون، بەڵام وەک ئەمڕۆ، ئەوەندە ئەکتیڤ نەبون بەتایبەتی لە نوسیندا، بەڵکو دەتوانین بڵێین لەو بەرهەمانەی لەبەردەستدان تا سەرەتای نیوەی دوەمی سەدەی بیستەمیش، بەدەگمەن چاومان بە وشەی (ڕێز)، دەکەوێت. بۆ نمونە، لەوانەدا کە بەڕیزبەندی مێژویی، دەیانخەینەڕو، زۆر بەکەمی و تاک و تەرا، (ڕیز)یان، تیادا، دەبینرێت، وەک:

**وەرە سەیری خیابان و بەیاضی دەفتەری نالی**
**کە صف صف، مەصرەعی بەرجەستە، ڕیزی سەروی مەوزنە**[٤]
(نالی٥٢٣)

**بە زوبانی کەچ و خەتی خواری**
**بە جەریدە و کتێبی خەڵواری**
**چوونە ڕیزی موعەززەماتی میلەل**
**وەقتە خۆیان حیساب بکەن بەدووەل** (حاجی قادری کۆیی٢٤٠)

**لەسەر خۆ چونە، شەیدابونە، قۆڕپێوانە، سوتانە**
**هەتا مردن، مەحببەت ئیشی زۆرە ڕیزی لێ دەگرم**[٥] (مەحوی٢١٩)

هەریەکە دە دوانزە چەفتە و مشکی و جامانەی ڕەنگاو ڕەنگیان تێک ئاڵاندووە بەسەریانەوە بەستووە و هەریەکە بەقەدەر بەرداشی، چوار ڕیز و پێنج ڕیز فیشەکیان لەخۆیان دابوو. (لەخەوما ٤٥)

**هەرچی میوەیێک ناوی بیستبوو**
**ناشتبووی بەڕیز ڕێکیی خستبوو** (پیرەمێرد١٢٩)

**چاوەکەم ڕیزەی دانی تۆی بینی**
**فرمێسکم ڕشتەی مرواری هۆنی** (پیرەمێرد ٢٧٥)

**بەڵام من چاوم گێرا خوارو ژوور**
**لە ڕیزەداری چوالەی تارا سوور** (گۆران١٧٧)

**بۆ لای تۆ ئەڕوانم، قژ زەردی نازدار**
**ئەبینم دوچاوی ناو ڕیزی برژانگ** (گۆران٢٠٧)

لەو بەرهەمانەدا، (ڕیز) تەنیا بە واتای (قانونبەندی چونە پاڵ یەکتری شتومەک بە نیزام)، خراوەتەکار، لەوە دەچێت لە گەیاندنی (قەدر و حورمەت)دا، لێکەوتبێت. جگە لەمە، (ڕێز)مان تیادا نەهاتۆتە بەرچاو.

لەفەرهەنگی گشتی زماندا، (ڕیز) خاوەنی بەرهەمێکی کەمە، لەوانە: ڕیزکردن، ڕیزبون، ڕیزگرتن، ڕیزبەستن، سێڕیزکێن، نۆڕزکێن، بەڵام لەقسەکردندا، یەکێکە لە وشە ئەکتیڤەکان.

**دینەمۆی گەشێنەری (ڕێز)**

زمان کە لەپاڵ خاک و ئێکۆنۆمی و لایەنی ڕۆحی و گیانی هاوبەشدا لە یەکێتیەکی پتەودایە، بنیاتنەرو ڕوکن و پایەی ئەساسیی ڕاگرتوی نەتەوەیە.

ژیان و پێویستییەکانی قەتیسماونین، ئەو پەیوەندییە هەمەجۆرانەی کە عەقڵ و هۆشی ئەندامانی کۆمەڵیان پێکەوە گرێ داوە و چەشنی بیرو بیرکردنەوە و بۆچونییانی یەکانگیرکردوە، ڕاوەستاونین و هەمیشە لە جم و جۆڵدان، ئلیمێنتە پێکهێنەرەکانی پایە سەرەکییەکانی نەتەوەش، بەردەوام بەهۆی فاکتەرو ڕوداوی سروشتیی و ناسروشتیی کە بەرەو ڕوی کۆمەڵ دەبنەوە لە گۆڕاندان.

نەتەوە لە پێناوی نەشونماکردن و بەردەوامی خۆی، بایەخ بەو بیروباوەڕ و داهێنانە دەدات کە وزە و گڕو فویەکی نوێ بە پەیوەندییەکانی ناو کۆمەڵ ببەخشن و زیاتر بتوانێت، بەرامبەر ئەو کۆسپ و تەگەرە و نشوستیی و نەهامەتیانەی کە بەرەو ڕوی دەبنەوە، خۆڕاگربێت.

زەمان و شوێن، دایمە دەوری بنەڕەتیی و کاریگەرییان لە هێنانە کایەی تازەگەری لە هۆش و بیرو مێشکی مرۆڤدا، بینیوە. ئادەمیزاد وا خەڵق بوە کە بە جۆش و خرۆشەوە بەرەو ڕوی هەمو تازەگەرییەکی فیکریی سودبەش بە ڕەوتی بەرەو پێش چونی ژیانی، دەبێتەوە و باوەشیان بۆ دەگرێتەوە.

بەدرێژایی مێژو، نەتەوە لە تاوتوێکردن و گەڵاڵەکردنی بیری تازە و تۆوکردن و ڕواندن و چەکەرە دەرکردن و ئاودانیان و هێنانە دنیایان، دەستەوستان نەبوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، بزوێنەرو هاندەر و ڕێگا خۆشکەری هاتنە ئارای چەندەها ئلێمنتی بەهێزکەر و پشتگیرکەری پایە سەرەکییەکانی بوە و لە فیلدە واتایەکدا، کە خۆی بوە بە سەنتەریان کردونی بە ئەندام و، هەریەکەیان بەپێی هەڵگرتنی ئەو واتایەی کە لەو چەمکدا، هەیەتی و بەگوێرەی ئەو دەورو کاریگەرییەی کە توانای بەسەریدا، دەشکێت و لەباریدایە، (پارێزگاری) لەبونی نەتەوە دەکەن، لەبەرئەوە بەلامانەوە، وا باشە کە ئەو فیلدە بە (نەتەوەپارێزی) ناوبنرێت.

لە ڕاستیدا، سروشت و سنوری کارکردنی ئەندام فیڵدەکان، وەک، یەک نین، هەر یەکەیان بەگوێرەی قەوارەی پێویستیی و کاریگەری لەو ئەرکەی دەکەوێتە ئەستۆی لە بەکارهێناندا، یا ئەکتیڤ و چالاک، یا پاسیڤ و سست، دەبێت، جگە لەمە بێگومان، ئەندام بون لە کێڵگە واتاییدا، چەسپاو و نەگۆڕ، نییە بەڵکو بون و نەبون و پوکانەوە و مان و نەمانیان، بە پێویستی ڕۆژانەی کۆمەڵەوە، بەستراونەتەوە.

بەمەبەستی بەرچاوڕونی زیاتر لە کێڵگە واتایی (نەتەوەپارێزی) لە زمانی کوردیدا، بەم دایەگرامە، بەشێک لە ئەندامەکانی، دەخەینە، ڕو:



بوژاندنەوە و نەشونماکردنی فیلّدە واتای (نەتەوەپارێزی) کە بە نمونە هێناومانەتەوە، کەم، یا زۆر، جولّە دەخاتە ئەوانیتریشەوە، دیارە ئەمەش، پەیوەندی بە سروشتی زمان خۆیەوە هەیە کە هەمیشە بە یەکێتی ئنسترومێنت و قانونە ناوخۆیەکانیەوە، کاردەکات.

ئەم فیلّدە، پڕ ئەندامە ئەبستراکتیە هەستیار و کاریگەرە و ئەو وشانەش کە داکەوتەی ئەوانن و ئەوانەش کە بەدوای ئەماندا، دێن، تێکڕایان، هێز و پێز و تواناو دەسەلاّتی زمان لە سازکردنی کەرەسەی زمانیی بۆ دەربڕینی ئەو خواست و مەبەستانەی کە لەو سەردەم و ڕۆژەدا، کۆمەلّ پێویستی پێیانە. دەستکراوەتر و فراوانتر دەکات. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، ئەم بەدەنگهاتنەوەی زمان بۆ کۆمەلّ، سودی بۆ خۆشی تیادایە، چونکە ئەمیش، جۆشوخرۆشی تازەی تێ دەکەوێتەوە و دەچێتە، قۆناغی خۆبەمۆدێرن کردن و نوێبونەوە و بەخۆداچونەوە، واتە ئەو چەمک و واتایانەی کە لە مێشکدا گەلاّلە دەبون و لە فیلّدە واتایەکدا، یەکیان دەگرت، ئەگەر بەکەرەسەکانی زمان، دەرنەبڕانایە، هەر لە شوێنی خۆیان دەپوکانەوە و چاویان بەدنیا نەدەکەوت.

ڕوداوی هەمەچەشنەی سروشتیی و ناسروشتیی و دەستکرد کە کارەساتی گەورە و ترسناک و زیانبەخش کە کوشت و کوشتار و گرانی و برسێتی و نەخۆشییان بەدوای خۆیاندا، هێنابێت، ماکەکانیان تەنیا بە ناوچەیەکی دیاریکراو و لە میلەتێکدا، پەنگی نەخواردوتەوە، بەلّکو هەر زو بەناو میلەتانی دورو نزیکدا، تەنیوەتەوە بەتایبەتی ئەو ماکانەی کە وەک باهۆزو گەردەلول بیروباوەڕیشیان گێژداوە و بەناو ئەو میلەتانەدا بلاّویان کردونەتەوە کە لە دێرزەمانەوە تامەزرۆی بەدیهێنانی چەندەها ئاوات و ئامانجی لە بابەتی ئازادی و سەربەخۆیی و مافپەروەری و گەلێ خواست و ویستی ئەوتۆ کە خەویان پێوە دەدی. میلەتی کوردیش، دیارە لەوانە بوە کە ولاّتی لێ زەوت کراوە و بە ماکی جەنگی یەکەم و دوەمی جیهانی خاکەکەشی لێ داگیرکراوە و

دابەشـیش کـراوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشـدا، ئەو دو ڕوداوە جیهـانییە کارەسـتبارە، بـون بە هەوێنـی سـەرهەڵدانی چەنـدین جـونبش و جوڵاندنەوەی سیاسی و ئابوری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی کە لە زۆر سەرەوە گوژمی بەهێزیان بە قۆستنەوەی هەلی بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی کورد و بەتایبەتی لە کوردستانی خواروودا، داوە.

دامەزراندنی چەندین پارت و ڕێکخراوی سیاسی و ڕۆشنبیری و کـۆمەڵایەتی و دەرچـونی ژمـارەیەکی زۆر لە ڕۆژنـامە و گۆڤـار و جـوڵانەوەی هـونەریی جۆراوجـۆر لەوانەش گرنگتـر، دامەزرانـدنی حکـومەتی سـلێمانی و کۆمـاری کوردسـتان لە مهابـاد و بەرپـابونی ڕاپەڕیـن و شۆڕشـەکان بەتـایبەتی شۆڕشـی مەزنـی ئەیلـول، ئەمـانە بەروبومی ماکی ئەو دو جەنگە بەناوبانگەن.

یەکێک لە ئەندام فیڵدەکانی (نەتەوەپارێزی) کە زۆرترین پڕیشکی چریسکەداریی ئەو جموجۆڵانەی بەرکەوتوە، (زمان پاراوی)یە کە بۆ گەیاندنی پەیامی ئەو بیروباوەڕە نوێیانە و بەواقیع کردنیان، بوە بە ئەوزاری سەرەکی ئەو پەیامە.

لە ئاکامەکـانی ئەو ئـاڵوگۆڕییە فیکـرییە کە فەرهەنگـی زمـانی پـێ بوژاوەتەوە و پێی گەشاوەتەوە، برەودان بوە بە هێنانە کایەی وشـەی تازە و کزکردنی بەکارهێنانی هەندێکی ترو دورکەوتنەوە لێیان، گوایە، ئەوانە وشەی بێگانەن! بێ ئەوەی پشت بە بنەمایەکی زانستی و حساب بۆ زمانناسـی بکەن کە ئەم جۆرە بیرکردنەوانەیـان تیادا، جێنابێتەوە، هەر وشـەیەک، کە هـاتە سـەر زاری خەڵکـی و بەکارهـات، دەبێـت بە موڵکی ئەو زمانە و هیچ زمانێکیش لەو وشانە کە هاتونەتە ناوی بێ بەری، نییە.

(ڕێـز) خـۆی تەنیـا بـۆ بەخشـینی واتـای (قەدر و حـورمەت) سـاغ کـردوەتەوە و لە ئەلۆمـۆرفەکەی کە (ڕیـز)ە، جیـابوەتەوە. بە تەوژمـی (زمان پاراوی) لەوە دەچێت لە سـەدەی بیسـتەمەوە، زیاتریش لە دوەم نیوەی ئەو سەدەیەوە، سەرەتا (ڕێز)، وەک سینۆنیمی (احترام) لە زمانی

نوسـیندا، خراوەتەکـار، دوای ئەوەی کە خـۆی گرتـوە، بـوە بە بنـاغە بـۆ سازاندنی وشەی نوێ، کە یەکێکیان، وشەی (بەڕێز)ە.

بەڕێز لە: (بە– +ڕێز √řez) + -ba) پێکهێنراوە.

لە فەرهەنگــدا، (بەڕێــز) کەوتــوەتە بەربەرەکــانی دژی وشـــەی (محترم)ی عەرەبی و لە خەباتی بەرەنگاربونەوەیدا، سرِ و گۆشـەگیری کردوە و بەسەریدا، زاڵ بوە.

فـاکتەرە بنەڕەتییەکـانی سـەرکەوتنی (بەڕێـز) بەسـەر (محتـرم)دا، بـایەخ پێدانی بـوە لە زمـانی نوسـیندا بەگشـتی و لە ڕۆژنـامە و گۆڤـارو چاپەمەنییەکــان و هۆیەکــانی ڕاگەیانــدنی وەک: ڕادیــۆ و تەلەفزیۆنــدا بەتایبەتی.

(بەڕێــز) لە بەرهەمـــی شـــاعیران و ئەدیبـــان و نوســـەرانی ئەو سـەردەمەدا، بەئاسـانی جێـی خـۆی لە زمانـدا کـردوەتەوە، واتە وەک، هەمو وشەیەکی تازە پێگەیشتو، یەکسەر، ئەکتیڤ نابێت، بەڵکو مـاوەی دەوێت، تا ڕەونەق، پەیدا دەکات، ئەنجا خۆی دەنوێنێت.

ئەمەش، نمونەی بەکارهێنراویەتی لە ئەدەبدا:

**سەلام لە گوێگری بەڕێزو هونەرپەروەری بەرنامەی تاپۆ**

(سوارەی ئیلخانی زادە٦٣)

**بەتێکۆشانم، وانەی ڕۆژانە**
**ئامادەی ئەکەم، بۆ قوتابخانە**
**تا لای مامۆستا بەڕێزەکانم**
**ئەوەی خوێندوومە، هەمووی بزانم** (ع. ع. شەونم١٦٧)

**پاشایەکی وەک تۆی بەڕێز**
**خاوەنی دەستەڵات و هێز** (ع. ع. شەونم٢٤٧)

**دەرکەوتنی بێخی (ڕێز)**

پێشـتر وتمـان، وشـەی (ڕێـز)، بەم فـۆرم و واتـایە، تەنیـا لە زمـانی کوردی و بە تایبەتی لە دیالێکتی خوارودا، لەکاردایە و لە هـیچ زمـانێکی

گروپی هندو ئێرانی، یا خێزانی زمانە هندو ئەوروپاییەکانی تردا، بەرچاو نەکەوتوە، لەبەرئەوە بۆ گەڕان بەدوای ڕەگ و ڕیشە و کنەکردن و گەیشتن بە بێخەکەی، پێویستە بپەڕینەوە بۆ ناو ئەو زمانانەی کە لە مێژودا لەگەڵ کوردیدا لە کۆنتاکتا بون و سەر بەخێزانی غەیرەز هندو ئەوروپایی بون.

لە سەردەمی کۆندا لە ڕۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست و دیارە بە کوردستانیشەوە، تا سەرەتای یەکەم هەزارەی پێش زاین، ناوی چەندین خێڵ و نەتەوەی جیاوازی، وەک: ئیلامی، گۆتی، لۆلۆبی، کاسی، کاسپی، مانی) دەبینرێن کە زمانی قسەکردنی هیچیان، ئێرانی زمان یا هندو ئەوروپایی نەبون و لە دێرزەمانەوە لەم ناوچانەدا، ژیاون، واتە دانیشتوانی بومی (ئەسڵی) ئەم شوێنانە، بون.

لەم ڕوەوە (ئارانسکی) نوسیویەتی:

لە سەرچاوەکانی زمانە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیکەوە، زانراوە کە لە (٣-٢) سێیەم و دوەم هەزارەی پێش زاین، لەو ناوچانە، لە مەساحەی ئێرانی ئێستادا، خێڵ و نەتەوەی وایان، تیادا ژیاوە کە بە چەشنە زمانێک دواون نە ئێرانی زمان و نە هندو ئەوروپایی بون، وەک: ئیلامییەکان (لە دۆڵی کارون و کەرخە و ویلایەتی خوزستان، کاسییەکان (بەبابلی کاشو) و لولوبیەکان لە چیاکانی ڕۆژئاوای ئێران، کاسپییەکان و مانییەکان لە خواروی ڕۆژئاوای دەریای خەزەر. بەپێی سەرچاوە تەنیا لەسەرەتای یەکەم هەزارەی پێش زاینەوە نیشانەی دەرکەوتنی ئێلێمێنتی نەتەوەیی ئێرانیی زمانەکان و دزەکردنیان بۆ ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژاوای ئێران سەلمێنراوە. (ئارانسکی ئی. م١٩٦٣: ٣٣-٣٤)

ئارانسکی لەسەرچاوەی تریشیدا، دیسان نوسیویەتی: لەسەرەتای یەکەم هەزارەی پێش زاین جم و جۆڵی گروپە گەورەکانی قەبیلە ئێرانی زمانەکان، لە ناوچەکانی ڕۆژئاوا و خواروی ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست و بەشی ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژئاوای ئێران، بینراون. لەنێوان هەردو ڕوبار و بەشی ڕۆژئاوای بەرزاییەکانی ئێران کە

(دراوسێی ئەوانە) لە زەمانی کۆندا، قەبیلە و قەومی وایان، تیادا نیشتەجێ بوبو کە زمانەکانیان، هندو ئەوروپایی نەبون.

جۆرە خێڵ و قەومێک، دۆڵە بەپیت و بەرەکەتەکانی دیجلە و فوراتیان داگیرکردبو کە پێشتر، بە زمانە سامییەکانی، (ئاشوری، بابلی و هی تریش)، دەدوان. لە خواروی ڕۆژئاوا و دۆڵەکانی کارون و کەرخە (خوزستانی ئێستا)، زمانی یەکێک لە کۆنترین دەوڵەتی ئاسیای پێشین، واتە (عیلام) کە پایتەختەکەیان، (شوش) بو لە برەودا، بوە. ئاسارەکانی ئەو زمانە بەستراونەتەوە بە سێیەم هەزارەی پێش زاین کە لە هەندێ شوێنی سەنتەری ئێران و پارس، دۆزراونەتەوە.

قەبیلە کێونشینەکانی (کاسی و لۆلۆبی)، لە کوێستانەکانی ڕۆژئاوای ئێران، دەژیان کە بە زمانی حیاواز دەدوان لە عیلامیەوە، نزیک بون.

لە خواروی ڕۆژئاوای دەریای خەزەر (کاسپی)، خێڵەکانی (کاسپی) و (مانی) کە لای نوسەرە گرێکە کۆنەکان، ناسراوبون، دەژیان، بەڵام هیچ ئاسارێکی[٦] وایان لێ بەجێ نەماوە کە لە ڕێگەی ئەوانەوە، بتوانرێت، درک بە زمانەکانیان بکرێت[٧]. (آرانسکی ای. م. ١٣٧٩: ٧٥)

کوردستان لەبەر هەڵکەوتنی گیۆگرافیای خاکەکەی و دەشتی بەپیت و ئاووهەوای چوار فەسڵی، هیچ کاتێک بێ دانیشتوان، نەبوە و هەمیشە لەگەڵ میلەتانی دەرودراوسێی کە جار، هەبوە زمانەکانیان لە گروپی زمانە ئێرانییە هاوگروپەکانی خۆشی نەبوە لە کۆنتاکتدا، بوە، بۆ نمونە لەگەڵ (سۆمەری و ئەکەدی)یەکاندا.

دەربارەی دەست پێکردنی دەورانی حوکمڕانییان لەم ناوچەیەدا، ڕای جیاواز، هەیە. بەلای هەندێکەوە لە (٣٨٠٠- ٣٧٠٠)ی پێش زاینەوەیە، هەندێکی تر (٣٠٠٠) پێش زاینی بۆ دادەنێن کە ئەمەیان بە پەسەندتر، دانراوە.

لەناو خێزانی سامی و حامییەکاندا، سامییەکان کۆنترین دراوسێی ئێرانزمانییەکان بون و بە بەردەوام لەگەڵیاندا، لە کۆنتاکت و پەیوەندیدا،

بـون. ئاکـامی ئەو تـێکەڵ بونەشـیان، بەکـارتێکردن بۆسـەر یەکتـری شکاوەتەوە.

(ئەکەدی)، کۆنترین زمانی سامییە کە لە (بابلی- ئاشوری) پێک، هاتبو، ئەو ئاسارانەی کە لەدوای خۆی بەجێی هێشتوە، هی (٢٨٠٠) ساڵ پێش زاینە.

ئەم زمانە کە بە دیالێکتی ڕۆژهەلاتیی لقی سامیی، دادەنرێت، کاتێک بوە بە (ئاشور و بابلی)، ناوبراوە، زمانی ئەو قەومە سامییە بوە کە دەستی بەسەر خاکی سۆمەرییەکانی نێوان ڕوباری دیجلە و فوراتدا، گرتبو و لەگەڵیاندا، شارستانیەت و زانست و زانیارییان، ئاڵوگۆڕکردوە. (پرویز ناتل خانلری١٣٩٢: ١٤٤)

ئەو خێڵ و قەوم و میلەت و نەتەوانەی کە لە ئاکامی ڕوداو و کارەساتی سروشتیی و ناسروشتیی، وەک: کۆچ و داگیرکردن و شەڕوشۆڕو لافاو و قاتوقڕی و گرانیی و برسێتی و پەتا و بڵاوبونەوەی نەخۆشی و ...... هی تریش، لە ئەرز و ئاوی خۆیان هەڵدەکەنرێن و دەکەونە بوم و زەوی و خاکێکی نوێوە، ڕوبەڕوی کلتوری دانیشتوانی ئەسڵی ئەو ناوچە تازەیەی کە ناچارن بۆ بەڕێوەبردنی ئیش و کاری ڕۆژانەیان، هەڵس و کەوت و ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن، دەبنەوە، ئەمەش هاتنەکایەی کلتوری هاوبەش بەدوای خۆیدا، دێنێت، و ئەمیش، دەبێت بە دینەمۆی لەدایکبونی شارستانییەتێکی تازەو نویٚ. زمانی زاڵ بو بەسەر هیتردا، جا چ بومی بێت، چ زمانی داگیرکەرو دەسەڵات، لەپاڵ کۆنتاکتی زمانیدا، بەشێک لە کلتوری خۆشی، دەڕژێنێتە، زمانە ژێردەستەکانی، هەر بۆ نمونە: زمانی سۆمەری و ئەکەدی بە لقەکانی: (ئاشوری، ئارامی، سریانی، عەرەبی)، سەدەها ساڵ، زمانی حوکمڕانانی کوردستان، بون، تا ئێستاش، ئاسارەکانیان، بە باشی لە زمان و کلتوری کوردیدا، ماونەتەوە و هەستیان پێدەکرێت.

(ڕێــــز) کە لەســــەرودا، وەک نیشـــــانماندان بە واتــــای (قەدر و حورمەت) بەکارناهێنرێت، بەڵکو (ڕیـزو ڕیزگرتن و نیـزام و ســەف و زنجیــــرە) دەگەیەنێـــت، ڕەگ و ڕیشــــەکەی لە بنجـــدا، بەم شــــێوەیە، براوەتەوە سەر وشەی (رأس)ی عەرەبی:

(rēz) > (رأس)ی عەرەبییــە کە حەیــوانی پێبژێــراوە. ( pēňḍrēz hasp)[٨] واتە پێنج ئەسپ. (پێوتەر لێرخ١٨٥٨: ٦٦).

وشەی (رأس)یش، لەناو چەند زمانێکی تردا، بەرامبەرێنی پێکراوە: (حازم علی کمال الدین ٢٠٠٦: ٥٢)

| عەرەبی | حەبەشی | عیبری | سریانی | ئاشوری | سانسکریتی |
|---|---|---|---|---|---|
| رأس [٩]ra>s | re>s | rōš | rīšā | rešu | Sira |

لە زمانناسی ئێرانیدا، لە هەندێ حاڵەتدا، گۆڕانی فۆنەتیکی فۆنێمی /ش/ > /س/ و بە پێچەوانەشەوە، ئاسایی بوە، وەک لەفارسیدا:

شــحرور = ســحرور (باڵنـدەیەکی دەنگخۆشــە)، طـرفش = طـرفس (ســەیرکردن)، طـرمش = طـرمس (تاریـک داهـاتنی شــەو)، طرمشــە = طرمسە (تاریک داهاتنی شەو)، باتس = باتش (ترنج)، بـالوس = بـالوش (کافوری ساختە)، سمور = شمور (سمۆرە)، سپش = شـپش (مێشـولە)، فرستە = فرشتە (فریشتە). (علی اکبر دهخدا ١٣٧٧: ١٣٩٢٤، ١٣١٧٦)

ئەم ڕوداوە فۆنەتیکییە لە کوردیشدا، بینراوە:

-mušti (ئاوێســتا)، -musti (هنـدی کـۆن) بە (مشــت) مـاوەتەوە و بوشــە بە (مســت)، asa* (ئێرانـی کـۆن)، as, asana (هنـدی کـۆن)، واتە (خواردن) لە کوردیدا بوە بە (ئاش)، تا ئێستا لە گەرمیان بەتایبەتی لە کەرکوک بە چێشت دەوترێت (ئاش)، ئاش (هـی هـاڕین) بوە بە (ئـاس) وەک لە (ئاسیاو)دا، ماوەتەوە. (تسابولۆڤ. ر. ل. ١٩٧٦: ٦١، ٦٣)

(مــۆرفێم)، وەک دانەیەکــی ئەبســـتراکتی زمــان، بە گشـــتی یەک (مـۆرف)ی کـۆنکرێتی هەیە، ئەویـش، خســتنەگەڕێتی لەقســەدا، بەڵام لە

سـێ (٣) حاڵەتـدا: (فـۆنەتیکیی، مۆرفۆلـۆژی، مێژویـی)، بـۆی هەیە، لە مۆرفێک، زیاتریشی، هەبێت، بۆ نمونە لە کوردیدا: دەتوانرێت لە هەندێ حاڵەتـدا، فـۆنێمی /س/ وەک /ز/ بەرگـوێ بکەوێـت و بوترێـت، یـا بە پێچەوانەوە:

دەرس ~ دەرز، نێرگس ~ نێرگز، کەس ~ کەز، ڕێواس ~ ڕێواز، دەسگیران ~ دەزگیران، گەسک ~ گەزک، سک ~ زک.

گۆڕانی /س/ > /ز/، یا بەپێچەوانەوە، ئەنجامی ئەلۆفۆنی /س/، یا /ز/، دا، دەردەکەون، ئەم دو (٢) فـۆنێمە، لێـرەدا سـینۆنیمن، ئەو فـۆرمە جیاوازانەش، ئەلۆمـۆرفی یەکترن، بەڵام کـام فۆرمیـان، پێشـترە لەویتر، ئەوە، تەنیا لە ڕێگای زانستی ئێتمۆلۆژییەوە دەتوانرێت، سـاغ بکرێتەوە، بۆ نمونە:

لە (دەرس ~ دەرز)دا، (دەرز) پێشترە، چونکە بەرامبەری لە فارسی ناوەڕاستدا، (هاندەرز handarz)ە و واتای (ئامۆژگاری) گەیاندوە.

وشـەی (دەرس، یـا دەرز) تـاکو ئەمـڕۆش لە کوردیـدا، بە واتـای (ئامۆژگاری) لەکاردایە، وەک:

**ئەو <u>دەرسێکی</u> وای داداوە، هەتا هەتایە لەبیری ناچێتەوە.**

**<u>دەرسی</u> لە غەڵەتەکانی وەرنەگرتوە.** (رستەرگۆیڤا. ڤ. س. ١٩٦٦: ٥٥)

لە (کەس~ کەز)، (دز ~ دس)یشـدا، بەرامبەرەکانیـان لە پەهلەویـدا: (kas)و (dūzd) واتە: (کەس) و (دز) لەپێشـترن. (بهـرام فرەوشـی١٣٨١: ٢٣٣، ٤٠٧)

لە کوردستان و زۆر شوێنی تریشدا، لەکاتی ژماردنی مەڕو مـاڵات و حەیوانـدا، بـۆئەوەی حسـابەکەیان، ڕاسـت و دروسـت، دەرچێـت و توشـی غەڵەت نەبـن، دانە بە دانە، یەک لەدوای یەک بەڕیـز دەهێنـرێنە بەردەم ئەو کەسەی کە دەیانژمێرێت، یا ئەو ئافرەتەی دەیاندۆشێت.

ئەمە وێنەی جێبەجێکردن و پەیڕەویکردنی جۆرە قانون و نیزامێکە کە حەیوانەکـانیش پێـی ڕاهـاتون و لە خەت دەرنـاچن، خـۆ ئەگەر

یەکێکیان، بزێوی کرد، ئەوا سزای خۆی وەردەگرێت، بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر لەڕیز دەرنەچو، ئەوا بە سەلامەتی ڕزگاری دەبێت.

دیمەنی ئەم پانۆرامایە گوێزراوەتەوە بۆ ناو خەڵکی، مرۆڤ، کاتێک گوێڕایەڵی قانون و نیزام دەبێت، ستایش دەکرێت و قەدر و حورمەت و ئیحتیرامی دەگیرێت، ئەگەر بە پێچەوانەشەوە، هەڵس و کەوت و ڕەفتار بکات، لۆمە دەکرێت و بەسزای خۆی دەگات.

چەمک و واتای مل کەچکردن بۆ قانون و یاسا و لانەدان لێی و ئیحتیرام گرتنی داب و نەریتی باوی ناو کۆمەڵ، لە دیالێکتی خواروودا، بەو وشەی (ڕێز)، دەگەیەنرێت، کە لە سەرەتاوە، بێگومان بە واتای (سەر)ی (ئەندامی لەش)، بەکارهاتوە، دواتر، واتای (ژمارە و دانە و عەدەد)ی بەخشیوە، لە کۆتاییشدا، بە میتافۆری واتاکەی گۆڕاوە بۆ (قەدر و حورمەت).

بە بۆچونی ئێمە، (ڕێز) لە خەباتی مانەوەیدا، کەوتوەتە بەربەرەکانی وشەکانی: (کەلە) و (سەر)ی ئێرانیزمانی، لە کۆتاییدا، خۆی پێ ڕانەگیراوە و دەرەقەتیان، نەهاتوە، بەڵام وەک، گەیەندەری (ژمارە) و (دانە) لە حسابکردنی حەیواندا، نەیانتوانیوە بەتەواوی دەرییەڕێنن (وەک بەکارهێنانی لە دیالێکتی سەرو)دا، کە تا ئەمڕۆ بۆ ئەو مەبەستە، لەکاردایە.

ڕاستە لە ژماردنی حەیواندا، لە سەرودا، تا ئێستا، ئیشی پێ دەکرێت، بەڵام بەگشتی لە خوارودا، (سەر) جێی پێ لێژکردوە و دەری پەڕاندوە، بۆ نمونە، دەوترێت: دە سەر حەیوان، دە سەر بزن، سێ سەر مەڕ.... هی تریش، وەک پێوانەی ژمارە بۆ ئادەمیزادیش، بەکاردێت: خاوەنی چوار سەر خێزانە.

لە دیالێکتی خوارودا، وشەی (سەلک)یش، بە واتای (ژمارە و دانە) لە هەندێ حاڵەتدا، کاری پێدەکرێت، وەک: سەلکێک پەنیر، یا یەک سەلک پەنیر، دو سەلک پیاز، یا سەلکە پیاز، سەلکە تور، سەلکە ترخێنە، سەلکە هەویر، سەلکە بزوت، سەلکە سابون و ..... هی تریش. وشەی (سەلک)

نابێت، تێکەڵ بە (سەر) بکرێت و هیچ پەیوەندییەکیان، پێکەوە، نییە. لەڕوی ئێتمۆلۆژییەوە، (سەلک) لە ڕەگ و ڕیشەدا، هندو ئەوروپاییە و بەرامبەرەکانی لە هەندێ لەو زمانانەدا، بەم شێوەیەیە:

تاخاری (SLAKKAR)، لاتینی (LAXUS)، فەرەنسی (LÂCHE)، ئیسلەندی کۆن (SLAKR)، ئینگلیزی (SLACK)، سویدی (SĹAK)، نەرویجی (SLAKK)، و ...... هی تریش.

بەڕای (ئاریان پورکاشانی)، وشەی (لەش و لاشە)، دەچنەوە سەر ئەو ڕەگە هندو ئەوروپاییانە. (منوچهر آریان پورکاشانی۱۳۸٤: ۳۵۲- ۳۵۳)

بەڕای ئێمە، وشەی (لاک)ی کوردیش وشەی (سەلک) دوای گۆڕینی فۆنیمی /ک/ > /ق/ بوە بە (سڵق)، وەک لە ئیدیۆمی:

وەک: سڵقی ڕوت هاتوە.

لێرەدا، (سلق) واتە هیچ جسمێکی تری پێ نییە، یا بەدەستی بەتاڵ هاتوە.

لەو ڕستەیەدا، (سلق) هیچ پەیوەندییەکی بە (سلقی) خواردنەوە، نییە، بەڵکو هۆمۆنیمی یەکترن.

کەواتە وشەی (سەلک)یش، لە پاڵ (سەر)دا، وەک (ژمارە و دانە)، بەکاردێت، هیچ پەیوەندییەکی ئێتمۆلۆژی بە (سەر)ەوە نییە.

بە لەبەرچاوگرتنی کاریگەری فاکتەرە نازمانی و زمانییەکان لە گۆڕان و شڵەقاندنی فەرهەنگی زماندا، دەمانگەیەنێتە ئەو ڕاستییەی کە بڵێین: لەناو ئەو وشە سامییانەی کە بەرامبەرێنیان بە (رأس)ی عەرەبی پێکراوە، نزیکترینیان کە بتوانرێت بەرامبەر بە (ڕێز)ی کوردی، ڕابگیرێت، لەبەر ئەم هۆیانە، (ڕێشو rešu)ی ئاشورییە:

١- ئەگەر لە فاکتەرە نازمانییەکانەوە، بۆی بچین، دەبینین، یەکێک لەو زمانە سامییانەی کە چەندین سەدە لەگەڵ زمانی کوردیدا، لە کۆنتاکتدا بوە، زمانی ئاشورییە. ئەمانە لە دەوروبەری (٢٤٠٠)ی پێش زاین لە ناوچە شاخاوییەکانی دیجلە و فوراتدا، دەوڵەتیان، دامەزراند، بو بەدرێژایی ماوەی حوکمڕانیان، بەمەبەستی داگیرکردن و فراوانکردنی

سنوری دەسەڵاتیان، هەمیشە لە حاڵەتی شەڕو شۆڕ و پەلاماردانـدا لەگەڵ میلەتانی دەوروپشتیاندا، بون. یەکێک لەو میلەتانەی کە بە باپیرە گەورەی کورد، بەناوبانگن (میدی) بو.

بەپێی بەڵگەنامەی مێژویی، ئەوانیش، ماوەی (٥٢٠) ساڵ، ژێر دەستەی ئاشورییەکان، بون، بەڵام لە (٦٠٠) پێش زاینیدا، هەر بەدەستی میدیاییەکانیش لەناو چون. (اقرار علی یف ١٣٨٨: ٣١٦) (پرویز ناتل خانلری١٣٩٢: ١٤٦)

گومانی تیادا، نییە کە ئەو ماوە دورو درێژەی کورد لە ژێر دەسەڵات و حوکمڕانی ئاشورییەکاندا، بوە، زمانی هەردولا لە کۆنتاکتی بەردەوامدا بون، و وشەیان، ئاڵوگۆڕ کردوە.

وشەی (ڕێز) کە لە هیچ زمانێکی خێزانی زمانە هندو ئەوروپاییەکان و زمانە ئێرانییە کۆن و نوێکاندا، هاوشێوەی نییە، بە بۆچونی ئێمە، بەرهەمی ئەو پەیوەندیی و تێکەڵاوییەی کورد بوە لەگەڵ ئاشورییەکاندا.

٢- ئەگەر لەڕوی فاکتەری زمانیشەوە، بڕوانینە، پەیوەندیی (ڕێز) بە وشەی (ڕێشو)ی ئاشورییەوە، دەشێت، گۆڕانی ئەو وشەیە بۆ (ڕێز)ی کوردی بەم شێوەیە، بخەینە بەرچاو:

(ڕێشو) > (ڕیسو) (دوای گۆڕینی /ش/ > /س/ و /و/ بەرداشکەوتوی ئێکۆنۆمی) > (ڕێس) (دوای گۆڕینی /س/ > /ز/، بوە بە (ڕێز).

کەواتە، بنج و بێخی (ڕێز)، دەچێتەوە سەر ئەو وشە، ئاشورییە، نەک بۆ (رأس)ی عەرەبی، وەک (لێرخ) بۆی چو بو، چونکە کاریگەری زمانی عەرەبی بۆ سەر کوردی بە بەراورد بە (سۆمەری و ئەکەدی و ئاشوری) ئەوەندە کۆن، نییە.

**ئەنجام**

١- وشـــەی (ڕێــز)، تــایبەتە تەنهــا بە فەرهەنگــی گشــتی زمــانی کوردییەوە، لە هیچ زمانێکی هندو ئەوروپایی و ئێرانیی کۆن و نوێدا، بەدی نەکراوە.

٢- (ڕێــز) پــردی پەڕیــنەوە و تەرجــومەکردنی نوانــدنی کلتــوری ســـــەردانەواندن و دەســـــت بەســـــنگەوە گـــرتن و چـــۆک دادانە لە ئیشارەتکردنەوە بۆ زمانی قسەکردن.

٣- بنج و بێخی (ڕێز)، دەچێتەوە سەر وشەیەکی زمانی ئاشوری کە زمانێکی سامییە و دراوسێی کوردستان، بون و ماوەیەکی زۆریش، حوکمڕانی ئەم ناوچەیە، بون.

٤- بــارکردنی (ڕێــز) بە گەیانــدنی واتــای (قەدر و حــورمەتگرتن) نیشـــانەی زینـــدویی فەرهەنگـــی زمـــانی کـــوردی و بەرهەمـــی ئەو کۆنتاکتـــانەیەتی لەگەڵ میلەتـــانی دەســـەڵاتدار و دەورو پشـــتی و نەشونماکردنی بیری نەتەوەیی و لەویشەوە، زمان پاراوی، بوە.

٥-(ڕیـز)، ئەلۆمـۆرفی (ڕێـز)ە، دیـارە لە سـەرەتادا، بە جـوتە، یەک واتایان، بەخشیوە، دواتر، ڕێچکەیان، گۆڕیوە.

## سەرچاوە

**بەزمانی کوردی:**

- دیوانی گۆران (١٩٨٠) بەرگی یەکەم، بەغدا.
- دیوانی مەحوی (١٩٨٤)، دوەم چاپ، بەغدا.
- دیوانی پیرەمێرد (٢٠١٦) بەرگی ١، ٢، ٣، سلێمانی.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی (١٩٨٦)، هەولێر.
- دیوانی نالی (١٩٧٦) بەغدا.
- جەمیل صائیب (٢٠٠٨) لەخەوما، چاپی دوەم، هەولێر.
- سوارەی ئیلخانی زادە (٢٠٠٧) زەمزەمەی زوڵاڵ، هەولێر.
- شێخ محەمەدی خاڵ (١٩٩٨)، فەرهەنگی خاڵ، ج٢، چاپکردنەوەی بۆ دوەم جار، سەقز.
- ع. ع. شەونم (٢٠١٢) جریوەکان، سلێمانی.
- فاروق عومەر سدیق (٢٠١٧) زمانناسی کوردی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی نارین، بەیروت.
- فاروق عومەر سدیق (٢٠١٩) بنیاتی بنجی وشەی (حەز) و هاوڕیشەکانی لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە ٤٣، هەولێر.
- هەژار (١٣٨٤) هەنبانەبۆرینە، تهران.

**بەزمانی فارسی:**

- احسان بهرامی (١٣٦٩) فرهنگ واژەهای اوستا، ج١، تهران.
- آلن پیز (١٣٩٦) زبان بدن، مترجم زهرا سیمی، چاپ چهارم، قم.
- آرانسکی. ای . م . (١٣٧٩) مقدمۀ فقه اللغۀ ایرانی، ترجمۀ کریم کشاورز، چاپ دوم، تهران.
- اقرار علی یف (١٣٨٨) پادشاهی ماد، ترجمه کامبیز میر بهاء، چاپ اول، تهران.
- بابا شیخ حسینی (١٣٨٣) هامشی بر دانش زبانشناسی، سنندج.
- بهرام فرەوشی (١٣٨١) فرهنگ فارسی به پهلوی، چاپ سوم، تهران.
- پرویز ناتل خانلری (١٣٩٢) تاریخ زبان فارسی، تهران.
- علی أکبر دهخدا (١٣٧٧)، لغت نامه، ج ٩، چاپ دوم، تهران.

- منوچهر آریان پورکاشانی (١٣٨٤) فرهنگ ریشه‌های هندو اروپایی زبان فارسی، اصفهان.

**بەزمانی عارەبی**

- حازم علی کمال الدین (٢٠٠٦) المشترک السامي السنسکریتي، القاهرة.

**بەزمانی ڕوسی:**

- ئارانسکی ئی. م. (١٩٦٣) زمانە ئێرانییەکان، مۆسکۆ.
- باکایێڤ (١٩٥٧) فەرهەنگی کوردی- ڕوسی، مۆسکۆ.
- پێوتەر لێرخ (١٨٥٨)، کوردی ئێران (خالیدییەکانی سەرو، فەرهەنگی کرمانجی، سێیەم بەرگ، سان پیتربورگ).
- تسابولۆڤ. ر. ل. (١٩٧٦) کورتەی فۆنەتیکی مێژویی زمانی کوردی، مۆسکۆ.
- ڕاستەرگویێڤا ڤ. ڕ. (١٩٦٦) زمانی فارسی ناوەڕاست، مۆسکۆ.
- فەرهەنگی وشەی بێگانە (١٩٨٠) هەشتەم چاپ، مۆسکۆ.
- کوردۆیێڤ (١٩٦٠) فەرهەنگی کوردی- ڕوسی، مۆسکۆ.

ئێتمۆلۆژی چەند وشەیەک کە لەم باسەدا بەسەر کراونەتەوە:

١- ڕێز
٢- ڕیز
٣- ڕێزە
٤- ئاسار
٥- ئەسەر
٦- ئاش (خواردن)
٧- ئاش (هاڕین)
٨- دەرس
٩- کلتور
١٠- ئەدا
١١- ئەتەکێت
١٢- سەلک
١٣- مشت
١٤- مست
١٥- لەش
١٦- لاشە
١٧- لاک

**پەراوێزەکان:**

[1]- ئەتەکێت لە وشـەی: (etiquette) فەڕەنسـییەوە وەرگیـراوە، ئەمـیش لە: (ethica)ی لاتینـی کە لە ئەسـڵدا، (ēthos)ی گـریکییە قەرزی کـردوە، بە بەخشـینی دەربڕینـی واتـای (دەسـتوری دیـاریکراوی هەڵس و کەوتـی شـوێنێکی وەک قەسـری پاشـا) بەکارهێنراوە. بڕوانە: (فەرهەنگی وشەی بێگانە:٦٠٨)

[2]- وشەی (ئەدا) لە [(ە-) +دا√] سـازێنراوە. پرێفیکسـی (ە-) (-∂) لە زمـانە ئێـرانییە کۆنەکاندا، بۆ بەخشینی دو واتای دژبەیەک، پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ، بەکارهێنراوە. ئەم ڕەگـی (دا√)یە، هەر ئەو (دا-)یەیە کە لە دروسـتکردنی نـاوی ڕوداوی وەک (دان، دانـان)دا، بەشـدارە، بـۆ نمـونە لە ڕسـتەکانی: مـن کتێبەکەم دا بە تـۆ. مـن کتێبەکەم لەسەر مێزەکە داناوە. بڕوانە: (احسان بهرامی ١٣٦٩: ٦١)

بەڕای ئـێمە، وشـەی (آدا)ی عەرەبـیش، سـەرچاوەکەی، هەر ئەو (ئەدا) ئێـرانییەیە و بەکارهێنانیشی لە کوردیدا، بە پەسەند دەزانین.

[3]- بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی چەندێتی و چۆنێتی بەکارهێنـانی ئەم جـۆرە وشـانە بڕوانە: (فاروق عومەر سدیق ٢٠١٧: ٩٩- ١٢٧).

[4]- ئەم بەرهەمـانە، لە سـەرچاوە ئەسڵییەکانیاندا، چـۆن نوسـراون، هەر بەو ئیملایە، نەقڵمان کردون.

[5]- مەحوی، (ڕیز)ی بە واتـای (سـەف و ڕێزگـرتن) بەکارهێنـاوە، نەک (ڕێـز) وەک لە هەنبانە بۆرینەدا، نوسراوە، بڕوانە: (دیـوانی مەحـوی ١٩٨٤: ٢١٩)، (هەژار١٣٨٤: ٣٦٦).

[6]- وشــەی (ئاســار)، جەمعــی تەکســیری عەرەبــی وشــەی (ئەســەر)ە، کە لەبنجـدا، ئێرانیزمانییە و بەم شێوەیە پێکهاتوە:

(ە-) + (سەر) (سەرەتا، شوێن) > ئەسەر.

واتە، سەرەتای نییە، ئەبەدییە، لە فارسی ناوەڕاستدا، یا لە پەهلەوی، پرێفیکسـی (ە- a-) وەک لە باسـی (ئەدا)دا، ڕونمـان، کـردەوە، واتـای پۆزەتیـڤ و نێگەتیـڤ بەو وشەیەی چۆتە پێشی بەخشیوە.

هەر لەو زمانەشـدا، (ئەکـار akār) واتە (بـێ ئـیش)، (ئەمەرگ amarg) واتە: نەمـر. (ڕاستەرگۆیێڤا. ڤ. ڕ. ١٩٦٦: ٣٥)

وشەی (ئەسەر) بە (ئاسار)ی فۆڕمە عەرەبییەکەشەوە کە لە کوردیدا، حسـابی تـاکی بـۆ کراوە، وەک لە نمـونەی: (ئەو ئاسـارانە، یـا ئاسـارەکان)دا، دەبینرێت، هەردو

فۆڕمەکە مـوڵکی زمـانی کـوردی خـۆیەتی، لەبەرئەوە، نازانسـتییانە، پێویسـت ناکـات، ڕابکەیـن لە بەکارهێنانیـان، خـۆ ئەگەر بەئەسـڵ کـوردیش، نەبونـایە، لەبەرئەوەی لە گەنجیـنەی زمـانی کوردیـدا، جێیـان بـوەتەوە و بەسـەر زاری خەڵکـیەوەن لەقسـەکردندا، ئەوا بـون بە مـوڵکی کـوردی، جـێ پـێ لەقکردنیـان، نادروستە و لە دەستەڵاتی ئەم و ئەودا، نییە.

[٧]- هەر دەربارەی ئەو زمانانەی پێش یەکەم هەزارەی پێش زاین لە میسۆپۆتامیا و ئێران و کوردسـتان، قسـەیان پێکراوە، بڕوانە: (بابـا شـیخ حسـینی١٣٨٣: ٢٩٧- ٣٢٦)، (پرویز ناتل خـانلری١٣٩٢: ١٣٩- ١٥٢)، (فـاروق عومەر سـدیق ٢٠١٩: ٧- ٢٨).

[٨]- وەک تێبینییەک: بەباشـمان زانی وەک خۆی بەو ئەلفوبێیەی پێی نوسـراوە، هەر بەو شێوەیە بۆ ئێرەی بگوێزینەوە.

[٩]- نوسەر سیگناڵی (<)ی بەرامبەر بە هەمزە، داناوە.

## ملخص البحث

## نَـماء كلمة ( ڕێـز ) وتـأصيلها في اللغة الكورديّـة

الأستاذ الدكتور فاروق عمر صديق

العضو العامل في الأكاديمية الكوردية/ أربيل

جامعة السليمانية

هذا البحث موسوم بـ " نَماء كلمة (ڕێز) وتأصيلها في اللغة الكورديّـة "

تعد كلمة ( ڕێـــز ) من الكلمات النشطة الفعالة في اللغة الكردية، وقد تمَّ تشـريحها تأصيليّاً، ودلاليّاً، ومعجمياً، وصرفيّاً، في إطار هذا البحثِ البِكرِ الذي لم يُطرق مـن قبـلُ في اللغة الكوردية.

وقد جاءت هذه اللفظة اللغوية لترجمـة مـا كـان يؤديـه النـاس مـن معـاني الاحـترام والتوقير لمن يقابلونهم، بلغة الإشارة والإيمــاء من الانحنــاء، وخفـض الـرأس والـجُــثـُــوِّ على الــرُّ كَب، إلى لغة الخطاب اللغوي، فكلا التعبيرين الإشـاري واللغـوي اللفظـي ملتزمـان بالتعبير عن القيم والأعراف والتقاليد الاجتماعية الأصيلة.

فعند البحث عن تأصيل وتأثيل هذه الكلمة وجدنا أنها ترجع أصلاً إلى لفظة في اللغـة الآشورية، وهي لغة سـامية، وكانـت مملكـة آشـور مجـاورة لكردسـتان، وقـد حكمـت هـذه المنطقة حقبة من الزمن، فمـن الطبيعـي أن تنتقـل الألفـاظ عـن طريـق التـأثر والتـأثير ثـم تتطور وتتحور بين اللغات، وتكتسب دلالات جديدة.

إنَّ كلمــة (ڕێـز) مشـحونة ومحملـة بمعـاني الاحـترام والتـوقير والتبجيـل في اللغـة الكوردية، وهذا بطبيعة الحال تـدل علـى حيويـة المعجـم الكـوردي وقابليتـه المرنـة للأخـذ والعطاء والتطور، وهي ثمرة احتكاكها بالأقوام الغابرة.

وجاءت لفظة " ڕیـــز " تنوعاً صـرفياً ( ألومـورف ) لكلمـة (ڕێـز)، وكانـت لهمـا المعنى نفسه في مستهلهما، ثم غيرتــا سلوكهما فيما بعد.

ويقع البحث في مقدمة، وثلاثة مباحث، وخاتمة بأهم النتائج، كالآتي:

المبحث الأول: تناولَ دلالة ومكانة (ڕێز) في خزين اللغة الكوردية.

المبحث الثاني: تضمن التحليل الصرفي المورفولوجي لبنية (ڕێـز).

المبحث الثالث: مخصص لبيان التأثيل والتأصيل الإتمولوجي لكلمة (ڕێـز) بصورة محسومة.

## ABSTRACT

### The conspicuity of the word REZ and its roots in Kurdish

**Professor Dr. Farooq Omer Siddiq**
Active Member of the Kurdish Academy- Erbil
University of Sulaimani

REZ (respect) is one of the most active and productive words in Kurdish. This word is here explored for the first time within the semantic and lexicological framework and particularly from the perspective of etymology and morphology. The word REZ (respect) is the bridge and the translation of the cultural representation of nodding, putting hands on the chest, and kneeling from a method of signaling into a speaking language both of which are rule-governed.

The roots of the word REZ goes back to an Assyrian word, a Semitic language adjacent to Kurdistan who ruled the region for a long time.

The word REZ being charged with the sense of respect and deference in Kurdish is indicative of the language's lexical liveliness as well as its contact with the neighboring people's their rulers'. This may have also resulted from a maturation of a sense of nationalism and language consciousness.

The word REEZ is variant or an allomorph of the word REZ. At an earlier period, they meant the same but then changed course and took on different meanings.

The present study consists of three parts and conclusions. The first part deals with the semantics and the position of REZ in the Kurdish lexicon. The second part morphologically explores the nature of the word REZ and finally the third part pinpoints the etymology and the roots of the word REZ.

# تارمایی مەرگ
# لە شیعرەکانی شەهید مەلا عەلی- دا

**پ. ی. د. فەرهاد قادر کەریم**
کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت
زانکۆی گەرمیان

**پێشەکی**

شیعر بەوپێیەی هۆگری گەڕانە بەدوای کرۆکی شتەکاندا، بە یەکێک لە دیارترین هونەرەکان دادەنرێت، کە گوزارشتی لە مەرگ کردووە و بەدوای ڕازی مەرگدا ڕۆیشتووە، بۆیە لە هەموو سەردەمەکاندا شاعیران لەبارەی مەرگەوە دواون، خۆ ئەگەر ئەو شاعیرە وەک (شەهید مەلا عەلی) لە هەرەتی لاوێتیدا لە زینداندا بووبێت و مەحکوم بووبێت بە لەسێدارەدان لەسەردەستی ڕژێمێکی دڕندەی وەک بەعس، ئەوا بێگومان مەرگ تابلۆیەکی دیارو وێنەیەکی هەمیشە ئامادەی نێو دەقە شیعرییەکانی دەبێت.

بەمەبەستی چۆنێتی و چەندێتی ڕەنگدانەوەی مەرگ لە شیعرەکانی شاعیردا و پشتبەستوو بە ڕێبازی (وەسفی- شیکاری)، ئەم توێژینەوەیەمان لەژێر ناونیشانی (تارمایی مەرگ لە شیعرەکانی شەهید مەلا عەلی) دا ئەنجامدا. تیایدا دوای خستنەڕووی بایۆگرافیای شاعیر، لەبارەی شیعر و زیندان و پاشان شیعر و مەرگەوە دواوین و ئینجا لەبەر ڕۆشنایی نموونە شیعرییەکاندا کاریگەریی مەرگمان لەلای دەستنیشان کردووە و لەدوا وێستگەشدا، لەبارەی هەریەک لە بابەتەکانی (یادکردنەوەی کەسوکار و ئازیزان، سروشت، خۆزگە و هیوا)و ڕۆڵیان لە تێپەڕاندنی کەشی زیندان لەلای، دواوین. پاشان ئەنجامەکانی توێژینەوەکەمان خستووەتەڕوو، کە بۆ پێگەیشتنیان سوودمان لە کۆمەڵێک سەرچاوەی جیاواز وەرگرتووە.

**یەکەم/ بایۆگرافیای شاعیر:**

(حسێن مەولود ئەحمەد خدر)، ناسراو بە (مەلا عەلی) لە ساڵی (١٩٥٣) لە خێزانێکی هەژار لە گوندی (بەربەرد)ی ناوچەی (ماوەت)ی سەربە قەزای (شارباژێڕ) لەدایک بووە، ساڵی (١٩٥٨) بەهۆی جیاوازیی چینایەتییەوە بۆ گوندی (کۆکە)ی ناوچەی (سووورداش) بار دەکەن، دوای ساڵێک لە قوتابخانەی (چەرمەگا)ی سەرەتایی دەست بە خوێندن دەکات، لە ساڵی (١٩٦٣) و دوای سووتاندنی گوندەکانی دەوروبەریان لەلایەن ڕژێمەوە، بەمەبەستی تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی ڕوو لە چەند شوێنێک لەوانە (ماوەت و سەرچنار) دەکات، پاشان دەچێتە شاری (سلێمانی) و قۆناغی ناوەندیی تەواو دەکات، هەر لەم قۆناغەدا تێکەڵ بە کاری ڕێکخراوەیی دەبێت و پەیوەندیی بە (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە دەکات، لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧١- ١٩٧٥) لە سلێمانی قۆناغی ئامادەیی تەواو دەکات، لەو ساڵانەشدا بەهۆی هۆشیاری و لێهاتووییەوە دەبێتە جێ سەرنجی ڕێکخراوە سیاسییەکان و دەکرێت بە لێپرسراوی ڕێکخراوی (تۆڵە)ی سەربە (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان)، ساڵی خوێندنی (١٩٧٥ - ١٩٧٦) لە بەشی زمانی کوردی کۆلێجی ئادابی زانکۆی سلێمانی وەردەگیرێت، دوای تەواوکردنی قۆناغی یەکەم و بەهۆی ئاشکرابوونی بەشێکی زۆر لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی (کۆمەڵە)، فەرمانی گرتنی بۆ دەردەچێت، ناچار لە بەرواری (١١-٥-١٩٧٧) ڕوو دەکاتە شاخ و دەبێتە پێشمەرگە لە ڕیزەکانی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)، لەم وێستگەیەشدا خۆپێگەیاندنی سیاسی و ڕۆشنبیری دەبێتە ئامانجی سەرەکی، هەر زوویش دەکرێت بە لێپرسراوی ناوچەی (ژیلوان)ی یەکێتی، کە سەربە قەزای (دووکان) بووە. شەهید مەلا عەلی پێشمەرگە و کادیرێکی هۆشیارو پابەند بووە و پەیوەندییەکی بەهێزی کۆمەڵایەتی هەبووە.

لە ڕۆژی (٣٠-١-١٩٧٩) خۆی و هاوڕێیەکی لە گوندی (کرژە)ی (سووورداش)، دەکەونە بۆسەی دوژمنەوە و دوای شەڕێکی قورس بە

بریندارى دەسـتگیر دەکرێت، لـە (٦-٦-١٩٧٩) دادگـاى (هـەیئـە خاصـەى کـەرکوک) بڕیـارى لـە سـێدارەدانى بۆ دەردەکـات و ڕەوانـەى زینـدانى (موسڵ) دەکرێت و دواى مانگ و نیوێک، لـە شـەوى (٢٢/٢٣-٧-١٩٧٩) لەسێدارە دەدرێت و تەرمەکەى نادرێتـەوە بـە بنەماڵەکەى و لـە گونـدى (وادى عطـاب) دەنێژرێـت، تـادواى ئـازادکردنى عێـراق لـە سـاڵى (٢٠٠٣) تەرمەکەى دەهێنرێتـەوە و لـە گۆڕسـتانى (ئـابڵاخ)ى شـارى سلێمانى بـە خاکى کوردستان شاد دەبێتەوە. ( مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٢٧- ٣٠ ).

**دووەم/ شیعر و زیندان:**

زیندان ئەو پانتاییيە داخراوەیە، کە تاک لە کۆمـەڵ دادەبڕێت و بـۆ ماوەیەکى دیاریکراو یا تامردن ئازادیى لێ زەوت دەکات، ئەمەش بەپێى ئەو تاوانەى کە لەلایەن دەسەڵاتەوە دەدرێتە پاڵى. زیندان بۆ (زیندانى) هەندێ جار، دەبێتە مایەى ئەشکەنجە و ئازارى جەسـتەیى و دەروونـى، ئـەم جـۆرە زیندانانـە لـە ڕۆژهـەڵاتى ناوەڕاسـتدا نموونـەیان کـەم نییـە، بەتایبەتى ئەگەر هاتو پرسى گیراوەکە بەسترابوو بـە بەگژداچوونـەوەى سیاسەتەکانى ڕژێمە دەسەڵاتدارەکانەوە.

ڕژێمـە دیکتاتۆرەکان هەمیشـە باوەڕیـان وایـە، کـە جـەور و سـتەم تاکە ڕێگایە بۆ کپکردنى دەنگە نـاڕازى و هۆشـیارو ڕەواکـان، بەتایبـەتى ئەگەر هاتو دەنگهەڵبڕەکان لـە ڕیـزى ڕۆشـنبیر و نووسـەر و شـاعیراندا بـوون، ئـەوکات ڕژێمەکـە هـەموو ڕێگاکـانى سـەرکوتکردن دەگرێتەبـەر، تاوێــک سانســۆر دەخاتەســەر دەنگــە دلێرەکــان و جــارێ ڕێگــەى بڵاوکردنـەوەیان لـێ دەگرێـت و دواجـار ڕاپێچـى نێـو زیندانـە تـاک و تاریکەکانیان دەکات و ئومێدى بێدەنگکردنیان لەسەر هەڵدەچنێت، بـەڵام گـەلێک جـار ئاکامەکـە پێچەوانـە ئەکەوێتـەوە و زینـدان دەبێتـە هـەوێنى لـەدایکبوونى شـاکارى ئـەدەبى و شـیعرى. (قدور، ٢٠٠٦- ٢٠٠٧: ١٠١- ١٠٢) ئەمــەش هاوتایــە لەگــەڵ ئــەو بۆچوونــە دیــارەى، کــە پێیوایــە ئــازار و موعانات سەرچاوەى داهێنانن (اسماعیل، ١٩٦٣: ٤٢. هەروەها عبدالله، ١٩٩٠: ٢٣)،

ئـەم چەشـنە بەرهەمـە شـیعرییانە لـە بـواری ڕەخنـەدا پێیانـدەوترێت (شـیعری زینـدان)، ((ئـەو شـیعرەی، كـە لـە منداڵدانی موعانـات و لـەنێو زیندانــە تاریكــەكان و لەپشــت دەرگــا ڕەشــەكان لــەدایكبوون، ئەمانــە بەرهەمی برینی سووتانی نێو بەندیخانە و داخبوونە بە ئاگری ستەمی پشت شوورا و بێبەشبوونە لە ساكارترین مافەكان.)) (عبدالفتاح، ٢٠٠٨: ٧)

كەواتــە ئـەم جـۆرە شـیعرە لـە هەسـت و سـۆزێكی ڕاسـتەقینەی ئـاودراو بـە نەهەماتییـەكانی چوارچێـوەی زیندانـەكان داڕێـژراوە، ئـەو دەمـەی شـاعیر ئـازادیی لـێ زەوت دەكرێـت، ئەندێشــەی ئـازاد دەكـات، تــاوەكو قــەرەبووی بۆشــاییە ڕۆحــی و جەســتەیییەكەی بكاتــەوە، بەواتایـەكی تـر ((شـاعیر كاتێـك ئەندێشـەی دەخاتـە كـار لـە حەقیقـەت ڕاناكات، بەڵكو لـەنێو ئەندێشەیشدا حەقیقـەت بـەدی دەكـات، ئەندێشـە و واقیع هەردووكیان ئامرازن بۆ گواستنەوەی ئـەو ململانـێ ناوخۆیییـەی كە داهێنەر پێوەی دەناڵێنێ...، ئەوكاتەش پاڵنەری داهێنـان بریتـی دەبێت لە ئارەزووی ڕزگاربوون لـە واقیـع، نـەك ڕاكردن لێـی.)) (اسماعیل، ١٩٦٣، ٤٤-٤٥) بە وردبوونەوە لە دیوانی شـاعیرانی كورد وەك (گۆران، دیـلان، كاكەی فەللاح، كامەران موكری و قانع)، گەلێك دەقی شیعریی جوان و پڕ لە هیوا و ئومێد، كە كەشی نێو زیندان باڵای پێكردوون، سـەرنجمان ڕادەكێشـێت. یـەكێك لـەو هۆكارانـەی بووەتـە مایـەی زینـدانیكردنی ئـەم شــاعیرانە، گیــانی شۆڕشــگێڕی و پــڕ تێكۆشــان و دلێریــی دەنگیانــە بەرانبەر بـە دوژمنـان، كـە دەسـەڵاتداری ئـەو سـەردەمەی عێراق بـووە، چونكـە هەمیشـە ڕژێمـە یـەك لـەدوای یەكـەكانی عێـراق، دژی خـەباتی نەتەوایــەتی و تەنانــەت چینایــەتیی شــاعیرانی كــورد بوونــە، ئــەم چەوساندنەوەیەی ڕژێم لـە دوا چارەكـەی سـەدەی بیسـتەمدا و لەسـەر دەستی ڕژێمی بـەعس گەیشـتە لووتكە، لـە ئەنجامـدا داڕشـتنی پرۆژەی ریشەكێشكردنی گەلی كوردی لێكەوتەوە، كە خۆی لـە پیـادەكردنی سـێ كوچكــەی بەعســییان (بەعــەرەبكردن، ڕاگواســتن، بــە بەعســیكردن)دا بینییــەوە، ئـەم واقیعـە تاڵـە هــەروەك چــۆن لــە خــەباتی چەكـداری و

سیاسیدا، هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێی لە ساڵی (١٩٧٥) لێکەوتەوە، لە دنیای شیعری هاوچەرخی کوردیشدا ئاسۆیەکی تازەی لەبەردەم شیعری بەرگرییدا کردەوە.

شاعیری شەهید مەلا عەلی، لە بواری خەباتی چەکداری و ئەدەبیشدا دەنگێکی دلێری ئەو ڕۆژگارەی شیعری کوردی بووە، لەم بارەیەوە دەوترێت: ((دیارترین نموونەی شیعری زیندان لە شیعری کوردیدا، بەتایبەتی شیعری سەردەمی شۆڕشی نوێ، ئەو شیعرانەن کە شەهید مەلا عەلی لەکاتی گیرانی نووسیویەتی، ئەوکاتەی ڕۆژانە بەرەنگاریی مەرگ دەبۆوە و ئامادەبوو بەوپەڕی ئازایەتییەوە بچێتە سەر سێدارە.)) (خۆشناو،٢٠٠١: ١٣٧) نەک هەر ئەوە، بەڵکو بەلای هەندێ لێکۆڵەری ترەوە ((خۆڕاگری و شیعرەکانی مەلا عەلی نەک هەر دەرس و پەندێک بوون بۆ پێشمەرگە و ئەندامانی ڕێکخستنی شارەکان، بەڵکو بووبوونە ناوەڕۆکی شیعری شاعیران و چیرۆکنووسانیش.)) (ئیسماعیل، ١٩٩٩: ١٧٩).

زیندان بۆ شەهید مەلا عەلی بوو بە سەرچاوەی شیعر، بەجۆرێک لە کۆی ئەو شیعرانەی لەبەردەستدان، تەنها یەک دەقیان لە دەرەوەی زیندان نووسراون، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت، کە ڕاستە دوژمن شاعیری لە ئازادیی بێبەش کردووە، بەڵام نەیتوانیوە گیانی داهێنانی لێ زەوت بکات، ئەمەش هاوتەریبە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە: ((باوەڕبوون بە پەیامداریی وشە، بە پەیامی نووسەر بۆ نیشتیمان، بۆ ئازادی و شکۆی مرۆڤ، وائەکات شاعیر پێشوازی لەو چارەنووسە بکات و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵات و جەلادەکانی بێتەوە، نەک تەنها لەڕێگەی ئارامگرتنەوە، بەڵکو بە درێژەدان بە ڕێبازی نووسین لە قووڵایی بەندیخانەکان و دەزگا داپڵۆسێنەرە نێودەوڵەتییەکان و لەسەرمێزی توێکاری و لە ژووری بەستن و لە ڕۆژ و شەوە بەردەوام تاریکەکاندا، بە هەڵکۆڵینی شیعرو بیرۆکەکانی لە یادەوەریدا.)) (قدور، ٢٠٠٦: ٥) بۆیە دەبینین پێشمەرگە و شاعیرێکی دلێری

وەک شەهید مەلا عەلی، کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداریدا دەکەوێتە دەست دوژمن و تا لەسێدارەدانی بە یاوەریی شیعر، ژیانی لەنێو زیندانەکانی (کەرکووک و موسڵ )دا بەسەر دەبات.

## سێیەم/ شیعر و مەرگ:

مەرگ یا مردن لەو پرسە فەلسەفییانەیە، کە بە درێژایی مێژوو مرۆڤی سەرقاڵکردووە، بۆیە باسکردن لە مەرگ و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە و گەڕان بەدوای دیوە شاراوەکانیدا، پانتاییەکی زۆری لە دنیای ئەفسانە و ئایینەکان و تەنانەت فەلسەفەشدا داگیرکردووە. (عەبدولکەریم، ٢٠١٤، ٢٠-١٣٠، هەروەها عوسمان، ٢٠١٣، ١٧- ٦٢). ئەم باسە لای شاعیران و نووسەرانیش بووەتە جێ بایەخ و گرنگیپێدان، لەم ڕووەوە (محەمەد بنیس) دەڵێت: ((مرۆڤ لەکاتی بوونییەوە بە هەموو ڕێگا پەیبراوەکانی خامە سەرقاڵی گوزارشتکردنە لە مەرگ، بەڵام لە شیعر باشتری نەدۆزییەوە بۆ دەربڕینی هەست و بیرۆکەکانی، وشەی شیعری بەهۆی ئاوازەکەیەوە بۆ شاعیر دەبێتە دەرچەی ئارامی و لەڕێگەیەوە هەست و خەم و ئازارەکانی بەرانبەر بە مەرگ دەردەبڕێت، بۆیە دەبینین دیارترین شاعیرە هاوچەرخەکان بیرۆکەی نەمرییان لە خەیاڵدانی شیعرییاندا دروستکردووە، لەپێناو تێپەڕاندنی چرکەساتی حەقیقی بۆ چرکەساتی نەمری و تێیدا ڕووبەڕووی مەرگ بوونەتەوە.)) (بنیس، ٢٠٠١: ٢٤٥) ئەمە بۆ دنیای شیعری کوردی بەگشتی و شیعری هاوچەرخیش بەتایبەتی ڕاستە، ((بەستنەوەی مەرگدۆستی بە بەرگریی سیاسییەوە، یان بە ڕۆحی ناسیۆنالیستانەی مانەوەوە، یەکێکە لەو بەهانە سەرەکییانەی هەموو ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەدەبی دوای ڕوانگە پەنایان بۆ بردووە.)) (عەلی، ٢٠١١: ١٦٤)

جا ئەگەر ئەم بۆچوونە بۆ نووسەر یان شاعیری ئاسایی وابێت، ئەوا بۆ شاعیرێکی وەک (شەهید مەلا عەلی)، کە لە هەرەتی لاوێتیدا بەردەستی دوژمنەکەی دەکەوێت و چارەنووسی لەسێدارەدانی بۆ

دیاری دەکات، دەبێ مەرگ چ کاریگەرییەک لەسەر دەروونی دروست بکات و چۆن لەڕێگەیەوە باڵا بە دەقە شیعرییەکانی بکات؟ ئەمە لەپاڵ ئەو زانیارییەی کە شاعیر هەر لە منداڵییەوە تاڵاوی جەور و ستەمی ڕژێمی بەعسی لەڕێگەی دەربەدەربوون و دێ ڕووخان و ڕاوەدوونانەوە چەشتووە و دواتریش کە پێگەیشتووە زۆرتر درکی بە مەترسیی سڕینەوەی نەتەوە و نیشتمانەکەی کردووە، هەربۆیە بە شیعر و شۆڕش ڕووبەڕووی دوژمن بووەتەوە، بە لای شاعیرەوە خۆبەختکردن بەرزترین پلەی بڕوا و پیرۆزترین پایەیە، بەوەش لەلای دەبێتە ئەرکێکی سەرەکی و گرنگ. (عەلی، ٢٠١١: ١٣٩)، شەهید مەلا عەلی لەم گۆشەنیگایەوە وێنەی مەرگی کێشاوە.

**چوارەم/ وێنەی مەرگ لە شیعرەکانی شەهید مەلا عەلی–دا:**

مەرگ گەر بۆ مرۆڤێکی ئاسایی جێی تێرامان و لێکدانەوە بێت، ئەوا بۆ شەهید مەلا عەلییەکی چاوەڕوان لە ژووری سێدارەدا، دەبێتە چەقی هەڵوەستە لەسەرکردن و بیرلێکردنەوەی بەردەوام، بۆیە دەبێت بەلای هەموو خوێنەرێکیشەوە ئاسایی بێت، کە لە شیعرەکانیدا هەمیشە مەرگ وەک تارماییەک خۆی بنوێنێت، تیایدا ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگ و بێباکیی شاعیر لێی وەک دیاردەیەک لە زۆرێک لە دەقەکانیدا دەبینرێت، بەبڕوای ئێمە ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی وایکردووە ((شیعرەکانی مەلا عەلی پێشمەرگەش کەناڵێکی ڕاگەیاندنی گەورە بووە، بۆ پێشمەرگە و دەرسی بەردەوامبوون بوو لەسەر گیانبازی لەڕێگای سەرفرازیی کوردستاندا.)) (ئیسماعیل، ١٩٩٩:١٨١)

بێگومان ئەم گیانی نەبەزینەی شاعیر بەشێکی لەو ڕێچکە سیاسییەوە هاتووە، کە شاعیر لەسەری بووە، وەک ئەوەی یەکێک لە هاوڕێبازەکانی دەڵێت: ((تەنها هاندەر و پشتوپەنا و بەرگری لەخۆکردن دژی ئەو حاڵەتە بە زۆر سەپێنراوە، بیروباوەڕی تێکۆشەران بوو لەناو ئەو زیندانەدا، کە سەرچاوە و ئیلهام بوو لە بەرەنگاری و

خۆبەدەستەوەنەدان و بەگژداچوونەوەی داگیرکەرانی ئەم گەل و نیشتمانەدا.)) (قەرەداغی، ٢٠١٩:٧٧) و بەشێکی تری لەوپەڕی متمانەبوونییەوەیە بەڕەوایی مەسەلە نەتەوایەتییەکەی کە شایستەی هەموو جۆرە قوربانیدانێکە، لەمەشدا لووتکەی ڕاستگۆیی نواندووە، هەروەک بە شیعر و ژیانی نموونەی گیانفیدایی و خۆبەختکردنی نیشانداوە، بەمەبەستی زیاتر تیشک خستنە سەر ئەم لایەنە، بەپێویستی دەزانین ڕاستەوخۆ ڕوو لە شیعرەکانی بکەین، کە خۆشبەختانە زۆرینەیان ڕۆژ و ساڵی نووسینیان لەسەرە، سەرەتاش لەسەر تاکە دەقەکەی سەردەمی پێشمەرگایەتی (١٩٧٨) دەوەستین، کە تیایدا باس لەوە دەکات، وەک هەر مرۆڤێکی ئاسایی بە ئاواتەوەیە ژیانێکی ئاسایی بژیت، بەڵام مەرگ بواری نادات، دەبێتە شەهیدی ڕێی بیروباوەڕەکەی کە ئایندەکەی گەشە:

**وام دەهاتە بیر ساڵێ لە ساڵان**
**گوزەرانی ماڵ چاک کەم وەک ماڵان**
**ئەوەی پەنا بێ بۆ منی دەربەدەر**
**تاکە ماڵەکەی برای بیروباوەڕ**
**پێم وایە دەمرم دوا دیدەنیمە**
**بەجێ دەمێنێ هەرچی کە نیمە**
**ڕۆژێک دێ ئاسۆی ڕۆژهەڵاتی سوور**
**ڕووناکتر دەبێ و نزیک دەبێ دوور**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ١٠٧)

پێشبینیی شاعیر بۆ شەهیدبوونی ڕاست دەرئەچێت و زۆر ناخایەنێت دەگیرێت و دەخرێتە زیندان، ژینگە نوێیەکەی نێو زیندان کانیاوی شیعری شاعیر دەتەقێنێت، باڵا بەناوبانگی شیعری دەکات، لەپاڵیشیدا مەرگ دەبێتە زەنگێکی هەمیشە بیستراوی نێو شیعرەکانی و بەڕوونی لە یەکەم دەقی نێو چواردیواری زیندانی، کە بەناوی (بەخێوتان کردم)ە، دەبیسترێت:

**ئـەڕۆم پێشـوازی لــە مـردن ئەکـەم**
**لــە ئێـوەش داوای لێبـووردن ئەکـەم**
**لـــە دڵڕەنجــانی ئێــوە ئەترســـام**
**دەنا بێ سڵ بووم لە مەرگی بـە سـام**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٧٥)

شاعیر بەوپەڕی ورەوە باس لە هەنگاونانی بەرەوڕووی مەرگ دەکـات، هـاتنی وشـەی (پێشـوازی) لـە بنیـاتی دێڕەکـەدا، ورەبـەرزی و قارەمانێتیی شاعیر دەردەخات، بۆیە لە دێڕی دووەمدا ئەوە دەخاتەڕوو، کە خەمی شەهیدبوونی نییە، بەڵکو خەمی دڵڕەنجانی کەسوکارەکەیەتی، پاشان ئەو پەیامـە دەگەیـەنێت، کـە شـانازی بـە ژیـان و مردنـی خۆیـەوە دەکـــات و بەلایـــەوە ئـــەرکی نەتـــەوەیی و کۆمەڵایـــەتیی خـــۆی جێبـــەجێکردووە، بـــەوەش ئاســـوودە و ســـەرفرازە، کـــە ئەمـــە ئـــەرکی بنەڕەتیی شاعیری بەرگریکارە و بریتییە لە ((بەخشینی هیوا بە گەل و میللەتەکەی، چونکە وەکو فەیلەسوف و مێژوونووسی ئینگلیزی (تویبنی) دەڵێـت: بـەهێزترین هۆکـار بـۆ گەشـبینیی مـەزن، بریتییـە لـە یاسـای ڕووبەڕووبوونەوە و وەڵامدانەوە.)) (الخطیب، ٢٠١٥: ٨)

**ئەوەی بە سەربەرزی لە ژینا کردم**
**هەر بە سەربەرزی ژیــام و مـــردم**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٧٦)

هەمان هەست و بۆچوونی شاعیر، بۆ بێبەهایی و بێباکبوونی لە مـەرگ، لـە دەقـی دووەمیشـدا ئاشـکرایە، ئـەم هەسـتەش کاتێـک سـەر هەڵئـەدا، کـە درک بـەو ڕاسـتییە تاڵـە دەکـات بەشـی هـەموو خێزانێکـی کوردپەروەر کوشتن و بڕین و پشـکی هـەموو تاکێک قوربانیدانـە، بۆیـە ئەمیش وەک هەر تاکێک بە ئاسایی لەو چارەنووسە دەڕوانێت:

**پیر و لاو هەموو لە ڕێـی نیشـتمان**
**بەشـیـان کوشـتنە و لەسـێدارەدان**
**کەوابێ بۆچی ژین لام شیرین بـێ!**

**دڵ پڕ لە کوڵ و چاوپڕ ئەسرین بێ**
**ئێستا ژینی خۆم هێند لا هەرزانە**
**سەد جار قوربانی ئەم کوردستانە**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨:٦٨)

لەگەڵ دەرچوونی فەرمانی لەسێدارەدان بۆ شاعیر، وێنەی مەرگ لەنێو دەقەکانی زیاتر تۆخ دەبێتەوە و لە هەمان کاتدا لەڕووی چەندایەتییەوە شیعری زیاد دەبێت، بۆنموونە لە (٨-٦-١٩٧٩) دوو دەقی لەدایک دەبن، کە وشەی (کوردستان) کرۆکیانە، لە دەقی یەکەمدا، کە شاکارێکە بەناوی (یادێکی کوردستان)ە، ئەندێشە شاعیر دەباتە نێو ژیانی پێشمەرگایەتی و پەڕەی ژیانی ڕۆژانەی پێشووی هەڵئەداتەوە، لەپەنایدا دیمەنی ڕازاوەی سروشتی کوردستان نیشان دەدات، لەپڕێکدا تارمایی مەرگ بۆ شاعیر دەبێتە مایەی حەسرەتێکی نەبڕاوە و خۆزگەی ئەوەی پێدەخوازێت لە شاخدا شەهید بایە، نەک خۆی لەزینداندا بێت و چەکەکەی لای دوژمنەکەی، بۆیە ڕوو لە هاوڕێ پێشمەرگەکانی دەکات و دەڵێت:

**خۆزگە ئەمردم، ئەوسا لەو کێوە**
**چەکەکەم ئەیبرد یەکێک لە ئێوە**
**وا ئێستا چەک و فیشەکدانەکەم**
**نازانم لە کوێ، بە شانی کێوە**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨:٤١)

شاعیر دڵگرانە لە دۆخی خۆی و ئەو جۆرە مەرگەی چاوەڕێی دەکات، بەلایەوە ئاستەکەی لە شەهیدی سەنگەر کەمترە، جا ئەگەر لە وێنەی پێشوودا ئەو بیرەی لە چارەنووسی چەکەکەیدا خستبێتە ڕوو، ئەوا لەم وێنەیەدا لەو خەمەوە بەرجەستە دەبێت، کە شاعیر بۆ ماندووبوونی کەسوکارەکەی دەیخوات، بەوەی ڕێگەیەکی دوور دەبڕن تاوەکو چاویان پێی بکەوێت، شاعیر ویژدانی ئازاری دەدات، بەوەی بووەتە مایەی چەرمەسەری بۆ خێزانەکەی:

**لـەویٚ ئـەمردم، ئـەنێژرام و بـەس**
**ئیتـر نـەدەهات بـۆ دیـدەنیم کـەس**
**باوک و دایکی (خۆشی نەچەشتوو)**
**وا نەدەبوونـە خـەڵووز و قەقنـەس**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٤٤)

شاعیر ئەوەندەی لە خەمی ئازاری هاوڕێ و کەسوکارەکەیەتی، نیو هێندە خەمی شەهیدبوونی خۆی نییە، هەر بۆیە لە کۆتایی دەقەکەدا زۆر ڕاشـکاوانە و سـەربەرزانە، باسـی ئـەوە دەکـات بـەڵێنی خـۆی بردووەتە سەر و ئاسوودەیە بە چارەنووسەکەی:

**ئـەمڕۆ لێـرەم و سبەی لـە گـۆڕێ**
**چـش بـا ناویشـم نەیەتـە گـۆڕێ**
**من بەڵێنی خۆم هـەر ئەبەمـە سـەر**
**ڕێبـازم لـەناو گـۆڕیش نـەگۆڕێ**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٤٥)

لە دەقی دووەمدا، کە بە (کوردستانەکەم) دەست پێدەکات، دوای وەسفێکی جوانی کوردستان حەسرەتی کەم ژیانی دەبێتە تەوەری باس نەک بەهۆی خوشویستنییەوە بۆ ژیان، بەڵکو لەبەرئەوەی بە ئاواتی بینینی ڕۆژی ئازادیی گەل و ڕزگاریی نیشتمانەکەی نەگەیشت، بەڵام شاعیر هەر گەشبینە بە سەرکەوتنی نەتەوە و نەمانی دوژمنەکەی، بۆیە ڕوو لە کوردستان دەکات و دەڵێت:

**ئەی کوردستانی بـێ داڵـدە و پـەنا**
**نـەمامی ژینـی منـیش هەڵکـەنا**
**چاو بە فرمێسکی ژێردەستەیی تـۆم**
**هێندە دەربەستی خـۆم نایـەم دەنـا**
**ئـەی کوردسـتانی مەڵبەنـدی کـاوە**
**جێـی داخـە نەمـدی ئـاڵای شـەکاوە**
**بەڵام ڕۆژێک دێ هێزی نەوەی نوێ**
**کۆشـکی زۆرداری پـێ هەڵتـەکاوە**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٩٧)

شاعیر دوو ڕۆژ دوای ئەم دەقە واتا لە (١٠-٦-١٩٧٩) دوو دەقی شیعری دەنووسێت، لە یەکەمیاندا هەر لە سەرەتاوە تارمایی مەرگ دەردەکەوێت، ئەمجارەیان بەوپەڕی دڵنیاییەوە باس لە مەرگی خۆی دەکات، بۆیە بە شێوازی ڕابردوو کاری نێو دێڕە شیعرییەکان دادەڕێژێت:

**ئەوین و وەفا و دڵسۆزی و پەیمان**
**لەگەڵ خۆم ئەوا هەمووم لە گۆڕنان**
**چاوەڕوانییشم زۆر بەڕێکردن**
**هەزاران خۆزگەم لەگەڵ خۆم مردن**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨:٦٩)

شاعیر بێ ئومێدە لە ژیان و باوەڕی وایە، کە ڕزگاربوون لە دەست ئەو ڕژێمە مەحاڵە، ئەمەش بەڕوونی لە سەرەتای دەقی دووەمدا دەبینرێت:

**ئێستا ئومێدم هێندە لاوازە**
**ناتوانم بڵێم: دەمێنم تازە**
**مردووم و نانی زیندووان ئەخۆم**
**تازە ناتبینم ئازیزەکەی خۆم**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨:٧١)

ئەوەی لەم دەقەدا سەرنج ڕادەکێشێت، ناوەڕۆکی دەقەکەیە، کە خۆشەویستییە و ئەمە بە ئەزموونێکی نوێ بۆ شاعیر دادەنرێت، تیایدا شاعیر بە هەستێکی ڕۆمانسییانەوە خەوبینینی خۆی بۆ یارەکەی دەگێڕێتەوە:

**دوێشەو لە خەوما دووربێ لە بالات**
**لێت نزیک ئەبووم تا ماچ کەم گۆنات**

... ... ... ... ... ...

**مەگەر هەر بەخەو تۆم ماچ کردبێ**
**دەستم بۆ سینە و مەمکت بردبێ**

**بەتاسەوە بووم بتگرمە باوەش**
**نەمدی وا ئەمرم، پاشی من تۆ خۆش**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨:٧١- ٧٢)

کورتیی ژیان شاعیری لە زۆر خۆشی بێبەش کرد و زۆر خەونی ڕەنگاڵەی زیندەبەچاڵ کرد، هەڵبژاردنی خۆشەویست و پاشان پێکەوەنانی خێزانێکی بەختەوەر، یەکێکە لەو ئاواتانەی مەرگ بواری نەدا شاعیر پێی بگات، لەم شیعرەدا شاعیر خۆی وەک مردوو نیشاندەدات، لەگەڵ ئەوەشدا خەمی مەرگی یاریەتی، خەمخواردنی شاعیر بۆ ئەوانی تر جا چ هاوڕێ و کەسوکارەکەی بێت و چ یارەکەی بێت، وەکو دیاردەیەک دەبێتە ڕایەڵە و بیری دەقەکان پێکەوە گرێ دەدات.

لە دەقی (برا دوور و خزم دوور)، کە بۆ خۆی چامەیەکە و کرۆکەکەی داستانی مەرگە، مەرگێک پڕ لە سەربەرزی و ئاسوودەیی و بە سەد ژینی ناگۆڕێتەوە، چونکە پێی شاعیر ئەخاتەسەر سەری دوژمن، شاعیر هەمیشە بە تاسەی پایەبەرزترین مەرگەوەیە، جا ئەگەر لە دەقی پێشووتردا بەراوردی پایەی مەرگی نێو سەنگەر و مەرگی سێدارە نیگەرانی کردبێت، ئەوا لێرەدا بەراوردی مەرگی سێدارە و مەرگی ناو جێ دڵخۆشی دەکات:

**گەرچی بەرەو دوامالی ژین بەڕێوەم**
**یەکەم مالی نەمردنم دیارە لێوەم**
**بەشم چونکە مردنی ناو جێ نییە**
**شادم کە تا دوا هەناسەش بە پێوەم**
**مەرگی ئاوا ناگۆڕمەوە بە سەد ژین**
**ژینێک سەرم بۆ دوژمن بێ بە پەرژین**
**سەربەرزییە کە پێلاوم ئەبینن**
**بەسەر سەری دوژمنەوە لەبەرزین**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٦٢- ٦٣)

شاعیر بەوپەڕی باوەڕەوە لە مەرگ ئەدوێت و وێنەی دەکێشێت، خوێنەر کە لەم دێڕانە ورد دەبێتەوە گیانێکی مەرگبەزێن و ورەیەکی پۆڵایین دەبینێت:

**ئەو مەرگەی لێم ترساوە، ئەیلاوێنم**
**بۆ ناوێری بێت و بگری داوێنم؟**
**با بمناسێ کە پێشمەرگەی کۆمەڵە و**
**کادرێکی دەست و داوێن خاوێنم**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٦٥)

بیری نێو ئەم دەقەی شاعیر، ئەو تێڕوانینەمان بیردەخاتەوە، کە دەڵێت: ((مەرگ چەمکێکی شاعیرانە وەردەگرێت و دەبێتە ئەو کردارە بەرزەی، کە زیندووەکان هەرچییەک بکەن ناگەنە ئاستی، واتە (مەرگ) دەبێتە بەهایەکی بالاتر لە بەهای هەر داهێنانێک.)) (عەلی، ٢٠١١، ١٦٧) شاعیر نیوەی دەقە شیعرییەکانی لە مانگی (٦) ی ساڵی (١٩٧٩)دا نووسیوە، دوا دەقی ئەم مانگەی لە (٢٣-٦-١٩٧٩)دا نووسیوە، وەک دەزانرێت ئەو وەختەش سەرەتای وەرزی هاوینە، ئەو دەقەش بە کەشێکی خەیاڵی ئاودراو بە حەسرەت بۆ کەم ژیانی و تێرنەبوون لە سروشتی رەنگاوڕەنگی کوردستان دەست پێدەکات، کەچی لەپڕا دۆخ و ژینگە و واقیعی شاعیر لەژووری سێدارەدا، بەرگێکی پایزانە ئەکاتە بەر دەقەکە و وەرینی گەڵای دارەکان و ڕۆژانەی عومری شاعیر پێکەوە گرێ ئەدات:

**ئاخ پایز وا دێ وەرزی مردنە**
**وەرزی جودایی و پەنابردنە**
**مەرگی سەوزەگیا، هی گوڵ و گوڵزار**
**کاتی زەردبوونی گەڵاو گوڵ و دار**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٨٢)

هەمان زاڵبوونی وێنەی پایز لە دەقی (بۆ ئازیزەکەم )، کە لـە (١٢-٧-١٩٧٩)دا، کــە بــە گیــانێکی ڕۆمانســـی و بــە هەســـت و ســـۆزێکی ڕاستەقینەوە نووسیویەتی، دەبینرێت. باری نائارامیی دەروونی شاعیر و بێ ئۆقرەیی بۆ (ئازیز) بازێک بە بیری شاعیر ئەدەن و ڕاستەوخۆ دوای وەرزی بەهار دیمەنی خەزانی پایزی بیر دەخەنەوە، ئەم ڕاستییە لــە دەربڕینــی (بــێ وادە هــات پــایز) دانــی پێـدانراوە، هــەموو ئەمانــە لەکاتێکدایە دەقەکە خۆی لەدایکبووی هاوینە!

**کە ڕێیان داوی بۆ یەک جار**
**توخوا ئازیز**
**دیدەنیم کە**
**چەند ڕۆژێکم وەرزی بەهار ماوە**
**(بێ وادە) هات پایز**
**خەزەڵوەرە توخوا وەرە**
**دیدەنیم کە**
**با وا تێ نەگەن کە دەردی**
**سوورە گوڵی گەشی دوێنێی**
**سەر دوا چڵی**
**ئەمڕۆ لەبەر زریان زەردی**
**بەرەو مەرگ چوونە ئەمکا زیز**
**تۆ خەنیم کە**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨:٥٦)

شاعیر زۆر پەرۆشـی ئەوەیـە، کە دوژمنـان بـە بینینی ڕوخسـاری دڵخۆش نەبن، بەڵکو خوازیارە گەشیی ڕووی ببێتە مایـەی نیگـەرانییان، بـۆ ئەمــەش دیـداری یـاری پێویسـتە. شــەهید مــەلا عــەلی بەوپــەڕی ورەبــەرزی و مەرگبەزێنییــەوە، دوا ڕۆژەکـانی ژیـانی بــەڕێ کــردووە، شاعیر هێندە خەمی دەرخستنی خۆڕاگریی ئەو ڕۆژانـەی خۆیـەتی، نیـو ئەوەندە خـەمی شـەهیدبوونی نییـە، بۆیـە هەمیشـە ئـەوە بـەبیر خوێنـەر

دەهێنێتەوە، کە هەرگیز سەر دانانەوێنێت و تاجی سەربەرزی بەوپەڕی بڕوا بەخۆبوونەوە لە سەر دەنێت:

**چەند ڕۆژێکی تر بەرەو سێدارە**
**ئەبرێم و ئەمرم گیانیش بێدارە**
**بۆیە کە دوژمن لێم ببێ بە دێو**
**پاڕانەوەم لێی نایەتە سەر لێو**
**زامی ئەشکەنجە و بەند و کۆت و پەت**
**سەرم بۆ دوژمن نەوی ناکا قەت**
**مەردانە پێکی مردن ئەکەم نۆش**
**چش لە من سەری هاوڕێیانم خۆش**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٥٣)

ئەوەی تێبینی دەکرێت، لە کۆی ئەو (١٥) دەقە شیعرییەی شاعیر، کە لەدایکبووی زیندانن، (١٣) دەقیان لەدوای دەرچوونی فەرمانی لەسێدارەدانییەوە نووسراون، لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە دیاریکردنی چارەنووسی شاعیر لە زینداندا، بووەتە مایەی تەقینەوەی سەرچاوە شیعرییەکەی و لەهەمان کاتیشدا گیانی بەرگری و ڕووبەڕووبوونەوەی تێدا زیاتر کردووە.

بەگشتی دەتوانین بڵێین، مەرگ لای شەهید مەلا عەلی مەسەلەی مەرگی جەستە نییە، ئەوەندەی مەرگ و خواست و هیواکان و تێپەڕاندنی مەرگە بۆ ژیان، ئەمەش بەزینی شاعیر ناگەیەنێت، بەڵکو کۆشش و هەوڵدانە بۆ بەرگری و تێگەیشتن لە ڕووداوەکان بە قووڵی، بە ئامانجی پشتکردنە مەرگ و هەنگاونان بۆ جیهانێکی نوێ، ئەمەش وایکردووە شاعیر لە بیری نەوەکانی کورددا ببێتە سیمبولی نەمری.

**پێنجەم/ تێپەڕاندنی کەشی زیندان:**

کەسێک نییە زیندان بە هەوارێکی ئارام و ئاسوودە بزانێت، بۆیە زیندانی هەمیشە لە درزێک دەگەڕێت لێیەوە بڕوانێتە دەرەوە، هیوا بە باڵێک دەخوازێت لە ئازادییدا شەقەی پێ بدات، کە تێدەگات ئەم خواستەی نایەتەدی هەرجارە و بەرۆکی ئامرازێک دەگرێت، تاوێک یادی ئازیزانی دەکات و دەمێک ئەو سروشتە بەسەر دەکاتەوە، کە لێی دابڕاوە و جارجارەش خۆی بە بەرۆکی هیوا و خۆزگەکانی هەڵدەواسێت، هەموو ئومێدێکیشی دەرچوونە لە کەشی زیندان و دەسکەوتنی مشتێک حەسانەوە و ئارامی، خەیاڵ لای شاعیر ئامرازێکی سەرەکی بەدیهێنەری ئەم ئامانجەیە، لەم ڕووەوە لەو بابەتانە دەدوێین، کە شەهید مەلا عەلی شاعیر بۆ تێپەڕینی لە کەشی زیندان پەنای بۆ بردوون:

**أ. یادکردنەوەی کەسوکار و ئازیزان:**

مرۆڤ بۆ خۆی بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیی کاریگەرە، هەمیشە حەز بە دروستکردنی پەیوەندیی لەگەڵ دەوروبەریدا دەکات و هەوڵئەدات لەگەڵیاندا خۆی بسازێنێت، هەربۆیە کاتێک لە چوارچێوەی ژوورێکی زینداندا قەتیس دەکرێت و لە ئازادیی بێبەش دەکرێت، گەورەترین گورز بەری دەکەوێت، دابڕانێتی لە کۆمەڵ بەگشتی و کەسوکار و ئازیزانی بەتایبەتی، ئەمە ئەگەر بۆ زیندانییەکی ئاسایی وابێت، ئەوا بێگومان بۆ شاعیرێکی هەست ناسک و کۆمەڵایەتیی نێو زیندانێکی تاک و لە چاوەڕوانیی سێدارەداندا کاریگەرییە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکەی زۆر زیاتر دەبێت، هەربۆیە شیعرەکانی شەهید مەلا عەلی بوونەتە پردێک و لە ڕێی یادکردنەوەوە بە خێزان و ئازیزەکانییەوە بەستوویەتی، هەندێ جاریش ژیان و یادەوەرییەکانی لەگەڵ ئەواندا بووەتە هەوێنی دەقەکانی و لەوێوە کەشێکی کۆمەڵایەتی بۆ بۆشاییە ڕوحییەکەی دروستکردووە و وەفاداریی خۆی بۆ دووپات

کردوونەتـەوە، پەرۆشـی هـەواڵ و زانیارییـە لەبارەیانـەوە و بەتاسـەوە ئومێدی دیداریان دەکات، لە دەقی (بەخێوتان کردم)، کە یەکەم دەقی نێو زیندانیـــەتی، هەســـت و پەرۆشـــییەکەی دەگاتـــە لووتکـــە و هـــەموو کەسوکارەکەی بەسەر دەکاتەوە و دەڵێت:

**بـــەخێوتان کـــردم هـــۆ بابـــە و دایـــە**
**ویــــژدانم لــــە ژێــــر قەرزتاندایــــە**
**وامـــداری ئێـــوەم بۆیـــە لـــە تـــاوان**
**پێموایـــە ئێســـکم ئـــەکرۆژێ تـــاوان**
**تـــاوانی ئـــەوەی لـــەپێناوی مـــن**
**ڕێتان کەوتۆتە بـەر ماڵـــی دوژمـــن**

**....................**

**دۆسـت و دراوسـێ، بـرادەر و هـاوڕێ**
**ئەوەی جارێک دیم لـە دوو هـەنگاو ڕێ**
**پـوورزا خـاڵۆژن، ئـامۆزام و پـوور**
**خـزم کەسـوکار لـە نزیـک و دوور**
**ئـەڕۆم پێشـوازیی لـە مـردن ئەکـەم**
**لـە ئێـوەش داوای لێبـووردن ئەکـەم**
**لـە دڵڕەنجـانی ئێـوە ئەترسـام**
**دەنا بێ سڵ بـووم لـە مـەرگی بـە سام**

(شەهید مەلا عەلی، ۲۰۱۸: ۷٤ -۷٥)

بە سەرنجدان لەو چەند دێڕەی سـەرەوە، هەسـتێکی جوانی پڕ لـە وەفـا و دڵسـۆزیی بۆ بنەماڵـە و هـاوڕێ و نزیکـەکانی دەبینین، سـەرەتا ڕوو لـە بـاوک و دایکی دەکات و پاشـان ڕوو لـە خزمـان و دراوسـێ و هاوڕێکـانی دەکات و یادیـان دەکـات، شـاعیر پێشـبینیی شـەهیدبوون و دەربازنەبوون لە دەست ڕژێمی بـەعس دەکات، لێرەشدا هێندە خـەمی کەسوکارەکەیەتی، نیو هێندە خـەمی شـەهیدبوونی خـۆی نییـە، لـە دەقی بۆ (برای زیندانیم)، کە بۆ براکەی نووسیویەتی، ئەوپەڕی خۆشەویستی

و پەرۆشیی شاعیر بۆ براکەی دەبینرێت، تیایدا وا دەرئەکەوێت، کە لە پێش شاعیرەوە زیندانی کراوە:

**بــــــرای زینــــــدانی دووره دیــــــدارم**
**ئـــاخ بـــۆ بینینـــت دڵ پـــڕ جـــەغارم**
**تـــۆ لـــە زینـدانا بـێ ئاگـــای لـــە مـــن**
**تۆی لە من دوور کرد خۆێنخـۆری دوژمـن**
**خۆزگـــە پـــاش مـــردن بمدیبایـــەوە**
**تۆڵـــەی ئـــەم دوورییـــەم بکردایـــەوە**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٣٢)

ئەوەی جێگەی سەرنجە، شاعیر لەم دەقەشدا خەمی ژیانی خۆی نییە، بەڵکو خەمی ژیانی بەرانبەرەکەیەتی، ئەم خۆنەویستییەی شاعیر و بێ ئۆقرەییـەی بـۆ کەسـوکارەکەی نیشـانەی ئەوپـەڕی دڵسـۆزی و ئەمەکدارییـەتی، بەتایبـەتی ئەگـەر هـاتو زانیمـان، ئـەم دەقـە مێـژووی (تـــەمموزی ١٩٧٩)ی لەســـەرە، واتـــا دوای دەرچـــوونی فـــەرمانی لەسێدارەدانەکەی نووسیویەتی:

**نازانم دوای مـن چـی بەسـەر تـۆ دێ؟**
**دێتــە بەرچـــاوت یادگـــاری لادێ**
**... ... ... ...**
**شیرین، شنۆ گیان، ڕۆحەکەم ئاسۆ**
**سڵاو بۆ خزمان، بۆ هەمووان بۆ تـۆ**
**مــن بــە قوربــانی بــاب و بــاپیرت**
**پێشمەرگە بـە تـۆ حـەڵاڵ بێ شیرت**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٣٣)

حەسرەتی شاعیر بۆ دیداری ئەو برایەی کە هاوشێوەی خۆی گیرۆدەی زیندانە ڕەشەکانی ڕژێم بووە و بە تاوانی کوردبوون گیراوە، بووەتـە هـەوێنی دەقێکـی تـریش (( ئـەکاونتی فەیسـبووکی شـەهید مـەلا عـەلی، تیایدا شـیعرێکی بڵاونـەکراوەی شـاعیر، کە بـەرواری (تـەمموزی

١٩٧٩ی لەسەرە)، لە ٢٢ی نۆڤەمبەری ٢٠١٧ بڵاوکراوەتەوە)) شاعیر وەک هەر گەنجێکی تر، ئەزموونی خۆشەویستی هەبووە، بەڵام خۆشەویستییەکی ناکام، خۆشەویستییەک کە دەبێتە قوربانیی گیانە شۆڕشگێڕییەکەی و مەرگ ناهێڵێت پێی بگات. هیچ لەوە ئەستەمتر نییە، مرۆڤ لە هەڕەتی لاوێتیدا چارەنووسی لەسێدارەدانی بۆ دیاری بکەن و بوخچەی خەون و هیواکانی پێ بپێچنەوە و لە ماوەیەکی کورتدا لە ئازیزترین کەسەکانی دایبڕن، جا ئەگەر لە دەقەکانی پێشوودا بیئۆقرەیی شاعیر بۆ کەسوکار و خانەوادەکەی وێنەیەکی زاڵ بێت، ئەوا لە هەندێ دەقی تردا بازنەکە فراوانتر دەبێت و خەمی دابڕان لە یار و ئەوەی خۆشیدەویست، دەبێت بە برینێکی سارێژنەبوو:

**دەزگیرانی پەری خەونی شەوان ڕازاوەی**

**سەر قۆڵم**

**دڵ ژان ئەکا**

**چوون ئارەزووی جارێکی تری ژووان ئەکا**

**چاو ئەبینێ، گوێ ئەبیستێ و لووت بۆن ئەکا**

**هەست و هۆشم**

**دیسان داوای گێڕانەوەی شریتی عومری کۆن ئەکا**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨:١٠٠)

شاعیر لەپاڵ هەستی پڕ لە سۆزو خۆشەویستیدا، دان بەو ڕاستییەدا دەنێت، کە دەیەوێت لە واقیعی تاڵی زیندان ڕابکات و بە یادکردنەوەی یارەکەی، کەشێکی ڕەنگین و ئاسوودە بۆ خۆی فەراهەم بکات:

**ئەوەی لە ناخما ئەبزوێ**

**نانووسرێ بە دەستی کۆڵم**

**ئەمەوێ بە وشەی ڕەنگین**

**وشەی ورشەداری سەنگین**

**ڕازاوە و پڕ واتای بەتین**

**یەک دوو دێڕ شیعرت بۆ دانێم**
**خەم و ترسی**
**ژووری سێدارە وەلا نێم**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ١٠١)

وردبوونەوە لە دەقەکە لەلایەکەوە ئەو ڕاستییەمان پێدەڵێت، کە شاعیر سەرباری خەم و ئازاری خۆی، ئاوڕی لە ژیانی پڕ ستەم و ژێردەستەیی کچی کوردیش داوەتەوە و لە لایەکی تریشەوە بە دەروونێکی پڕ لە دڵەڕاوکێوە، لە ئایندەی خۆشەویستەکەی دەڕوانێت و خەمی ژیانیەتی، بۆیە بە بەڵێندانی ناڕاستەوخۆی خۆی بۆ ئەو، دەیەوێت لەبەرانبەردا لە وابەستەبوونی بۆ یاریش دڵنیا بێت:

**من ماڵئاوا**
**لەتۆ و لە خەم**
**بەڵام بڕوات هەبێ بڕوا**
**ئەوینت بەرنادەم تا هەم**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ١٠٤)

بە ئاکام نەگەیشتنی شاعیر لە بواری خۆشەویستیدا، یەکێکە لە گرێ دەروونییەکان، کە کاری تەواوی کردووەتە سەر بیر و دەروونی شاعیر و هاوشان لەگەڵ ژیانی پڕ ئەشکەنجە و کوێرەوەریی زینداندا، دەقەکانی ڕەنگڕێژ کردووە، بەواتایەکی تر بەرهەمی ڕێگەی خۆشەویستی بۆ شاعیر وەک ڕێگەی خەبات و کوردایەتی مایەی خەم و ئازار بووە. بەشێوەیەکی گشتی پێکەوەگرێدانی هەردوو مەسەلەکە لای شاعیر بە جۆرێکە، کە یادکردنەوەی یار دەبێتە هۆی ڕەواندنەوەی خەم و ئەشکەنجەکانی زیندان، کەچی لە هەندێ باردا ناتوانێت بەتەواوی لەسەر ئەو ڕێچکەیە بەردەوام بێت، ناچار دێتەوە نێو ئازارەکانی خۆی و بەو ئاهـ و حەسرەتەوە کۆتایی بە دەقەکە دەهێنێت و دەڵێت:

**ئێستاش وا دەستم لـە ژیـان بـەرداوە**
**هۆشـم بـە وێنـەی کـەزێت بـڵاوە**
**گیانـە یـەکجاریی بـەجێت دەهـێڵم**
**تـا هـەتا بـە دوای ڕازتـا وێڵـم**
**دەمرم چاوەکەم خەم مەخۆ تۆ خۆش**
**خەمی لە من زیاد جێمـاوە بـۆ تـۆش**
(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ١١١ – ١١٢)

حەسرەتی شاعیر بۆ زوو نـەمردن، لەلایەکەوە وەک هەرکەسێکی تر بۆ بەدیهاتنی هیوا و ئاواتەکانی، ئـەوا لەلایـەکی ترەوە پێویستییە بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکە نەتـەوەیی و نیشتمانییەکەی، کە دڵنیا دەبێ ژیـان بـواری نـادات، سەرزەنشـتی خـۆی دەکـات و خـۆی بـە کەمتەرخـەم دەزانێـت و خـەمی ئـەوەی دەبێـت، کـە دوای خـۆی براکـانی نـاتوانن شـانازی بـە ژیانییـەوە بکـەن، ئەمـەش لووتکـەی دڵسـۆزی و کوردپەروەرییە:

**نـە ژیـام هێنـد بکـەم پێشـمەرگایەتی**
**بـرا شـەرم نـەکا بڵـێن: برایـەتی**
**نەژیام ئەو کەسەی وەک منە و دیلـە**
**ئـازاد بـێ و بڵـێ: بـرام لـە قەندیلـە**
(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٤٨)

**ب . سروشت:**

ئەو پانتاییيە پاک و جوان و بێگەردەیـە، کە بەشێک لـە ژینگـەی مرۆڤەکان پێکدەهێنێت و کار دەکاتە سەریان و گەلێک جار لە هەست و نەستیاندا جێپەنجەی خۆی جێدەهێڵێت. ئەم حاڵەتە لە دنیای شاعیران و داهێنەراندا دەبێتـە هـۆی ڕەنگدانـەوەی سروشت لـەنێو بەرهەمەکانیاندا، هـەر بۆیـە بـەدرێژایی مێـژوو هەمیشـە سروشـت بەشـێک بـووە لـە نـاوەڕۆکی بەرهەمـەکانیان و بنەمایـەکی گـەورەی داهێنـان بـووە،

((کاتێک شاعیر پەنا دەباتەبەر سروشت و ئەوەی تێیدایە، ئەیەوێت ئەو هەستە بەرجەستە بکات، کە سروشتەکە پێیبەخشیوە.)) (اسماعیل، ٢٠١٧، ٤٨) نەک هەر ئەوە، بەڵکو لە هەندێ ڕێبازی ئەدەبیدا سروشت کرۆکی ڕێبازەکەی پێکهێناوە، بێگومان بۆ شاعیرێک، کە زیندان لە جوانییەکانی سروشت بێبەشی کردبێت، ڕادەی هۆگربوون بە سروشت زۆر زیاترە و پەرۆشیی بۆ ئاوڕدانەوە لە سروشت دەبێتە خولیا و پێویستییەکی دەروونی، ئەمەش بەو ئاواتەی ساتێک لە ژینگەی وشک و برینگی زیندان، کە بۆنی خوێنی لێدێت و ستەمی لێدەچۆڕێت دوور بکەوێتەوە و ژینگەیەکی دڵگیر بۆ خۆی فەراهەم بکات. بۆ شاعیرێکی وەک شەهید مەلا عەلی، کە بۆ خۆی پەروەردەی سروشتی دڵڕفێنی کوێستانی کوردستانە، ژیان و ژینگەی گەرمەسێری نێو زیندانەکانی کەرکوک و موسڵ، مایەی بەراوردکردنێکی حەسرەتکێشە، ئەم ڕاستییە لەسەر زاری شاعیرەوە ڕەنگیداوەتەوە:

**هاتەوە یادم شەوێکی قەندیل**
**هێنایە گریان دڵەی مات و دیل**
**ئەو دەستەی لەوێ بەفراو ئەیتەزاند**
**داخ کراوە لێرە بە ئاگر و ژیل**

... ... ... ...

**خۆزگە منیش هەر لەوێ مابایەم**
**چەکەکەم بەس بوو لەجێی سەرمایەم**
**ڕانابرێ تەمەن لەم گەرمەسێرە**
**چونکە پەروەردەی ئەو جێ سەرمایەم**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٣٦ - ٣٧)

شاعیر لە دەقێکدا خەیاڵ دەکاتە ئامراز و دەگەڕێتەوە نێو سروشتی ڕابردووی خۆی و کەژو کێو و گوند و دوندەکان بەسەر دەکاتەوە و دیمەنی دڵڕفێنی سروشتی کوردستان لە هەر چوار وەرزی ساڵدا بۆ دەنەخشێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەستەمۆیی خۆی دەردەخات

بەوەی دیلە و ناتوانێت جوانیی دیمەنەکان وەک پێویست وەسف بکات، بەوەش هەوڵی تێپەڕاندنی دیواری زیندانی شکست دەهێنێت:

**جـــا وەرە ســـەیری پـــۆلی ڕەشـــماڵان**
**هاتوونەتـــــەوە جێگاکـــــەی ســـــاڵان**
**هاتوونەتـــــەوە چیـــــای قەنـــــدیلی**
**نـــاتوانم وەســـفی بکـــەم بـــە دیلـــی**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٨٤)

لـەو سـاڵانەدا ڕژێمـی بـەعس دەسـتی کردبـوو بـە ڕووخانـدنی دێهاتەکانی کوردستان و سیاسەتی ڕاگواستنی پەیڕەو دەکرد، هەربۆیـە شاعیر لە کۆتایی دەقەکەدا بەگژ ئەو سیاسەتەدا دەچێتەوە و گەشبینیی خۆی بە نەمانی داگیرکەری تێکدەری سروشتی کوردستان دەردەخات:

**ئـــاخ بـــۆ وڵاتمـــان لێدەشـــێوێنن**
**دێهـــات و باخمـــان بـــۆ دەســـووتێنن**
**وەدەرمـــان دەنـــێن لـــە خـــاکی خۆمـــان**
**ئێمـــەش وەســـیەتە و جێمـــاوە بۆمـــان**
**کە سەرشۆڕ نەکەین لە ئاست داگیرکەر**
**ڕۆژێـــک دێ بەشـــەق دەیانکەینـــەدەر**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٨٦)

ئەم دەقە پێمان دەڵێت، لای شاعیری بە هەڵوێست، گەر خـەیاڵ بـۆ لـەبیرکردنی خـەم و ئازارەکـانی بیباتـە نێـو سروشـت، ئـەوا لـەوێیش ناتوانێت سـتەمی داگیرکـەر لـەبیر بکـات و خەمەکـەی نەکاتـە خـەمێکی گشتی، بەتایبەتی ئەگەر هاتو زانیمان ئەو دوژمنە پێش هـەموو شتێک وێرانکەری سروشتی ڕازاوەی کوردستان بووە، لێرەدا ((هونـەر بریتیی نییـە لـە گواسـتنەوەی سروشـت بەشـێوازە جیاوازەکانییـەوە، بـەڵکو لێکدانەوە و دروستکردنەوەیەتی.)) (هازلت، ؟ : ٣٣) ئەمە و لە دەقێکی تریدا بەناونیشانی (یادێکی کوردستان)، جارێکی تر خـەیاڵ، شـاعیر پەلکێشـی

نێو سروشتی کوردستان دەکات و بەتاسەوە یادی دیمەنە دڵڕفێنەکانی ئەو سروشتە دەکاتەوە:

**ئەو شار و گوند و ئەو شاخ و هەردە**
**لە باسەڕەوە هەتا گڵەزەردە**
**هێمنی باڵی بەسەر کێشابوو**
**خوڕەی کانیاویش لەو بەرەو خوارە**
**لێم بوونە خرمەی کرمەک و گوارە**
**لە دەستی دۆدا هێندە خەیاڵم**
**هەڵپەڕێ، ئێستاش هەناسەم سوارە**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٤٢)

لەم دەقەدا گەڕانی شاعیر بەنێو سروشتی کوردستاندا، درێژە ناکێشێت و دواجار خۆی لەنێو واقعی زیندان و چاوەڕوانیی مەرگدا دەبینێتەوە:

**ئێستا کەوتوومە ئەم شوێنە تەنگە**
**ڕاخەرم خار و سەرینم سەنگە**
**پەی بە ڕۆژگاری ئایندە نابەم**
**ئەپرسم، ئەژیم؟ کەس ناڵێ ڕەنگە**

... ... ... ...

**من ئەڕۆم و تا ئێوەش بمێنن**
**هەزاری وەک من دەستەودامێنن**
**ببنە سەربازی سەر لە پێناوتان**
**بێ ئەوەی بۆ گیانبەخشین دامێنن**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٤٥-٤٦)

وردبوونەوە لە شیعرەکانی شاعیر ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات، کە زیندان بۆ شاعیر بارێکی دەروونیی هێند نائارامی خوڵقاندووە، یادکردنەوەی جوانترین دیمەن و یادەوەرییەکانی لەلایەک و ئازیزترین کەس و هاوڕێکانی لەلایەکی ترەوە ، نەیانتوانیوە تارماییی مەرگی بیر ببەنەوە.

**جـ خۆزگە و هیوا:**

دوو پاڵنـەری دەروونیـی گـەورەن، کـە هـانی مـرۆڤ دەدەن لـە چوارچێـوەی ویسـتگەیەکی ژیانـدا دەستەوەسـتان نـەبێت و هـەوڵی تێپەڕاندانی واقیعی چەقبەستوو بدات، ئـەم حاڵەتـە لای شـاعیران، کـە هەست و درککردنیان وردتر و کاریگەرترە، بە تەواوی لە ئەزموونی شیعرییاندا ڕەنگدەداتەوە، بێگومان ئەمە بۆ شاعیرێکی لاو، کە بەردەوام سـەرقاڵی ژمـاردنی ڕۆژانـی تەمەنیـەتی و مـەرگ وەکـو سـێبەر بـە دوایەوەیەتی و لەپێناو بەختەوەریی گەلەکەیدا لە هەموو خۆشییەکان بێبەش بێت، ئەوا خۆزگە و هیواکان زۆر زیاترن، زیندانیش وا ئەکات شـاعیر زوو زوو بـاڵی خۆزگـە و هیـوای لەیـەک بـدات و هـەر جـارەو حەزێکی بەدینەهاتوو و خەونێکی ڕەنگاڵەی بەسەر بکاتەوە، بە ئومێدی ئەوەی لەوێوە گەر بە کەمیش بێت ئاسوودەیییەک بۆ خـۆی دەستەبەر بکات، یەکێک لە حەسرەتەکانی شەهید مەلا عەلی، کە وەکو دیاردەیەک خـۆی دەنـوێنێ خـەمی کـەم ژیانـە، مـرۆڤیش گـەر کـەم ژیـا، خۆزگـە و هیواکانی زیاتر دەبن، خەمی گەورەی شاعیر خۆ بە کەمتەرخەمزانـە لـە بەرانبەر خزمەتکردنی گەل و نیشتمانەکەی، بۆیە گەر لەشوێنێکدا باسی لـە خۆزگەیـەکی کەسـی و تایبـەتیی خۆیشـی کردبێـت، وەک ئـەوەی لـە شـیعرێکدا خۆزگــە بــۆ پێکــەوەنانی خێــزان و منــداڵ دروســتکردن دەخوازێت، ئەوا دیسانەوە لەپێناو مەسەلە گەورەکەی گەل و نیشتماندا بووە:

**نـە ژیـام کۆرپەیـەک نـاو بنـێم تۆڵـە**
**بڕواتـە شـوێنم بـا نـەڵێن چۆڵـە**
**نـە ژیـام برازایـەک نـاو بنـێم ژیلـوان**
**تا نەڵێن گەردوون بۆ پیاوکوژی لـوان**

... ... ......

**نـە ژیـام بـۆ خـەڵکی ببمـە جێـی بـڕوا**
**ئەڵێن بێ سوود بوو چش دەبا بڕوا**

**نە ژیام بۆئەوەی نویٚ ڕیٚ تـەخت کـەم**
**نەک جاریٚ سەد جار گیانم بەخت کـەم**
(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٤٩ -٥٠ )

هەڵبژاردنی ناوەکانی (تۆڵە و ژیلوان)، سەربارى ئەوەی گرێدراوی خـەباتی سیاسـیی شـاعیرن، بەوپێیـەی یەکـەمیان نـاوی ڕێکخراوێکـی سەربە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانە) و شاعیر لێپرسراوی بووە و دووەمیـان نـاوی شـاخێکە لـە ناوچـەی جافایـەتی، شـاعیر تێیـدا پێشـمەرگە بـووە، لەهەمان کاتدا هەڵگری واتایەکی پڕ لە بەرگریین، شـاعیر لـەو ڕێگەیـەوە دەیەوێت کاروانی خـەباتیان پیٚ بسـپێرێت و بیانکاتـە پێشـمەرگەی ڕێـی ئازادیی ئەو کوردستانەی ژینی خۆی پێبەخشی:

**بەڵام کە ئەمویست نەمرم بە گەنجی**
**کوردستان ئەیوت پێویستمە ڕەنجـی**
(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٥٣)

شـاعیر تـا دوا سـاتەکانی ژیـانی بـەهیوای ئازادییـەوە دەژی لەگـەڵ بـەدی نـەهاتنی خۆزگـەکان و هـەڵوەرینی ئاواتەکانیـدا، کـەچی هەمیشـە شاعیر بە هیوا و گەشبینییەوە لە ئایندەی ڕوانیوە و لە ئـەنجامی کـار و خەباتەکـەی دڵنیا بووە، کـە لـە دوارۆژدا دەبێتـە مایـەی سـەربەرزی بـۆ گەل و نیشتمانەکەی:

**لــە زۆردار نــەبیٚ لــە کــەس نــەڕەنجام**
**کــــەم ئاواتیشــــم گەیشـــتنە ئـــەنجام**
**ئاواتـــەخواز بـــووم لـــەدوای ڕۆژی ڕەش**
**بـــووکی ئـــــازادیی بگرمـــــە بـــــاوەش**
**کەم خواست و خۆزگەم گەیشـتە ئـەنجام**
**هێشـــتا لـــــە ڕۆژی هیـــوا نـــەڕەنجام**
(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٧٥- ٧٦)

ئەوەی تێبینی دەکرێت، باوەڕ و دڵنیایی شاعیرە بە شەهیدبوونی خۆی، کە وایکردووە حەسرەت و هیوا تێکەڵ بکات، حەسرەتی نەبینینی ڕۆژی ئازادیی گەل و وڵات و هیوای بە دواڕۆژی کورد و کوردستان، بەواتایەکی تر شاعیر متمانەی بەوەیە حەق هەر سەردەکەوێت و دوژمن هەر لەناو دەچێت و وڵات هەر ڕزگار دەبێت:

**ناشبینم کە کورد وەکو میللەتان**
**ئاڵای سەربەستی هەڵکا لە جیهان**
**ناکۆکی نێوان چینان نەمێنێ**
**وەک یەک لێ بکرێ لادێ و شارستان**

... ... ... ...

**ئەی کوردستانی مەڵبەندی کاوە**
**جێی داخە نەمدی ئاڵای شەکاوە**
**بەڵام ڕۆژێک دێ هێزی نەوەی نوێ**
**کۆشکی زۆرداری پێ هەڵتەکاوە**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٩٦ – ٩٧)

هەمان هەست لەو تاکە دەقەی شاعیر، کە لە قۆناغی پێشمەرگایەتیدا نووسیویەتی، ڕەنگیداوەتەوە و لەلایەک پێشبینیی مەرگی خۆی دەکات و لەلایەکی ترەوە گەشبینە بە دواڕۆژی هەموو ڕۆژهەڵات و پێکەوەیان دەبەستێت:

**پێموایە دەمرم دوا دیدەنیمە**
**بەجێ دەمێنێ هەرچی کە نیمە**
**ڕۆژێک دێ ئاسۆی ڕۆژهەڵاتی سوور**
**ڕووناکتر دەبێ و نزیک دەبێ دوور**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ١٠٧)

هیوا و گەشبینیی شاعیر، تەنها خۆی لە بازنەی ئازادیی گەلدا نابینێتەوە، بەڵکو سنووری مەحاڵیش دەبڕێت و لووتکەی گەشبینیی خۆیمان بۆ ئاشکرا دەکات، ئەمەش ئەوکاتەی ماوەی خەباتی نابێتە جێی

قایلبوون و ڕەزامەندیی، بۆیە بەڵێن دەدات، کە لەو دنیا لەگەڵ زیندووبوونەوەیدا تەواوی قەرزەکانی گەل و نیشتمان بداتەوە و کاروانی خەباتی درێژەی ببێت و وەک پێشمەرگەیەک لە بەجێگەیاندنی ئەرکە پیرۆزەکەی بەردەوام بێت:

**کە پاش مردن هەبوو دنیایەکی نوێ**
**تا ئەوکاتە با گیانیشم تێر بنوێ**
**چونکە ڕۆژی هەستانەوە، دەرفەتی**
**فرمانێکی وەک ئێستام هەر بۆ ئەلوێ**
**لەو دنیاش هەر پێشمەرگە و کادرم**
**کە هیچ نەبێ لەوەی ئێستا چاترم**
**لێرە خاوەن ئەزموونی ڕێی خەباتم**
**لەوێ لەنێو کوورەی شۆڕش ئاگرم**

(شەهید مەلا عەلی، ٢٠١٨: ٦٥)

## ئەنجـام

١. شـــەهید مـــەلا عـــەلی شـــاعیر، پـــەروەردەی نێـــو خێزانێکـــی کوردپەروەر و خاوەن قوربانییە، هەر بۆیە کوردایەتی بە تاکە ڕێگەی خەبات زانیوە، توانا زانستی و ڕۆشنبیری و سیاسییەکەشی لە خزمەت ئەو ڕێگەیەدا بەکارهێناوە.

٢. شـاعیر پـێش زینـدانیکردنی هەنـدێ دەق و بابـەتی نووسـیوە، بەڵام ئاوێتەبوونی بە دنیای شیعر، زیاتر لە دوای گرتنی و زۆرتریش لە ماوەی نێوان دەرچوونی فەرمانی لە سێدارەدان و جێبەجێکردنیدا بووە، کەواتە زیندان بووەتە زادەی داهێنانەکەی و باڵای بە کۆمەڵێک دەقی پڕ لە بەرگریی وا کردووە، کە نەمرییان بە شاعیر بەخشیوە.

٣. تیڕوانینی شاعیر بۆ مەرگ، تیڕوانینێکی فرە ڕەهەند و قووڵە، بەلایەوە مەرگ مانای ژیانە، چونکە پرۆسەی شەهیدبوون ئامادەگی هەیە و بووەتە چارەنووسی زۆرینەی شۆڕشگێڕانی گەل و هەر مەرگ و کۆڵنـەدانیش زامنکـەری سـەرکەوتنن، تاکـە شـتێک لـەو ڕێگەیـەدا نیگەرانی کردبێت، ئەوەیە کە ژیان دەرفەتی ئەوەی نەداوە زۆرتر خزمەتی گەل و نیشتمانەکەی بکات.

٤. هەرچەندە شاعیر لە دنیا شیعرییەکەیدا (ئاگاییانە بێت یان نائاگاییانـــە) ویســـتبێتی کەشـــی زینـــدان تێبپـــەڕێنێت، لـــەڕێگـــەی (یادکردنـەوەی کەسـوکار و ئـازیزانی، یـان لەڕێگـەی ئاوڕدانـەوە لـە سروشـت، یـان خۆزگـە و هیـوا خواسـتن)ەوە بێـت، ئـەوا لـە کۆتاییـدا هەرخۆی لەناو واقیعە تاڵەکەی زینداندا بینیوەتەوە و مۆتەکەی مەرگ لەگەڵیـدا سـەرەتاتکێی کـردووە، لەگـەڵ هـەموو ئەوانەشـدا هەمیشـە گەشبین بووە بە دوارۆژی گەل و نیشتمانەکەی.

**سەرچاوەکان**

**یەکەم: کوردییەکان:**

**أ. کتێب:**

١. عەبدولکەریم، سەبور (٢٠١٤): چەمکی ژیان و مردن لە شیعری مەولەوی و مەولانای ڕۆمیدا، چاپخانەی تاران، ناوەندی غەزەلنووس، سلێمانی.
٢. عەلی، بەختیار (٢٠١١): چێژی مەرگدۆستی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی.
٣. عوسمان، هەرێم (٢٠١٣): چەمکی مردن لە زمانی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
٤. قەرەداغی، مەحمود (٢٠١٩): لەودیو سنوورەکانی مەرگەوە (یادەوەرییەکانی زیندان)، چاپی سێهەم، سلێمانی.
٥. مەلا عەلی، شەهید (٢٠١٨): یادی قەندیل، چاپی یەکەم، چاپخانەی هەست، سلێمانی.

**ب. نامەی زانکۆیی:**

١. ئیسماعیل، ئەرسەلان بایز (١٩٩٩): ڕاگەیاندنی شۆڕش و بزووتنەوەی شیعری کوردی (١٩٧٥- ١٩٩١)، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، کۆلێجی زمان.
٢. خۆشناو، ئەبوبەکر عەبدوڵلا (٢٠٠١): شیعری بەرەنگاریی کوردی (١٩٧٥- ١٩٩١)، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، کۆلێجی زمان.

**ج. ئینتەرنێت:**

١. ئەکاونتی شەهید مەلا عەلی لە تۆڕی کۆمەڵایەتیی فەیسبووک (لەلایەن خانەوادەکەیەوە بەڕێوە دەبرێت)، لە ڕۆژی (٢٢)ی تشرینی دووەمی (٢٠١٧) شیعرێکی بڵاونەکراوەی کە مێژووی (تەمووزی ١٩٧٩ی لەسەرە)، بڵاوکراوەتەوە.

**دووەم: عەرەبییەکان**

**أ. کتێب**

١. اسماعیل، عزالدین (١٩٦٣): التفسیر النفسي للأدب، دار العودة- دار الثقافة، بیروت.

٢. بنيس، محمد (٢٠٠١): الشعر العربي المعاصر بنياته وابدالاته، دار توبقال، الجزائر.
٣. عبدالفتاح، كاميليا (٢٠٠٨): اشكالية الوجود الانساني- دراسة نقدية تطبيقية في الشعر الواقعي الحداثي، دار المطبوعات الجامعية، مصر.
٤. عبدالله، صابر (١٩٩٠): التجربة الابداعية في ضوء النقد الحديث، مكتبة الخانجي، القاهرة.
٥. هازلت، وليام (؟): مهمة الناقد، ترجمة: نظمي خليل، الطبعة الاولى، القاهرة.

**ب. رسائل جامعية:**
١. اسماعيل، بسام (٢٠١٧): التشكيل الحسي في شعر الطبيعة العباسي في القرن الثالث الهجري، اطروحة دكتوراه، كلية الآداب، الجامعة الاسلامية، غزة.
٢. قدور، سكينة (٢٠٠٧): الحبسيات في الشعر العربي، جامعة منتوري، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب واللغات، الجزائر.

**جـ المجلات:**
١. الخطيب، احمد موسى (٢٠١٥): ثنائية الموت والبعث في تجربة خليل حاوي، مجلة الجامعة الاسلامية للبحوث الانسانية، المجلد الثالث والعشرون، العدد الاول.

**ملخص البحث**

# شبح الموت في اشعار الشهيد ملا علي

**أ.م.د. فرهاد قادر كريم**
كلية التربية الاساس
جامعة گرميان

يعد الشعر وسيلة من الوسائل التى لجأ إليه الإنسان منذ القدم ليعربه عن الموت وخفاياه ، وهذه الظاهرة كانت بارزة لدى الشعراء المعاصرين ايضا. ف(شهيد ملا علي) الشاعر الشاب الذي ترعرع وقضى ردحا من الزمن في السجون المظلمة لنظام البعث في الربع الاخير من القرن المنصرم انموذجا حيا ، فكان يحتسب آخر أيام عمره بانتظار ساعة إعدامه ، ومن ثم نجد أن صورة الموت في أشعاره من أبرز الصور الشعرية لديه ، وطاغية على ديوانه ، و من هنا وقع اختيار (شبح الموت في أشعار الشهيد ملا علي) عنوانا للبحث.

فقد كان لحياة الشاعر الثقافية والسياسية أثر كبير في توجهه أن يسلك مسلك القومية (كوردایەتی) ولم يعتر به فتور، على الرغم من المصائب والويلات التي ألمها في هذا المسلك، غير ان ينبوعه الشعري قد تدفق من بين جدران السجون مغطى أفكاره بثوب المقاومة والتفاؤل، وإن الموت لدى الشاعر يتخطى معناه الحقيقي ، حاملا مفاهيم شتى ، ملوحا بتباشير الصباح ، ومبددا ظلمة الليل ، وعائدا الأمل إلى حياة من جديد، وهذه المفاهيم كلها تصب اخيرا في بحر الحياة .

## Abstract

# The Shadow of Death in Mulla Ali's poems

Poetry is one of the most prominent methods humans used to address death and discover its secrets. This strategy can be found in the poetry of the contemporary poets as well. One of those poets is Mulla Ali, a young poet who emerged in the heart of the ill-famed jails of the ex-Baathist regime in Iraq. In the last quarter of the twentieth century, he passed his days in the jails by just waiting for the day of his execution which was already decided by the regime. This attempt, therefore, is entitled "The Shadow of Death in Mulla Ali's Poems."

His familial, cultural, and political upbringing was the reason that he chose struggle for his nation as the sole way of life. Though this meant lots of pain and problems, his poetic power exploded inside the jails and reflected the spirit of opposition and freedom-seeking.

For him, death trespasses its limited denotation and encompasses a wider concept as part of the overall and multi-dimensional aspects of life.

# ناسنامەی لاو
# لە جیهانبینی شیعریی دڵداردا

**د. محەمەد ئەحمەد حەسەن**
بەشی زمانی کوردی
کۆلێژی پەروەردە - شەقڵاوە
زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر

**پێشەکی**

هەموو شاعیرێک لە شیعرەکانیدا جیهانبینییەکی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەو جیهانبینییە داڕێژەری بیرکردنەوەی شاعیرەکەیە لەبارەی کۆمەڵێ چەمک. بەڵام دەزانین زمانی شیعر جودایە لە زمانی هەر نووسینێکی دیکە. بۆیەیش دەبێ مامەڵەمان لەگەڵ جیهانی شیعر بۆ کارکردن لەبارەی هەر چەمکێکەوە جیاواز بێت. (دڵدار)ی شاعیر یەکێکە لەو شاعیرانەی بە شێوەیەکی قووڵ لەبارەی کۆمەڵێ چەمکەوە لە شیعرەکانیدا کاری کردووە. چەمکی (لاو) وەکو بوونێک بە شێوەیەکی فەلسەفییانە لە شیعرەکانیدا کاری لەبارەوە کراوە. ئەو شاعیرە لە شیعرەکانیدا هەوڵی دیاریکردنی ناسنامەی لاوی داوە، بەڵام ناسنامەیەک دەبێتە پێشمەرجی بووناسانەی لاو. ئەم توێژینەوەیەمان هەوڵێکە بۆ دیاریکردنی ناسنامەی لاو وەکو بوونێک لە جیهانبینی (دڵدار)ی شاعیر. توێژینەوەکەمان لە دوو بەش پێکدێت.

بەشی یەکەممان بۆ قسەکردنە لەبارەی چەمکی (لاو). بە شێوەیەکی تیۆری هەوڵی دیاریکردنی چەمکی (لاو) لە ڕووە فەلسەفی و بووناسییەکەیەوە داوە. بەوەی (لاو) چییە؟ کێیە؟ ئەرکی چییە؟ تێڕوانینی شۆڕشەکان بۆ لاو چییە؟ پاشان هاتووین هەوڵی دیاریکردنی چەمکی (لاو)مان لە کۆمەڵگەی کوردیدا داوە. بەوەی کۆمەڵگەی کوردی چۆن لە (لاو) دەڕوانێت؟ بەوەی هەمیشە کۆمەڵگەی کوردی وەکو بوونێکی کەم عەقڵ لە (لاو)ی ڕوانیوە.

هەرچی بەشی دووەمە، بەشێکی پراکتیکییە، بەناوی (جیهانبینی دڵدار بۆ ناسنامەی لاو). لەڕێی شیعرەکانەوە هەوڵی دیاریکردنی ناسنامەیەک و بوونێک بۆ (لاو) دەدات. بەمەیش کارمان لەبارەی چەند ڕەهەندێکەوە کردووە. بۆ نموونە (دڵدار) ناسنامەی لاوێکمان بۆ دیاری دەکات، کە ناومان ناوە (لاوی پیر)، لاوێکە وزەیەکی مردووی تێدایە، لاوێکە ناسنامەی لاوێتی خۆی بزرکردووە. هاوکات (دڵدار) ناسنامەی لاوێکی دیکەمان بۆ دیاری دەکات، کە ئێمە بە (خەونی لاو) ناومان هێناوە. لاوێکە پڕە لە خەون، پڕە لە وزەی ژیان. هاوکات (دڵدار) بەراوردی نێوان لاوی ئێمە و ئەوروپا دەکات ئەمەشمان بە بەڵگەی شیعری دیاری کردووە. لە کۆتاییدا بە چەند خاڵێک ئەنجامی توێژینەوەکەمان دیاریکردووە، پاشان لیستی سەرچاوەکانمان بە سیستەمی هارڤارد کردووە.

## بەشی یەکەم: سەرەتایەک لەبارەی چەمکی لاو

### یەکەم: چەمکی لاو:

چەمکی لاو چەمکێکی فرەڕەهەندە، واتە ڕەهەندی کۆمەڵناسی و دەروونناسی هەیە، تەنانەت لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە لاوان بە بزوێنەری کۆمەڵ دادەنرێن، چونکە پرۆژەی تاک بوون لە لاوەوە دەست پێدەکات. تەنانەت لاو پێوەرە بۆ پێشکەوتن، یان دواکەوتنی هەر کۆمەڵێک. ئەوە لاوە دەتوانێ پرۆژەی مەعریفی و جەستەیی هەبێت، هەر لاویشە دەتوانێ کۆمەڵ سڕ بکات. کاتێک دەڵێین لاو، یەکسەر وزەی زۆر و نوێمان بە مێشکدا دێت. وزە و شێوازی بیرکردنەوەی لاو، وزە و شێوازێکە پڕە لە خەیاڵ بۆ داهاتوویەکی گەش و پڕشنگدار. بۆیەیش هەموو شۆڕشەکان ئومێدێکی گەورە لەسەر تواناکانی لاو هەڵدەچنن. هەموو دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکانیش بە شێوەیەک لە شێوەکان هەوڵی کوشتن و ئیفلیج کردنی تواناکانی لاوان دەدەن. هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن لاو بە ڕابردووەوە پێوەست بکەن، بەڵام لە بنەڕەتدا لاو

پێوەستە بە ئێستا و داهاتوو، چونکە لە لای لاوان ئێستا پردێکە بۆ پەڕینەوە بەرەو ئایندە. کەواتە ناتوانین بەبێ پەیڤین لەبارەی چەمکی ئایندەوە باس لە چەمکی لاو بکەین. لاو یەکسانە بە ئومێد و پرۆژەی مەعریفی. بۆیەیش هەر چەپاندنێک لە حەز و ئارەزووی لاو بکرێت، ئەوا ئەو کۆمەڵە پێشکەوتن بە خۆیەوە نابینێت. کەواتە ((بەرهەڵدانی ئارەزووەکان و حەزە کەپتکراوەکان دەبنە مایەی پێشکەوتن و ئارامی و ئاسوودەیی و داهێنان.)) [پیرباڵ، ٢٠٠٦، ل١٦٤] ڕێگری لە هێز و توانای لاو ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵ دەبێت.

لاو خاوەن عەقڵی نوێگەرییە، چونکە هەمیشە وزەیەکی نوێی تێدایە. ئەم وزە نوێیە لە ڕێی هێندێ فاکتەرەوە دەتواندرێ بە گەڕ بخرێت. یەکێک لە فاکتەرەکان بوونی هوشیارییە لە لای گەنج. هوشیاریی بەرانبەر خودی خۆی و کۆمەڵەکەی، بەرانبەر دیاردە و کێشە و گرفتەکانی ناو کۆمەڵ. لەم ڕێیەوە هەست بە بەرپرسیارییەتی دەکات، بیری گۆڕانکاری لە زەیندا بۆ دروست دەبێت. فاکتەرێکی دیکە ئەوەیە لاوان ببنە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیانە بۆ ئەوەی بتوانن گۆڕانکاریی گەورە دروست بکەن، بۆ ئەمەیش پێویستە شوناسی خۆیان بدۆزنەوە، یان دیاری بکەن. دەمەوێ بڵێم لاوان کۆمەڵێ تایبەتمەندی و خاسیەت هەیە بۆ خۆیانی دیاری بکەن، تاکو لە ڕێیەوە بناسرێنەوە. شوناسی خۆیان لە دەرەوەی حیزب، ئایدیۆلۆژیا، نەتەوە...تاد دیاری بکەن. بە دیاریکردنی شوناس لەلایەن لاوەوە، لاو لە ((بوونەوەرێکی پاشکۆوە دەبێتە بوونەوەرێکی سەربەخۆ.)) [قانع، ٢٠٠٣، ل١٩١] بەم هۆیەوە لاو دەتوانێ گەشە بە خۆی بدات لە ڕێی فیکرەوە. واتە دەتوانێ خاوەن پرۆژەی مەعریفی گەورە بێت.

لاوان داینەمۆی هەموو گۆڕانکارییە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانن، بۆیەیش زۆربەی قۆناغەکانی مێژوو لە مێژووی هەر میللەتێکدا بە کار و پرۆژەی کۆمەڵێ گەنج دەناسرێتەوە. بۆیەیش هەر قۆناغێکی مێژوو دەبینین هەم لاو داینەمۆی گۆڕانکاری بووە و هەمیش

قوربـانی. بـۆ نمـوونە لە سـەرەتاکانی سـەدەی بیسـتەمدا لاوان دەبـنە بـزوێنەری شۆڕشـی حەڤـدەی ئۆکتـۆبەر لە یەکێتیـی سـۆڤیەت، بەڵام هاوکـــات بە هەزاران گەنـــج دەبـــنە قوربـــانی ئەو ئایـــدیۆلۆژیایە و ئایـــدیۆلۆژیای ناســـینالیزم، کە دوو جەنگـــی گەورەی جیهـــانی لـــێ دەکەوێتەوە. ڕەنگە هیچ شۆڕشێک هێندەی شۆڕشی خوێندکارانی ١٩٦٨ لە فرەنسادا گەنج بزوێنەری نەبن. ئەم شۆڕشە تەواو گەنجانە بوو. ئەم شۆڕشـە دەبێتە هـۆی ڕووخـانی ڕژێمەکەی (دیگـۆل)، لەم سـەردەمەی ئێستایشدا ئەو ڕاپەڕینانەی بە ناوی بەهاری عەرەبییەوە دروست بوون لاوان سەرمەشق و بزوێنەری بوون. بۆ ئیفلیج کردن و سڕکردنی ئەو وزە و توانـایەی لاوان دەسـەڵات چەنـدین ڕێ دەگـرێتەبەر. بـۆ نمـوونە ((دەوڵەت ئارەزوو دەکات گەنج بۆ ماوەی دەساڵ یان زیـاتر لە کەمپی مـاڵیکردن و دەسـتەمۆکردنی خۆیـدا بمێنێـتەوە (لە قوتابخـانەوە تـاکو زانکۆ)، بە پاسـاوی فێرکردنـی زانسـت.)) [النفیسي، ١٩٨٦، ل٢٨-٢٩] کەواتە چەنـد لاو پـڕۆژەی هەبێـت بـۆ گۆڕانکـاری، دەسـەڵاتیش دوو هێنـدە لە هەوڵی بەگەڕخستنی فاکتەرەکانی ئیفلیج کردن و دامرکاندنەوەی وزەی لاوە. هەمیشـــە هـــانی لاوان دەدات خۆیـــان لە سیاســـەت دوور بگـــرن. بۆیەیش هەمیشە دەسەڵات سەرۆک و ئایدۆلۆژیاکانی حیزب بە پیرۆز دادەنێـت، دەیانخـــاتە نـــاو پرۆگرامـــی خوێنـــدنەوە. هەمووومـــان کاتێـــک خوێندکاری سـەرەتایی بووین بەتـایبەت نەوەی پێش ڕاپەڕیـن بیرمـانە چـۆن وێنەی دیکتـاتۆرێکی وەکو (سـەدام) و بنەماکـانی حیزبـی بەعـس لەناو پرۆگرامەکانی خوێندندا وەکو شـتی پیرۆز دەخرانە نـاو مێشـکی خوێنـــدکارانەوە. بە داخەوە دوای ڕاپەڕینـــیش هەمـــان پـــڕۆژە بـــۆ بە پیرۆزکردنی حیزب و سەرکردە بەردەوامی هەبوو.

هەمیشـە گەورەکـان لە کۆمەڵە دواکەوتووەکـان و ترادیسـیۆنەکان ترسـێکی زۆریـان لە لاوان هەیە. تەنـانەت لەو جـۆرە کـۆمەڵانەدا لاوان هێنـدە قێزیـان لە سیاســەت دەبێـتەوە، نایانەوێـت تخـوونی سیاســەت بکەون. بە واتایەکی دیکە نایانەوێت بچنە ناو هیچ حیزبێکی سیاسییەوە.

بۆ؟ بە بڕوای ئێمە کۆمەڵی ترادیسیۆنی کار لەسەر کوشتن و کپکردنی وزەی گەنجان دەکات، بەوەی نایەوێ لاوان خاوەن بیرکردنەوە و پڕۆژەی خۆیان بن. لەلایەکی دیکە لاوان هەوڵی دابینکردنی ژیانێکی خۆشگوزەران دەدەن. بەڵام هۆکاری سەرەکیی ئەوەیە لەلایەن دەسەڵاتەوە هەمیشە ئەو پەیامە فرێ دەدرێتە ناو چینی لاوان، ئەوەی تخوونی سیاسەت بکەوێت، ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبێتەوە. بۆیەیش ئەو لاوانەی ملکەچ دەبن بە لای عاقڵ و چاکەکار ناو دەبرێن و ئەوانەیشی یاخی دەبن بە ئاژاوەگێڕ و مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نیشتمانی هەژمار دەکرێن. نموونەی ئەو لاوانەمان زۆرن، کە نەچوونەتە ژێر باری دەسەڵات، بۆیەیش لەلایەن دەسەڵاتە دیکتاتۆرەکانەوە سیناریۆیان بۆ دروستکراوە و تووشی ئەشکەنجە و کوشتن بوونەتەوە.

لە هەموو ئەو قسانەی سەرەوەدا دەتوانین پێناسەیەکی گشتی بۆ لاو بکەین، کە لاو بناغەی هەموو کۆمەڵێکە، بە گەڕخەری هەموو گۆڕانکارییە سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانە. کەواتە لاوان هەمیشە سەردەستەی شۆڕشە کلتووری و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانن. بۆیەیش ئامانجی زۆرێک لە شۆڕشەکان قڵپکردنەوەی تێڕوانین و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تازەتر و ڕادیکاڵانەتر دابڕێژێتەوە. بزووتنەوەی خوێندکاری شەستەکان لە فەرەنسا، کە دواتر بە (ڕەخنە کۆمەڵایەتییەکانی شەستەکان) ناسرا، دەبێتە نەریتێکی ڕۆشنگەری سیاسی، کە دواتر لە زۆربەی وڵاتان چاوی لێ دەکرێت. دەبێتە مێژوویەک بۆ گۆڕانکاریی گەورە. ئەم بزووتنەوە خوێندکارییە، لاوان بزوێنەری بوون. ئەم بزووتنەوەیە ((بابەتێکی سەرەکی، کە لە پێش چاوی دانابوو، مەسەلەی زانکۆکان و ڕیفۆرمی زانکۆیی بوو. زۆربەی ڕاپەڕینە خوێندکارییەکان لە شەستەکان ئامانجی هاوشێوەی هەبوو.)) [چەند نووسەرێک، ٢٠١١، ل٢٥٦] ئەوەی لاوان لە توانایاندایە بیکەن، گۆڕانکاریی ڕیشەییە. ئەمەیش

پاتەکردنەوەی ئەو دیدەی "هێربەرت مارکۆزە"یە بۆ ڕۆڵی لاوان لە شۆڕشدا. بەوەی ئەم چینە جودا لەوەی ڕۆڵی گەورەیان لە هوشیارکردنەوەی تاکەکانی ناو کۆمەڵ هەیە، دەبێ لە کاتی شۆڕشدا هەماهەنگی لەگەڵ چینە ستەم لێکراوەکانی ناو کۆمەڵ بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش بکەن.

**دووەم: دیدی کۆمەڵی کوردی بۆ لاو:**

لێرەدا دەبێت لە دیدێکی سۆسیۆلۆجییەوە لە چەمکی لاو لە تێڕوانینی کۆمەڵی کوردەواریدا بڕوانین. کۆمەڵی کوردی، یەکێ لەو کۆمەڵانەیە هەوڵی دابەشکردنی چینەکانی ناوی بەسەر چەند تەمەنێکدا دەدات. واتە تەمەن دەبێتە پێوەر بۆ دیاریکردنی چینەکانی ناو کۆمەڵ. ئەم دابەشکارییە بۆ ئەوەیە بتوانن چۆن ئەم چینانە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. بۆ نموونە هەمیشە لە کۆمەڵی ترادیسیۆنیدا وەها تەماشای لاو دەکرێت، کە هێشتا عەقڵی تەواو گەشەی نەکردووە، کەسێکە ناتوانێت بە تەواوی بڕیار بدات. سنووری نێوان لاو و هەرزەکار تێکەڵ بە یەکدی دەکرێت. لاوەکان بە کەسانێکی هەڵەشە و پێنەگەیشتوو دادەنرێن. ((ئەم کائینە کەسێکی سەرەڕۆیە و لە چوارچێوەی ئەو داب و دەستوورە کۆمەڵایەتیانە لایداوە، کە ئێستا بە لای زۆربەمانەوە پەسەندن و ماقووڵن.)) [سیوەیلی، ٢٠٠٨، ل٣٢١] ئەمەیش ڕاستەوخۆ بێ بایەخ کردن و کوشتنی وزەی لاوێتییە. دەبینین لە کۆمەڵی مۆدێرندا لاو کەسێکە خاوەن پڕۆژە، تەمەنی تێکەڵ بە تەمەنی هەرزەکاری ناکرێت، بەڵکو پتر بایەخ بە تەمەنی دەدرێت و درێژ دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی هەمیشە خەونی جێبەجێ کردنی خەونەکانی هەبێت. ئەم بێ بایەخ کردنەی لاوان وەکو سامانێکی نەتەوەیی هەوڵێکە بۆ پەراوێزکردنیان. لە بەرانبەر ئەو تێڕوانینەی، کە گەنج و لاو کەسێکی ناکامڵە، حیسابێکی زۆرتر بۆ پیاوی سەرورێش سپی و پیاوی ماقووڵ و ناو دیوەخان دەکرێت. ڕاستە ئەمە بە پێوەری ئەزموونی ژیانکردن دەپێورێت، بەڵام هیچ تێزێکی زانستی لە دواوە نییە. مەرج نییە هەموو

پیریێــک و بە تەمەنــداچوویەک خــاوەن بیرکردنەوەیەکــی لۆژیکــانە و عەقڵانیانە بێت. کەواتە لاو لە کۆمەڵی کوردیدا وەکو بوونێکی ناکامڵ و پێوەســت بە بــوونی کەســانی دیــکەوە هەژمــار دەکــرێن. واتە وەکــو کەسـێکی سـەربەخۆ مـامەڵەی لەگەڵـدا ناکرێـت. ئەمەیـش هەوڵـێکە بـۆ بزرکردنی لاوان لە خودی خۆیان، نایەڵن لاوەکان فەنتازیا و خەون و خەیاڵەکانی خۆیان بەگەڕ بخەن و هەوڵی پراکتیزەکردنی بدەن. بۆیەیش ((گەنـج دەبـێ بەنـدەی گەورەکـانی بێت و جـوامێری لەوەدا بـۆ حسـاب دەکرێ کە دابی پێشـینان دووبـارە بکاتەوە و پیر دەبێ دەستەوەسـتان چاوەڕوانی مەرگ بکات. لەو سیستەمەدا پەروەردەی کۆمەڵایەتی کاری خــۆی دەکــات و تــاک لەنــاو بــاوەڕ و دابە داخــراو و قەدەغەکانــدا دەبەستێتەوە. بەستنەوە توانایی مرۆڤ دەپرووکێنی و پەکی دەخـات.)) [قـادر، مـاڵپەڕ] لێـرەدا هەر هەوڵێـک هەبێـت بـۆ هوشـیارکردنەوە و گەشـەپێدانی توانـای لاوان بە هەوڵـی فاسـدکردن هەژمـار دەکرێن. ئەوە دەزانــین چــۆن دادوەرەکــان لە یۆنــانی کــۆن ســوکرات بە تــاوانی فاسدکردنی گەنجەکان ڕووبەڕووی مەرگ دەکەنەوە. هاوکات ئەوەیش دەزانین چۆن ئەفلاتوون شاعیرەکان لە کۆمارەکەی بە بیانووی تێکدانی مێشکی گەنجەکان دەردەکات. بۆیەیش لە هەر جوولانەوەیەکی مۆدێرندا لەنــاو کــۆمەڵێکی ترادیســیۆنی وەکــو کــۆمەڵی کوردیــدا لاوەکــان بە ئاژاوەگێڕ و کاڵفام لە قەڵەم دەدەن. لێرەوە ئەگەر بمانەوێت پێناسـەیەک بـۆ لاو بەپێـی تێڕوانینـی کـۆمەڵی کـوردی بکەیـن: ئەوا لاو بـوونێکی ناکامڵە، ناتوانێت خۆی بڕیار لەسـەر شـتەکان بدات، ئەزمـوونی ژیـانی نیـیە. بەڵام بەپێـی تێـڕوانینە نوێیەکـانی سۆسـیۆلۆجیا لاوەکـان بەپێـی تەمەنیــان و ئیمکانیــاتی بــایلۆجی و پێکهــاتە ســەرەکییەکانی نــاوەوە و دەرەوەی جەسـتەیان بەردەوام خەون و خواسـتەکانیان نوێ دەکەنەوە و گەشە دەکەن.

لەم سـەردەمەی ئێسـتادا بەپێی تێڕوانینـی "ئـالان بـادیۆ" لاوەکـان لەنێـوان دوو شـتدا دێ و دەچـن، یـان ئەوەتـا ڕابـردوو و دابونەریـت

زیندوو بکەنەوە و پیڕەوی لێ بکەن، یان هەوڵی دەستخستنی جێیەک لەنێو ململانێ و کێبڕکێی سیستەمدا بدەن. ئەویش لەپێناو مانەوەی خۆیان. بۆیەیش ئەم سۆسیۆلۆجییە چارەسەری ئەمە دادەنێت. ((ئەو شتەی من دەمەوێ بە چاولێکەری لە ڕابمبوۆ، پێی دەڵێم: ژیانی ڕاستەقینە. جۆرێکە لە ڕێگای سێیەم: نە گەڕانەوە بۆ نەریتە بەسەرچووەکان و نە خۆ گونجاندن لەگەڵ ڕێساکانی سەرمایەداریی بە جیهانبوویشدا، کە وێڕای ڕواڵەتە شارستانیەتەکەی کەچی لە واقیعدا درندە و نا ئینسانییە. ئەو ژیانە ڕاستەقینەیە ئەوەیە نە خۆی بداتە دەستی گوێڕایەڵییەوە نە تێرکردنی غەریزە و بزوێنەرە سەرەتاییەکانیش. ژیانێک کە سوبێکت خۆی وەکو سوبێکتێک تیا دروست دەکات.)) [بادیۆ، سایتی نێگەتیڤ] کێشەی لاوەکانمان لە ئێستادا ئەوەیە نە دەتوانن خۆیان لە نەریتە بەسەرچووەکان ڕزگار بکەن، چونکە هێشتا ئەوان لە چوارچێوەی خێزاندا دەژین، هێشتا ئەگەر ڕۆژانە دایکی، یان باوکی پارەی پێنەدا پارەی پێ نییە، هێشتا ناتوانێ وەکو لاوێکی ئەوروپی لە دوای تەمەنی هەژدە ساڵییەوە لە شوقە، یان خانوویەکی سەربەخۆدا بژی. هاوکات نە دەتوانێ خۆی لەگەڵ ڕەوتی تازەگەری و شتە تازەکانی سەردەم بگونجێنێ.

لاوەکان لە کۆمەڵی کوردیدا هێشتا دەرفەتی ئەوەیان نەبووە، هەموو ڕێیەکانی ژیان تاقی بکەنەوە. هەمیشە کەسانێک بوونە لەناو شەڕ و ململانێی حیزبی گیریان خواردووە. بە بەرنامە خزێندراونەتە ناو ململانێیەکی ناشرینی حیزبایەتی، شەڕی کۆمەڵێ شتیان پێکردوون، کە شەڕی ئەوان نییە. دەمەوێ بڵێم شەڕێک بووە نابی وزەی ئەوانی تێدا خەرج بکرێت. لاو هەمیشە لە وەها کۆمەڵێکدا هەست دەکات پانتایی بۆ کارکردن و هێنانەدیی خەونەکانی هێندە تەسک بۆتەوە ناتوانێ بجوولێتەوە، بۆیەیش بیر لە ڕێیەکی دیکە دەکاتەوە، بۆ نموونە کۆچکردن. ئەمەیش بەو واتایە نایەت لاوەکانی ئێمە دۆڕاو بن، نەخێر هەر ئەم کۆچکردنانە نیشانەی ئەوەن، لاوەکانمان هێشتا وزەی

ژیاندۆستی و ئاشتیانەیان تێدا ماوە. بۆیەیش بە دوای پانتاییەکی دیکەدا بۆ ژیان دەگەڕێن، چونکە کلتووری کوردی ناتوانێت بە تەنیا هەموو ئاواتەکانی لاو بهێنێتە دی. ((کلتووری کوردی ناتوانێت دەروازە بێت بۆ تێگەیشتن لە جیهان. بە پێچەوانەوە ئەو سامانە فیکرییەی لە دەرەوەیە دەتوانێت زەمینە بێت بۆ تێگەیشتنمان لە ماناکانی کوردبوونمان.)) [عەلی، ٢٠٢٣، ل٢٤٩] کەواتە کۆچکردنی گەنجان بە بڕوای من دیاردەیەکی باش و ئاساییە، چونکە لێرە سیاسەت باڵی بەسەر هەموو شتێکدا کێشاوە. ئەمەیش واتای ئەوە نییە لاو نابێ نزیکی سیاسەت بکەوێت. نەخێر بەڵکو سیاسەت دەیەوێ لاوەکانمان بکاتە هی خۆی، بە ڕۆبۆتیان بکات. بۆ نموونە سیاسەت و حیزب لە کۆمەڵی کوردیدا بە لاوەکانمان دەڵێت، ببە حیزبی دادەمەزرێی، کارت دەست دەکەوێ...تاد، بەڵام لە بەرانبەر ئەوەدا بە لاوەکانمان دەڵێت، ئەوە ئێمەین خەونەکانت دیار دەکەین، ئەوە ئێمەین دەتجوولێنین.

ئەوەی وا دەکات لاوەکانمان هەست بە دوورە پەرێزی بکەن، هەست بکەن لە کۆی کایەکانی ژیان بەتایبەتی کایەی سیاسەت پەراوێز خراون، ئەوەیە لاوەکان دوور دەخرێنەوە. هەر ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد، دەڵێن ڕاستە لاو کەسێکە پڕ لە وزەیە، بەڵام هەڵەشەیە، ئەزموونی کەمە، بۆیەیش بۆ ناو دامودەزگای حکوومی نابێت. لێرەدا دەزانین تێڕوانین بۆ لاو بەپێوەری تەمەن دەپێورێت، کە پێوەرێکی گردەبڕ و نەگۆڕە، بەبێ ئەوەی پێوەری پێگەیشتنی لاو چ لەرووی جەستەیی و چ لە ڕووی فیکرییەوە هەبێت. ئەوان وەک ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتی تەماشای لاو ناکەن، هاوکات سیاسەتێکی تایبەت بە لاوەکانیان نییە. بۆیەیش دەبینین لە کۆی ئەو حکوومەت و کۆمارانەی بە درێژایی مێژووی کورد دروست بوون، لاوە بەهرەمەند و خاوەن تواناکان کەمترین ڕۆڵیان پێدراوە. تۆ تەماشای کۆماری مهاباد بکە، چەند شێخ و سەید هەبوون پلەی باڵا و وەزیریان پێ درابوو، بەڵام لاوانی خاوەن بەهرە کەمترین پشکیان هەبووە. حکوومەتەکەی شێخ

مەحموود هەمان شێوە. دوای ڕاپەڕین لە کۆی کابینەکانی حکوومەتی هەرێم، هەرچی پیری ناپسپۆڕ هەبوو کرا بە وەزیر و ئەندام پەرلەمان، بۆ؟ چونکە ئەوانە خاوەن خەباتن. ئەمە ڕاستەو بەڵام تاکوتەرایان نەبێت، هیچ پسپۆڕییەکیان نەبوو. دەیان لاوی خاوەن پسپۆڕی و بە توانا هەبوون بەڵام پەراوێزخرابوون. هەموو ئەو سیاسەتانە بە شێوەیەک کار لەبارەی لاوان دەکەن، کە ببێتە هۆی کوشتنی تواناکانیان.

بابەتێکی دیکە لە کۆمەڵی کوردیدا سەبارەت بە لاوان زانکۆیە. هەمیشە ئەو تێڕوانینە لەناو لاوەکان هەیە، کە زانکۆ شوێنێکە بۆ پیاسەکردن و خۆدەرخستن، نەک شوێنی زانست. چەند هۆکارێک بۆ دروستبوونی ئەم تێڕوانینە هەیە. یەکێک لە هۆکارەکان بۆ خودی بەرنامەی زانکۆ و مامۆستایانی زانکۆ دەگەڕێتەوە، چونکە ناتوانن بەرنامەیەکی مێتۆدیانە بۆ پێشکەشکردنی زانست دابڕێژن. زۆربەی مامۆستاکانی زانکۆ لە ڕووی زانستی و پسپۆڕییەوە ئاستێکی نزمیان هەیە، بۆیەیش ناتوانن وێنەیەکی مۆدێرنی زانکۆ نیشان بدەن. لەلایەکی دیکەوە ئەو تێڕوانینە لەناو گەنجان باوە، کە زانکۆ شوێنێکە بۆ خۆدەرخستن. ئەگەر تەماشای زانکۆکانمان بکەین وەکو شوێنێکی دیکەی کۆمەڵایەتی دەبیندرێت. خوێندکاران هەوڵدەدەن بۆ هاتنە زانکۆ جوانترین جلوبەرگ بپۆشن. دەیانەوێت ئاستی کۆمەڵایەتی خۆیان بۆ یەکتری نمایش بکەن. بەڵام هەموو ئەمانە بە زمانی جەستە و جلوبەرگ دەکرێت. دەمەوێ بڵێم خوێندکاری زانکۆ ئامادە نییە لە ڕێی زمانی ئاخاوتن و نووسینەوە گوزارشت لە خۆی بکات، گوزارشت لە هەست و خەونی خۆی بکات، بەڵکو دێت لە ڕێی جلوبەرگ، ترۆمبێل، ستایڵی قژ و شتی دیکە گوزارشت لە خۆی دەکات. تەنانەت بەرانبەر ڕەگەزی بەرانبەری شەرم دایدەگرێت. ئەمەیش ئەوە دەسەلمێنێت، لاوی کورد زانکۆ وەکو ناوەندێکی کۆمەڵایەتی دەبینێت، بەڵام پێوەندیی کۆمەڵایەتی تێدا دروست نابێت، چونکە ئەو لەناو خێزانەوە هاتووە، لەناو خێزانیشدا

لاو بەرانبەر دەسەڵاتی باوک، بڕاگەورە دەستەوەستانە. بۆیەیش هەمیشە لاوەکانمان ناتوانن چێژ لە تەمەنی لاوێتی خۆیان وەربگرن. هەر زوو دەکرێنە خزمەتکاری باوک، ئایدیۆلۆجیای حیزب...تاد.

**بەشی دووەم: جیهانبینی دڵدار بۆ ناسنامەی لاو:**

کاتێک دەمانەوێت توێژینەوە لەبارەی شیعری دڵدار بکەین، دەبی ئەو پنتەمان لەبەر چاو بێت، هێندەی دەمانەوێت پەیامی شیعر بەرباس بدەین، هێندە خەریکی لایەنی تەکنیک و ئێستاتیکای شیعر نابین. کەواتە سەرلەهەوەڵ ئێمە مامەڵە لەگەڵ شیعر وەک پەیام دەکەین. ئەوەی ناوی دەنرێت لایەنی نوێکردنەوە لە شیعری کوردیدا لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، تەنێ خۆی لە چەند لایەنێکی فۆرمیدا بینییەوە. بۆ نموونە وازهێنان لە کێشی عەرووز، بە کارهێنانی وشەی پەتی کوردی، هێندێ بابەتی دیکەی ڕۆمانسی. ئەمە هەمووی هاوکاتە لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و ڕۆشنبیرییەکانی ئەو کات. دەقی شیعری دڵدار بەر هەمان گۆڕانکاری دەکەوێت. لە کاتێکدا زۆربەی شاعیرەکان لەو سەردەم بە هۆی پەیدابوونی هەستی ناسیونالیستی و چوونە ناو حیزبەکانی ئەو کات، دەقی شیعرەکانیان بۆ خزمەتی پەیامی ناسیونالیستی و نەتەوەیی دادەنا. کەواتە ئەم توێژینەوە لەو ڕوانگەیەوە لە دەقی شیعری دڵدار دەکۆڵێتەوە، شیعر وەکو پەیام دەبینێت.

**یەکەم: لاوی پیر:**

کاتێک دڵداری شاعیر بەراوردی نێوان تاکی وڵاتانی پێشکەوتوو و تاکی وڵاتی خۆمان دەکات، دەبینێت بەر دوو وێنەی زۆر جودا دەکەوێت. بە حوکمی ئەوەی سەردەمی شاعیر، سەردەمی بە ئاگاهاتنەوەی نەتەوەکانە، سەردەمی مافی نەتەوەییە، بۆیەیش هەموو نووسەران و شاعیران شیعر دەکەنە هۆکارێک بۆ ئەوەی هەستی تاک و نەتەوەیی لەلای لاوەکان زیندوو بکەنەوە. کەواتە جودا لەوەی شیعر

لێرەدا ئەرکێکی ئەدەبی هەیە، هاوکات ئەرکێکی نیشتمانیشی دەبێت. کەواتە شیعر لێرەدا دەبێت ڕەنگدانەوەی سەردەمەکەی بێت و لە خزمەت ئاریشە و دیاردەکانی سەردەم بێت. ((ئەو پەیوەندییەی شیعر بە کۆمەڵەوە دەبەستێتەوە، کە لایەنێکی گرینگی کێشەی هەڵوێستە لە قۆناغەکانی گۆڕان و پەرەسەندنی شیعردا، چەند بۆچوونێک دروست بووە، یەکێکیان لە چوارچێوە کۆمەڵایەتیەکەوە دەڕوانێتە شیعر کە پێویستە ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستەقینەی سەردەمەکەی خۆی بێت، خاوەنی ئەو بیروڕایەش لەو تیۆرەدا خۆیان دەدییەوە کە شیعریان بە ژیانەوە دەبەستەوە.)) [عەزیز، ٢٠٠٢ ، ل٢٢] کەواتە دەگەینە ئەو بڕوایەی یەکێک لە گرفتەکانی ئەو سەردەم لە کۆمەڵدا لە دیدی (دڵدار)دا، گرفتی نائاگایی و هەست بە بەرپرسیاریەتی نەکردنی لاوەکانە. کاتێک شیعری (لاوی کوردان) دەخوێنینەوە، ئەو بۆچوونەمان پشت ڕاست دەکاتەوە. لە تێڕوانینی (دڵدار)دا بەشیکی زۆری لاوی کورد خەریکی کۆمەڵێ کاری دیکەیە، کە ئەرکی ئەو نییە.

**ئەسلەحەی هەر میللەتێ سا دەست و بازووی گەنجیەتی**
**ڕۆژی شوعلە بەخشی ئومێد فکر و کاری گەنجیەتی**
**مەرهەمی زاموبرینی کردەوە و هەم ڕەنجیەتی**
**لاوی ئێمەش هەر لە دەوری مەی ئەکەن غیرەتکەشی**

[دڵدار، ٢٥٧٣، ل٢٦]

یەکێک لە ئاریشەکانی لاوی کورد ئەو کات، خووگرتنی بووە بە مەی، دیارە ئەمەیش لە ڕووی سیمیۆلۆژییەوە دەلالەتی خۆی هەیە. مەی دەلالەتی بوونی خەم و بێ ئومێدییە. کەسانێک بە هۆی بوونی خەم و ئازارێکی دەروونیی زۆرەوە پەنا بۆ مەی خواردنەوە دەبەن. دەبینین شاعیر مەی وەک بەشێک لە کولتووری کوردی تەماشا ناکات، نەک لەبەرئەوەی حەرام بێت، بەڵکو لەبەرئەوەی لاوەکانمان لە هەوڵ و تێکۆشان بۆ نیشتمان بە دوور دەخاتەوە. لاوەکانمان بێ ئاگا دەکات. ئەو گلەیی ئەوە لە لاوەکان دەکات، خوویان بە مەی خواردنەوە

گرتووە، کەچی لەناو کۆی میللەتانی دیکە هێز و بازووی پێشکەوتن و بەرگری لە نیشتمان هێزی لاوە، چونکە ئەوە لاوەکانن دەتوانن ببن بە چرا و نیشتمان ڕووناک بکەنەوە. شاعیر شیعر و بابەتەکانی شیعری دەخاتە خزمەت دیاریکردنی کێشەی لاو. ئەویش خووگرتنی لاوەکانە بە مەی خواردنەوە. خۆ تەریککردن لە کونجێکی مەیخانە دەلالەتی بێ دەسەڵاتی لاوی کوردە. شاعیر دەیەوێ لەو ڕوانگەیەوە لە خووگرتنی لاوان بە مەی بڕوانێت، کە ئەمە وزەی لاوان و گەنجان بە هەدەر دەدات و کاریگەری دەبێت لەسەر خاوکردنەوەی ڕەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵ. ئەمە ئەو جیهانبینییەیە، کە شاعیر بەرانبەر جۆرێک لە لاو، فۆرمێک لە لاو هەیەتی. لاوێکە، عەقڵێکی پیری هەیە، لاوێکە وزەیەکی پیری لە خۆیدا هەڵگرتووە. لاوێکە هەستی نیشتمانپەروەری لە ناخیدا هێندە لاوازە، گوێ بە خەمەکانی نیشتیمان نادات. شاعیر بانگەوازی لاوی کورد دەکات، کە واز لەو خووە بهێنێت. لەوێشەوە ((ئەندێشەی شاعیر بەرەو بانگەوازی میللەتی کورد دەڕوات، وێنەی ئازادی و نیشتمانی هاوشانە بە وێنەی پیشکەوتن لە لایەنی زانستی و هونەری و ئەدەبییەوە، چونکە ئەگەر میللەتێک هوشیار نەبوو ئەوا بێگومان ناتوانێ سەربەخۆیی بە دەست بهێنێ.)) [مەولود، ٢٠٠٩، ل١٣١] ئیشکردن لەسەر ئەو چینە گرینگەی کۆمەڵ هەوڵێکە بۆ دەرخستنی، یان بەراوردکردنی لاوانی ئێمە و ئەوان.

**میللەتێ گەر گەنجی سست بێ مردووە میللەت نییە**
**تاکو مابێ نێو دەروونی بێ جەفا و عیللەت نییە**
**شادمانی تەختی ژین و تاجەکەی عزەت نییە**
**لاوی کوردان هەر لە دەوری مەی ئەکەن غیرەتکەشی**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل٢٠٣]

دروستکردنی پێوەندی، یان بەستنەوەی هێزی لاو بە مانی میللەت هەوڵێکە بۆ نیشاندانی ئەو وێنەیەی لاوان بزوێنەری کۆمەڵن. هەر میللەتێک لاوەکانی خەون و تێکۆشانیان نەبێت، ئەوا ئەو میللەتە

مردووه. کەواتە بەستنەوەی بێ هێزی میللەت بە بێ هێزیی لاوەکان، خوێندنەوەیەکی سۆسیۆلۆژیانەیە، چونکە لاو چینێکی بەهێزی ناو کۆمەڵە، گڕی شۆڕشە. کەواتە بوونی میللەت بە بوونی لاوەکانەوە بەستراوەتەوە. پێشمەرجی بوونی میللەت بوونی لاوەکانە، چالاکبوونی لاوەکان وزە و داهێنان بە میللەت دەبەخشێت. بۆ ئەوەی میللەت وێنەیەکی زیندوو بە دەرەوە بدات، دەبێت لاوەکان خاوەن پڕۆژە بن. وەکو لاو نەک پیر ڕەفتار بکەن. سستبوونی لاو وەکو نەخۆشییەکە لە هەناوی میللەتەوە بێت، دەبێت ئەو نەخۆشییە ڕێگری لێ بکرێت، دەنا میللەت لەناو دەبات. شاعیر ئەو پەیامە بە گوێی خوێنەردا دەدات، لاوەکانمان کەسانێکن بە هوشیاری و ڕۆشنبیرییەوە هەوڵی تێکۆشان نادەن. بەڵکو کەسانێکن خۆیان بە کۆمەڵێ شتی کات بەسەربردن خەریک کردووە. ئەو کات سەردەمی هەستانەوەی میللەتان بوو، سەردەمی هەوڵدان بوو بۆ سەربەخۆیی و ڕزگاری. بە بڕوای شاعیر وەکو تێزێک ئەمە ئەرکی لاوە، نەک کەسانێکی دیکە، چونکە کاتێک تەماشا دەکات لاوی هەموو میللەتان خەریکی تێکۆشانن. بۆ نموونە شۆڕشەکانی لیبیا، جەزائیر...تاد. سەردەمی ئەوەیە میللەتان بە ڕووی داگیرکەراندا تێکۆشان بکەن.

**سەیری ئەحواڵی وەتەن کەن چۆن زەبوون و مردووە**
**سەیری کاری دوژمنان کەن چی بە حاڵی کردووە**
**سەیری ڕەشماڵی زەلالەت ئاسمانی گرتووە**
**ئێوە تاکەی هەر لە دەوری مەی ئەکەن غیرەتکەشی**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل٢٠٤]

کاتێک لاوانی هەر میللەتێک بێ پڕۆژەی مەعریفین، بێ خەونن، خەمی نیشتمان و نەتەوەیان نییە، میللەت زەرەرمەندی یەکەمە. نیشتمان دەبێتە قوربانی یەکەم. دەبینین ئەو هەستە ڕۆمانسییەی، کە دەگوترێت لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بەسەر شیعری کوردیدا زاڵ دەبێت، لە لای (دڵدار) ئەم هەستە ڕۆمانسییە لە شیعرە

نیشتمانییەکانیدا زۆر کاڵ دەبێتەوە. هەر لەم ڕوانگەیەوەیش شاعیر هەوڵدەدا لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە حیزبی هیوا دامەزرێنن. بە بڕوای من شاعیر لەم قۆناغەدا گەیشتووە بەو بڕوایەی چیدی دەستەوەستان نەوەستین و تەنێ بە هەست و دەروون هانی خەڵک بۆ تێکۆشان بدەین، بەڵکو دەبێ بە کردار و لەناو خەڵک بین. ((لەگەڵ بوونی حیزبی شیوعی عێراقدا، حیزبێکی تر هەبوو کە کاریگەری زۆری بەجێهێشتبوو لەسەر بیرکردنەوە و خەباتکردنی کورد، بەتیابەتی کە پارتێکی کوردستانی بوو ئەویش (حیزبی هیوا)یە، کۆمەڵەی (دارکەر) بە سەرۆکایەتی شاعیری لاو (دڵدار) دامەزراوە و دواتر بۆتە بناغەی دامەزراندنی (حیزبی هیوا) کە لە ساڵی ١٩٣٧ دامەزراوە و (ڕەفیق حیلمی) بە سەرۆکی حیزبەکە دانراوە، دڵدار کاتێک دەچێتە حیزبەکەوە ئیتر وەک شاعیری کرێکاران و جووتیاران دەردەکەوێت و بڕوای بە خەباتی چینایەتی دەبێت.)) [قادر، ٢٠١٠، ل٦١] کەواتە شاعیر چیدی باوەڕی بە خەباتی ڕۆمانسییانە و کڕووزانەوە نابێت، بەڵکو بە کردار دەچێتە ناو خەباتی تێکۆشان بۆ ئەوەی لەگەڵ چینەکانی ناو کۆمەڵ هەوڵی هێنانەدی خەونەکانی نیشتمان بدات. کەسێک بووە زۆر پێداگری لەسەر خەباتی چینایەتی کردۆتەوە، بۆیەیش بەردەوام لە شیعرەکانیدا چینەکانی وەکو: لاوان، کرێکاران، جووتیاران دەردەکەون و بە شیعر دیالۆگیان لەگەڵ دەکات. ئەو خەبات دەگوازێتەوە ناو خەڵک. ئەو شیعر دەکاتە ڕەنگدانەوەی حەز و خولیا و ئازارەکانی خەڵک. بۆیەیش کاتێک وێنەیەکی ڕیالیزمیانەمان لەبارەی لاوانەوە بۆ دەکێشێت، ئێمەی خوێنەر دەزانین یەکێک لە ئازارەکانی میللەتی کورد کەمتەرخەمی لاوەکانی بووە. ئەو هانی لاوان دەدات خۆیان بۆ خەباتی چینایەتی ئامادە بکەن، دوور بکەونەوە لە کات بەسەربردن. شاعیر وێنەیەکی واقیعی لاوانمان نیشان دەدات، بۆ ئەوەی ئەرکی لاومان بۆ دەستنیشان بکات. بە بڕوای ئەو نەگەیشتن بە ئامانجی ڕزگاری نەتەوەیی بۆ سستبوونی لاوەکان لە خەبات دەگەڕێتەوە. لە ئەنجامدا ئەرکی لاو لە شیعرەکەدا دیاری دەکات.

**میللییەت یەعنی لە زڕەی تۆق و زنجیر ڕاپەڕی**
**تەوقی یەخسیری لە ئەستۆی خۆت و میللەت لابەری**
**بێیە سەرخۆت و بزانی تۆ لە ڕێگا لادەری**
**هەڵسی ئینجا بەس لە دەوری مەی نەکەی غیرەتکەشی**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل٢٠٥]

دانیشتن لە کونجی ژوورێکی تاریک و خۆتەریککردن و چاوەنۆڕی هاتنی فریادڕەس و ئیلهام نابێتە جێگرەوەی واقیع. دەمەوێ بڵێم شاعیر چیدی خۆی بەو هەستە ڕۆمانسییەوە خەریک ناکات. دانیشتنی لاوان بە دیار پێکێک عەرەقەوە، بە دیار مۆمێکەوە لە ژوورێکی تاریک، ناتوانی ئەو واقیعەی هەیە بگۆڕێت. بۆیەیش دەبێت لاوان هوشیاربنەوە. شاعیر هۆکاری ئەو نائاگایی و ناهوشیارییە بە گوێی لاواندا دەدات. ئەوەی جێی سەرنجە شاعیر خەباتی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕی بە تاکە ئەرکی لاوان دادەنێت. بەڵام کاتێک دەبینێت لاوان ئەو ئەرکەی خۆیان جێبەجێ ناکەن. دێت هۆکاری پیربوونی هەستی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕیی لاوانمان بۆ باس دەکات. لاوی پیر لاوێکە نائاگایە لەوەی وەکو کۆیلەیەک زنجیری کراوەتە مل، ئەگەر ئەو لاوە خۆی بە نەتەوەیی دادەنێ دەبێت ئەو زنجیرە بپسێنێت. ئەوە ئەرکی لاوە ئەو تەوقە لە ملی خۆی و میللەتەکەی بشکێنێ. ئەوە ڕێ ڕاست و دروستەکەیە. ئەگەر نا خۆ خزاندنە کونجی مەیخانە و دانیشتن بە دیار شووشەی عەرەقەوە زیادتر مرۆڤ زەلیل و کۆیلە دەکات. لێرەدا شاعیر ئەو پەیامە بە لاوان دەدات، کە ئەرکی ئەوان هەوڵ و تێکۆشانە، دۆزینەوەی ڕێی خەباتە، کە دروستترین ڕێیە بۆ گەیشتن بە ئازادی و ڕزگاری نیشتمانی.

**دووەم: خەونی لاو:**

کاتێک باسی خەونی لاو دەکەین، مەبەستمان لە خەون بە واتا ڕۆمانسییەکەی نییە، مەبەستمان بوونی ئاوات و بەرنامەیەکە بۆ ئەوەی

خەبات و تێکۆشانی لە پێناودا بکات. کاتێک دەڵێین میللەتێک خەونی ڕزگاری یەکجاری و سەربەخۆیی هەیە، بەو واتایە دێت، کە ئەو میللەتە ئامانجێکی هەیە و لە ئێستادا خەباتی بۆ دەکات. تاکە شوێن بۆ هێنانەدیی ئەو خەونە مەیدانی تێکۆشانە، کۆڕی خەباتە. شاعیر پەیامێک بۆ لاوان دەنێرێت، بۆ ئەوەی هەوڵ و کۆشش بدەن و خەونیان هەبێت. شاعیر وەکو کەسێکی نەتەوەیی تاکە خەون خەونی ڕزگارییە لە ڕێی خەبات و تێکۆشانەوە. ئەویش چاو لە کۆی نەتەوەکانی دیکە دەکات، کە لە ڕێی خەباتەوە دەیانەوێت بە ئامانجیان بگەن. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لە لای من، لە هێندێ شیعردا (دڵدار) باسی چینایەتی و پاڵپشتی چینی جووتیار و دژ بە دەرەبەگ دەوەستێ، کەچی لە هێندێ شیعری دیکەدا وەکو کەسێکی نەتەوەیی و ناسیونالیست دەردەکەوێت. ئەم دوو هەڵوێستە لەگەڵ یەکدی نایەنەوە.

**ئەرێ ئەی لاو لە هیچ وەختێ نەکەی مەئیووسی ژینت بێ**
**دەبێ هەردەم عەزمدار و دەوای دەرد و برینت بێ**
**لە مەیدانی تەقەدومدا تەلاش ئەسپی نەجاتت بێ**
**لغاوی ئەسپەکەت فکر و علم و ئاوزینگ و زینت بێ**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل١٧٥]

کاتێک باس لە هەڵوێستی نەتەوەیی دەکەین، هاوکات باس لە ئەدەبی نەتەوەییش دەکەین. واتە ئەدەب دەخرێتە خزمەتی نەتەوەوە، بە پێچەوانەی ڕەوتی سۆشیالیزمەوە، کە بە شێوەیەکی گشتگیر تەماشای ئەدەبی گەلان دەکات. شاعیر ڕووی پەیامی لە لاوانە، ئاراستەیان دەکات بۆ خەبات و تێکۆشان لە مەیدانی ژیاندا، بۆ ئەوەی وەکو هەموو نەتەوەکانی دیکەیش نەتەوەی کورد پێشبکەوێت. بۆیەیش داوایان لێ دەکات هەرگیز نائومێد نەبن. بۆ ئەوەی بگەنە ئاستی نەتەوە پێشکەوتووەکانی دنیا دەبێ لە بواری فیکر و زانستدا خۆیان تەیار و دەوڵەمەند بکەن. ئەم بۆچوونەی شاعیر لەوێوە هەڵقوڵاوە، کە دەبینێت لاوانی وڵات زۆر نائومێدن، ئەم بارودۆخە کۆمەڵایەتییە کاریگەری

لەسەر پرۆسێسەی داهێنانی شاعیر دەبێت و شیعر دەنووسێت. ئەو نایەت وەکو شاعیرانی دیکە خۆی دوور بخاتەوە و خۆی لاتەریک بکات. بەڵکو لە هەناوی کۆمەڵ و خەڵکی خۆیەوە دەژیت. لەگەڵ ئازار و کێشەکانیان تێکەڵ دەبێت. ((خۆ تەریک کردن و دوورەپەرێزی بە بیانووی بە دەستهێنانی ژیانێکی ئاسوودە و کامەران، گیانی داهێنان لای شاعیران و نووسەران دەکوژێت و دووچاری دەردی کورتبینییان دەکات، بە شێوەیەک ناتوانن واقیعبینانە ژینگەی خۆیان بخوێننەوە، کاتێک داهێنەر و وردبینانە لە دیاردەکانی دەوروبەر دەڕوانێت.)) [ساڵح، ٢٠١٢، ل١٢٩] شاعیر بۆ ئەوەی بتوانێت جیهانبینی دەقی شیعری بەرانبەر نەتەوە و دیاردەکانی ناو کۆمەڵ دابڕێژێت دەبێت لەناو کۆمەڵدا بژیەت. بۆ ئەوەی هەست بە ئازارەکانیان بکات، بۆ ئەوەی هەر کاتێک ویستی وێنەیەکی شیعری پێشکەش بکات، بە هونەریترین شێوە و کاریگەرترین شێوە پێشکەشی بکات. هێندەی من لە شێعرەکانی ئەم شاعیرە ڕاماوم، زۆرترین فۆکسی لەسەر چینی لاوە، شیعری لە مەسەلەی چینی کرێکار و جووتیار هەیە، بەڵام ئەوەی بەردەوام لە شیعرەکانی جەختی لەسەر دەکاتەوە لاوە.

**بە گوڕ تۆ بێیە مەیدان و حقوقی گشتی داواکەی**
**بە یادی نەوجەوانانی شەهیدان گیانی بەرپاکەی**
**بە تیشکی حەق خوراوی کورد دڵی تاریکی ڕووناک کەی**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل١٩٤]

شاعیر ئەرکێک دەخاتە ئەستۆی لاوان، ئەویش هاتنە مەیدان و سەندنەوەی مافی گشتییە لە دەسەڵات، لە داگیرکەر. یەکێک لەو خەونانەی شاعیر دەیەوێت لە میشک و دڵی لاوان بیچەسپێنێت، خەونی شەهیدبوونە. بۆیەیش ئەو شەهیدبوونە بە پیرۆز دەکات، چونکە لەپێناو خاک و میللەتدایە. هەوڵێکە بۆ ورووژاندنی لاوان. ئەگەر هاتوو لاوان بە گوڕ بێنە مەیدان ئەوا دەتوانن گۆڕانکاریی گەورە دروست بکەن. ئەم هاتنە مەیدانە هەوڵێکە بۆ شکۆمەندبوون. چونکە تاکو لەژێر دەستەییدا

بــن، ئەوا نــاتوانن پرۆسێســەی ئازادییەکانیــان بــکەن. ئەوەی هێــزی تێپەڕانـدنی واقیعـی داگیرکـاری هەیە، ئەوا هێـزی لاوانە. بـۆ ئەوەی بە سـەندنەوەی مـافی گشـتی و خەڵـک، دڵـی مـیللەت خـۆش بکـات. ئەو تاریکییە بڕەوێنێتەوە، کە باڵی بەسەر دڵی داگیرکراوی کورددا کێشاوە. شـاعیر دەیەوێـت گیـانی ڕووبەڕووبـوونەوەی داگیرکـاری نیشـتمان لە گیـانی لاوان بچێنێـت. هەر لە ڕێـی ئەم شـیعرەوە دەتـوانین واقیعـی کـۆمەڵایەتی ئەوکـاتی کـورد بخـوێنینەوە. لێرەوە دەزانـین شـاعیرانمان چەندە تێکۆشاون بۆ ئەوەی لاوان هوشیار بکەنەوە. بۆ ئەوەی لە ڕێی ئەو هێزەی نـاوی لاوە بونیـادی کۆمەڵایەتی و سیاسـی بگۆڕن. دیـارە سەندنەوەی مافی گشتی و میللەت بێ قوربانیدان نابێت.

**لاوی کورد هەڵسانە سەر پێ وەک دلێر**
**سا بە خوێن نەقشی ئەکەن تاجی ژیان**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل١٧٤]

وەکــو پێشــتر ئاماژەمــان بــۆ کــرد، لە دوای جەنگــی یەکەمــی جیهــانییەوە، بە هــۆی ئەو بــارودۆخە سیاســی و کــۆمەڵایەتییەی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتی گرتبـوویەوە. بـاری ژیـان زۆر خەراپ بـوو، بەتـایبەتی لە بەتـاڵان بردنـی سـامان و کوشـتنی خەڵـک لەلایەن سـوپای عوسمانی و ڕووس، کە بە ساڵی گرانییەکە ناسـرابوو. ئیدی بەرە بەرە شاعیران و نووسـەران لـە هەوڵـی هانـدان و هوشـیارکردنەوەی میللەتـی کـورد بـوون. بە شـیعرەکانیان هەسـت و خەم و پەژارەی خۆیـان بـۆ نەتەوە و نیشــتمان دەردەبــڕی. ئەم شــیعرە ئەرکــی بڵاوکــردنەوەی خۆشەویستی و هاندانی لاوی کوردە بۆ ڕاپەڕین. بۆ ئەوەی لە دەست ستەم و داگیرکاری ڕزگاری بێت. هاوکات خەمی شاعیر بەرانبەر وڵات و نیشتمان نیشان دەدات. ئەو دێت ئەو خەونە لە کن لاوەکان دروست دەکـات، دەبـێ ئەوان  لە تێکۆشـان بـۆ نیشـتمان و خـاک بەردەوام بـن. لێــرەوەیە لە ڕووی هەســتی نیشــتمانییەوە شــاعیر بە نــاو نــاخی کۆمەڵەکەیدا شۆڕدەبێتەوە، بۆ ئەوەی وێنەی ئێش و ئازارەکانی کۆمەڵ

بگرێــت. شــاعیر هەمــوو ئەمــانە ((لە چوارچێــوەی ئیــدیۆلۆجییەتی پێشـکەوتوودایە بـۆ چـاککردنی بـاری ژیـانی کـورد وەکـو نەتەوەیێکـی دەسەڵاتی لە دەس خۆی نییە.)) [خەزنەدار، ٢٠٠٥، ل٥٤٠] هاندانی لاوان بـۆ خەبات، بە مەبەستی پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی لەناو چینێکی گەورەی وەکو لاوان هەیە. بۆیەیش بەردەوام ڕووی پەیامی ئاراستەی لاوانە، بۆ ئەوەی لە ڕووی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە چییان لەسەر شانە ئەنجامی بـدەن. نەک خۆیـان بە کـاری مەینۆشـی خەریـک بـکەن. بە لای ئەوەوە ئەمە کارێکی خەراپە. هەوڵی شاعیر بۆ ئەوەیە بتوانێت هانی لاوان بدات بـۆ ئەوەی خەونـی گۆڕانکارییـان تێدا دروسـت بکـات. خەونێـک بەرەو دوارۆژێکـی پرشـنگداریان ببـات. هەوڵ بـدات هەسـتی خۆشویسـتنی نیشــتمان و نەتەوەیــان لە لا دروســت بکــات. بــۆیەیش لە زۆربەی شیعرەکاندا شاعیر شانازی بە لاوانەوە دەکات. ڕووی پەیامی شاعیر لە لاوانە بۆ ئەوەی شیعر ببێتە پێشەوای لاوان و جەماوەر.

**ئەی برا لادە لە فکری کۆن و زوو سا ڕاپەڕە**
**کارەکەت چا ڕێک بخە، ڕەنجت هەبێ خۆی چا ئەبێ**
**مردنە ژینت بەبێ کاری، لە سستی لابدە**
**هەر بە ڕەنجی لاوی وەک تۆ، نیشتمان ئاوا ئەبێ**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل١٧٦]

نوێکردنەوەی لاوان لە ڕووی فیکر و ئایدیۆلۆجییەوە هەوڵێکە بـۆ ئەوەی گۆڕانکـاری ڕیشـەیی لە عەقڵیەتـی لاوان دروسـت بـکەن. شـاعیر دەیەوێ ســەرلەهەوەڵ لە ڕووی تیــۆرییەوە لاوانمــان ئامــادە بکــات. ئەویــش بە دەرچــوون لە عەقڵــیەت و بــاری دواکەوتــوویی ســەردەم. چونکە تـاکو لاوان لەژێر کـاریگەری بـاری دواکەوتوویی دابونەریت و بنەما کۆنەکانی کۆمەڵدا بن، نـاتوانن لەو قـاڵبەی کـۆن دەرچـن. بۆیەیش شاعیر وەکو پەیامدارێک هەستی بە باری دواکەوتوویی لاوان کردووە، بــۆیەیش دەیەوێــت خەڵکــی و لاوان بە نــاوەڕۆکی نەتەوەیــی و نیشتمانییەوە هان بدات. ئەویش پێویستە لاوان کار بکەن، ڕەنج بۆ ژیان

خەرج بکەن. بۆیەیش سیماکانی شیعرە نیشتمانییەکانی (دڵدار) تایبەتە، چونکە ئەو کەسێک بووە، چەندین قۆناغی خوێندنی بڕیوە، هاوکات بە نووسینەکانیدا دیارە ڕۆشنبیرییەکی فراوانی هەبووە و ئاگەداری ئەدەبیات و ڕۆشنبیریی نەتەوەکانی دیکە بووە. کاتێک ئەو بەراوردەی کردووە لەنێوان لاوانی کورد و نەتەوەکانی دیکە. بەو ئەنجامە گەیشتووە، ئەنجامی باری دواکەوتوویی میللەتی کورد، دەگەڕێتەوە بۆ دواکەوتوویی لاوانی کورد. لێرەدا شاعیر داوا لە لاوان دەکات، ڕەنج و تێکۆشان بدەن، مەبەستی ئەوەیە بە هەوڵ و کۆشش و ڕەنجی شانیان دەتوانن نیشتمان ئاوەدان بکەنەوە. نیشتمان لە دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی و ئابووری ڕزگاری دەبێت. کەواتە لاوان دوو ئەرکیان لەسەر شانە. یەکیان ئەوەیە خەبات و تێکۆشان لە ڕووی سیاسی و شۆڕشگێڕییەوە بکەن بۆ ئەوەی خاک و وڵات لەژێر چەپۆکی داگیرکەراندا ڕزگار بکەن، تاکو ئازادی سیاسی و نەتەوەیی دەست بخەن. لەلایەکی دیکەوە دوای هەر خەبات و تێکۆشانێک نیشتمان پێویستی بە ئاوەدان کردنەوەیە. شاعیر هەردوو خەباتەکە وەکو یەک دادەنێت، پێیوایە هەردووکیان هێندەی یەکدی گرینگن، چونکە هەردووکیان خزمەت بە نیشتمان دەکەن و یەکدی تەواو دەکەن. هەموو ئەمانە هەوڵێک بوون بۆ ((کارکردن لەپێناو بەجێگەیاندنی ئاواتەکانی میللەتی کورد و بە دەستهێنانی سەربەخۆیی، دەربڕینی خۆشەویستی بۆ نیشتمان.)) [باڵەکی، ٢٠٠٥، ل٢٥٩] دەبینین خەباتکردن بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵات چی لە خەباتکردن بۆ ڕزگارکردنی وڵات کەمتر نییە. کارکردن لە هەر بوارێک لە بوارەکانی ژیان، هەوڵێکە بۆ خزمەتکردن بە وڵات و نەتەوە.

لاوان لە ئەنجامی پەروەردەکردنیان بۆ ئەوەی خەونی خزمەتکردن بە نیشتمان و وڵاتیان هەبێت لەلایەن شاعیر و نووسەرانەوە دەبێ هان بدرێن. (دڵدار) وەکو شاعیرێک لە سەردەمی خۆی هەستی بە کێماسی ئەو لایەنە کردووە، بۆیەیش بەردەوام لە ڕێی

شـیعرەکانییەوە پەیـامی خزمەتکردنـی بە نیشـتمان بە دوو ئاراسـتە و جۆر دەربڕیـوە. یەکیـان خەبـاتکردن بـۆ ڕزگـارکردنی نیشـتمان لەژێـر داگیرکاری، دووەمیان خزمەتکردنی نیشتمان لە ڕێی کارکردن. ئەمەیش هەوڵدانە بۆ دروستکردنی ئەو هوشیارییەی شاعیر هەوڵی بۆ دەدات، بۆ ئەوەی لاوان بەردەوام بە کارکردن خزمەت بکەن.

**سێیەم: لاوانی ئێمە و ئەوان:**

(دڵدار) شاعیر و ڕۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی بوو. کەسێک بوو ئاگەداری ڕۆشـنبیریی میللەتـانی دەوروبەر و جیهـانی بـوو. بە بەڵـگەی ئەوەی ئەو نووسینانەی لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە شایەدی ئەو راســـتییە دەدەن. خـــوێنەرێکی هوشـــیار بـــووە. لە زۆربەی نووسینەکانیدا دەردەکەوێت پشتی تەواوی بە سەرچاوەی زانستی بۆ ســەلماندنی بۆچوونەکـانی بەسـتووە. بە پشتبەسـتن بەو ڕۆشـنبیرییە فراوانەی شاعیر لە ڕێی شیعرەکانییەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، شـاعیر بـۆ ڕوونکـردنەوە و پەیڤـین لەبـارەی چەمکـی لاوەوە دوو جیهانبینیمـان پێشـکەش دەکـات. ئەو دێـت لە ڕێـی بەراوردی لاوانـی نەتەوە پێشکەوتووەکانی دنیا بە لاوانی کورد، جیهانبینیی خۆیمان بۆ چەمکی لاو دیاری دەکات. ئەم بەراوردە بۆ ئەوەیە پتر هوشیاری لە کن تاکی کورد دروست بکات.

**سەیری ناکەن لاوی غەیرە گشتی بازووی قووەتن**
**گشتی سوودبەخشی وڵات و مەرکەزی سەد هیمەتن**
**بۆ بەجێ هێنانی کاری چۆن لە ڕێگەی میحنەتن**
**عەیبە چیتر بەس لە دەورەی مەی مەکەن غیرەتکەشی**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل٢٠٤]

لەم پـارچەیەدا بەر چەنـد وشـەیەک دەکەوین، ئەو وشـانە دەبنە شادەماری بەراوردەکە. (بـازووی قـووەت) یـان هێـزی بـازوو چەمکێکـی ئایدیۆلۆجییە. مەبەست لێی بازووی کرێکارە. واتە ئەم چەمکە چەمکێکە

مەبەستێکی چینایەتی لە پشتە، لێرە دەزانین شاعیر چۆن بە ناراستەوخۆ ئایدیۆلۆجیای خۆی دەخزێنێتە ناو ئەو پەیامەی دەیەوێ بە لاوانی بگەیەنێت. هێزی بازوو هێزێکە دەبێت سوودی بۆ هەمووان هەبێت، نەک بۆ چینێکی دیاریکراو. دەبینین شۆڕشی کرێکاران لە ڕووسیا و پێشتریش تێزەکانی مارکس هەر لەو بارەیەوە بوون، کە نابێت هێزی کرێکار تەنێ بۆ بەرژەوەندیی چینێکی دیاریکراو بێت، بەڵکو دەبێت هەمووان سوودی لێ وەرگرن. هەموو هێزەکە بۆ خزمەتکردنی نیشتمانە، بۆ خزمەتکردنی هەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵە. لێرەدایە پێوەندیی نێوان ئەدەب و کۆمەڵ پتر ڕوون دەبێتەوە. کەواتە ((ئەدیب ڕۆڵی گەیەنەرێک دەبینێت.)) [ساڵح، ٢٠١٢، ل٦٠] شاعیر خۆی ناخاتە دەرەوەی چوارچێوەی کۆمەڵ، بەڵکو هەوڵدەدا لە ڕێی ئەدەبەکەیەوە سوود بە لاوان بگەیەنێت. ئەو وێنەیە نیشانی لاوانی کورد بدات، کە لاوانی دنیا چۆن لە ڕێی هێزی بازوویانەوە دەتوانن گۆڕانکاری گەورە دروست بکەن. وشەکانی (مەرکەزی سەد هیمەتن) لاوان ناوەندی هەوڵ و تێکۆشانن، واتە خەبات بە لاوانەوە دەبەستێتەوە. کەواتە پێشکەوتنی وڵات لەسەر هێز و توانای ئەوان وەستاوە.

**سەیری ناکەن چەند بەتینە دەستی لاوی غەیرە وا**
**بێت و قینی هەڵسێ و کولە مشتی لێ بدا**
**وا لە ترسانا ئەلەرزن گاوی گەردوون و سەما**
**لاوی کوردان بەس لە دەورەی مەی ئەکەن غیرەتکەشی**

[علاءالدين، ١٩٨٥، ل٢٠٤]

شۆڕش و گۆڕانکاریی لەسەر دەستی لاوان دەبێت. شاعیر نموونەی لاوانی جیهانمان بۆ دەهێنێتەوە و بەراوردی بە لاوانی کورد دەکات. پێمان دەڵێت تەماشا بکەن لاوانی دنیا بە هۆی شۆڕش و خەباتیان توانیویانە چەندین گۆڕانکاریی سیاسی و ڕۆشنبیریی گەورە لە وڵاتەکانیان دروست بکەن. دیارە شاعیر پتر مەبەستی ئەو وڵاتانەیە،

کە ئایدیۆلۆجیای چەپ و پرۆلیتاریای تێدا زاڵە. شاعیر داوای ڕاپەڕین و شۆڕش لە لاوانی کورد دەکات. وێنەی لاوانی جیهان بە خوێنەر نیشان دەدات، هاوکات وێنەی لاوانی کوردمان نیشان دەدات، کە بە دیار شووشەی عەرەقەوە دەستوپێ سپی دانیشتووە. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ((دەبینین کە خاڵەکانی بزواندنی لاوان بۆ شۆڕشکردن زیاتر فاکتەرە چینایەتییەکانە نەک فاکتەرە نەتەوایەتییەکان.)) [قادر، ٢٠١٠، ل١٤٤] هەرچەندە خاڵی بزواندنەکە لەنێوان هەستی نەتەوایەتی و چینایەتیدا تێکەڵاوە، بەڵام لە کۆی فەزای شیعرەکەدا فاکتەرەکانی بزواندنی لاوان فاکتەرە چینایەتییەکەیە. ئەوەی من لە شیعرەکانی ئەم شاعیرەدا تێبینی دەکەم، ئەو بیرکردنەوە و ئایدیۆلۆجیای چەپ و بابەتی کرێکاری بۆ خزمەتی بابەتی نەتەوەیی بە کار دەهێنێت. ئەو نایەت نەتەوە و بابەتە نەتەوایەتییەکان بکاتە قوربانی ئایدیۆلۆجیا. واتە شاعیر ئایدیۆلۆجیا دەخاتە خزمەت بابەت و کێشە نەتەوایەتییەکان.

**لاوی غەیرە دێنە سەرخۆ جانفیداکاری ئەکەن**
**بۆ ژیانی نیشتمانیان گشتی خوێنکاری ئەکەن**
**جا لە بۆ فەوتانی دوژمن ڕاوی ئەغیاری ئەکەن**
**عەیبە ئێوەش هەر لە دەورەی مەی مەکەن غیرەتکەشی**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل٢٠٤]

لەم پارچەیەدا پتر ئەو بۆچوونەی سەرەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، خۆکردنە قوربانی خاک و نیشتمان بێگومان. خستنەخزمەتی ئایدیۆلۆجیا بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی لەو کاتدا شتێکی تازە بووە. هێندەی من ئاگەدار بم و خوێندبێتمەوە قۆناغی دوای دڵدار کۆی شاعیرە چەپەکان، ئەمەیان ڕەت کردۆتەوە و کاریان بۆ نەکردووە. بەراوردی دڵدرا بۆ ئەوەیە پێمان بڵێت، خەمی خاک و نەتەوە دەبێ لە پێش هەموو خەمێک بێت. هەموو خەمی شاعیر ئەوەیە لاوان تەیار و ئامادە بکات، بۆ ئەوەی مافی نەتەوەیی بەدەست بهێنن. بۆیەیش زۆر جار نموونەی لاوانی دنیامان بۆ دەهێنێتەوە. بە لاوانی کورد دەڵێت،

لاوانی دنیا ئامادەن خۆیان بکەنە قوربانی خاک و نیشتمان، بۆ ئەوەی دوژمن لە خاک و وڵاتیان دەربکەن، ئامادەن هەموویان بکوژن، ئەی لاوی کورد تۆ تا کەی بە دیار خۆتەوە دادەنیشیت. ئەو پەیامەیش دەدات، کاتێک حاڵی لاوەکانمان وەها بێت، ئەوا:

**سەیری ئەحواڵی وەتەن کەن چۆن زەبوون و مردووە**
**سەیری کاری دوژمنان کەن چی بە حاڵی کردووە**
**سەیری ڕەشماڵی زەلالەت ئاسمانی گرتووە**
**ئێوە تاکەی هەر لە دەورەی مەی ئەکەن غیرەتکەشی**

[علاءالدین، ١٩٨٥، ل٢٠٤]

کاتێک لاوانی کورد خەریکی مەینۆشین، ئەوا شاعیر وێنە و دیمەنی نیشتمانمان نیشان دەدات. ئەو نایەت وێنە و حاڵی چینەکانی ناو کۆمەڵمان نیشان بدات، هەرچەندە کۆمەڵێ شیعری هەن، کە باس لە ئازار و مەینەتی چینی جووتیار دەکەن، وەکو شیعری (لالەباس، تووتنەوان)، بەڵام ئەوەی لێرەدا بەرچاو دەکەوێت، هەوڵێکە بۆ خەمێکی گەورەتر لە خەمی چینایەتی، ئەویش خەمی وڵاتە، خەمی خاک و نیشتمانە. بۆیەیش داگیرکاری نیشتمان و خاک دەخاتە ئەستۆی لاوەکان، چونکە ئەوان خەمی خاکیان نییە. بۆیەیش دوژمنان دەتوانن بە ئاسانی خاک داگیر بکەن. مافی گشتی پێشێل بکەن و ئەو میللەتە ببێت بە کۆیلەی داگیرکەران.

**ئەنجام:**

١. لاو بناغەی هەموو کۆمەڵێکە، بە گەڕخەری هەموو گۆڕانکارییە سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانە. کەواتە لاوان هەمیشە سەردەستەی شۆڕشە کلتووری و سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانن. بۆیەیش ئامانجی زۆرێک لە شۆڕشەکان قڵپکردنەوەی تێڕوانین و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی تازەتر و ڕادیکاڵانەتر دابڕێژێتەوە.

٢. هەمیشە لە کۆمەڵی ترادیسیۆنیدا وەها تەماشای لاو دەکرێت، کە هێشتا عەقڵی تەواو گەشەی نەکردووە، کەسێکە ناتوانێت بە تەواوی بڕیار بدات. سنووری نێوان لاو و هەرزەکار تێکەڵ بە یەکدی دەکرێت. لاوەکان بە کەسانێکی هەڵەشە و پێنەگەیشتوو دادەنرێن.

٣. جیهانبینیی دڵدار بۆ چەمکی لاو فرە ڕەهەندە، لە ڕێی کۆمەڵێ ڕەهەندەوە ناسنامەی لاوی کوردانمان بۆ دیاری دەکات. ناسنامەی لاوێکمان نیشان دەدات، بە تەمەن لاوە، بەڵام بێ پڕۆژەیە. ناتوانێ سوود لە وزەی لاوێتی وەرگرێت و هوشیاریی بەرانبەر دیاردەکانی کۆمەڵ نییە، بۆیەیش بە لاوی پیر دەستنیشانمان کرد.

٤. یەکێک لەو ئەرکانەی شاعیر لە ڕێی شیعرەکانییەوە جێبەجێی دەکات، دروستکردنی خەونە لە کن لاوەکان. لاوەکان بۆ خەبات و تێکۆشان هان دەدات. هوشیاریی ئایدیۆلۆجی و نەتەوەیی پێشکەش دەکات.

٥. دڵداری شاعیر یەکێکە لەو شاعیرانەی بۆ هاندانی لاوان بۆ شۆڕش فاکتەرە چینایەتی و ئایدیۆلۆجییەکان لەگەڵ فاکتەرە نەتەوایەتییەکان تێکەڵاو دەکات، هەرچەند هەست بەزاڵبوونی فاکتەرە چینایەتییەکان دەکەین، بەڵام بابەتە نەتەوایەتییەکان ناکاتە قوربانی ئایدیۆلۆجیا و بیرکردنەوەی چینایەتیی خۆی.

## سەرچاوەکان

**کتێبی کوردی:**


١. باڵەکی، یادگار رەسووڵ، ٢٠٠٥، سیماکانی تازەکردنەوەی شیعری کوردی (١٨٩٨- ١٩٣٢)، وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر.

٢. پیربال، فەرهاد (د.)، ٢٠٠٦، زمانی حەیزەران، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی.

٣. چەند نووسەرێک، ٢٠١١، چەند تێکستێکی وەرگێڕاو، و: ڕێبین هەردی، بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان، سلێمانی.

٤. خەزنەدار، مارف (د.)، ٢٠٠٥، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، دەزگای ئاراس، هەولێر.

٥. دڵدار، دیوانی دڵدار، ٢٥٧٣ کوردی، کۆکردنەوەی: گیوی موکریانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی کوردستان، هەولێر.

٦. ساڵح، ئاوارە کەماڵ، ٢٠١٢، ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و پراکتیزەکردنی لە شیعرەکانی گۆراندا، ئەکادیمیای کوردی، هەولێر.

٧. سیوەیلی، ڕێبوار، ٢٠٠٨، نەتەوە و حەکایەت، بەرگی یەکەم، دەزگای موکریان، چاپی دووەم، هەولێر.

٨. عەلی، بەختیار، وەڵام لە ڕۆژگاری ونبوونی پرسیاردا، چاپخانەی قانع، سلێمانی.

٩. علاءالدین، عبدالخالق، ١٩٨٥، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، مطبعة دار آفاق العربیة، بغداد.

١٠. عەزیز، قومری سەعید، ٢٠٠٢، هەڵوێست لە شیعری کوردیدا (١٨٠٠- ١٩٧٠)، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی.

١١. قانع، مەریوان وریا، ٢٠٠٣، بەختەوەری و بێدەنگی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.

١٢. قادر، عەباس محەمەد، ٢٠١٠، ریالیزم لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا (١٩٤٦- ١٩٧٠)، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی.

١٣. مەولود، ریزان ساڵح، ٢٠٠٩، ئەندێشەی شیعری لەنێوان ڕێبازی کلاسیک و ڕۆمانتیکی کوردی لە کرمانجی خوارووا، سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری و ئەدەبی نما، هەولێر.

١٤. النفيسي، عبدالله فهد، ١٩٨٦، ڕۆڵی خوێندکار لە کاری سیاسیدا، و: ناجی ئەفراسیاو ئەم وتارە لە کتێبی: گەنج وەک سوبێکتێکی سیاسی، پڕۆژەی گرووپی نێگەتیڤ وەرگیراوە.
سایتی ئینتەرنێت:
١٥. بادیۆ، ئالان، ٢٠١٦، ئالان بادیۆ: فاسدکردنی گەنجان، و: وەلید عومەر، سایتی نێگەتیڤ.
١٦. قادر، سەرۆ، تاک - کەسایەتی لە کۆمەڵگای کوردستان، ماڵپەڕی سەرۆ قادر:
http://www.seroqadir.com/read.php?id=255

**ملخص البحث**

## هوية الشباب في رؤية الشعرية لـ (دلدار)

**د. محمد احمد حسن**
قسم اللغة الكوردية
كلية التربية – شقلاوة
جامعة صلاح الدين – اربيل

إن الشاعر (دلدار) من الشعراء الذين عملوا بشكل عميق حول بعض المفاهيم في اشعاره. انه عمل بشكل فلسفي و وجودي حول مفهوم (الشباب) في اشعاره. حاول ان يحدد هوية الشباب. هوية تكون بدءا لهوية الشباب. ان دراستنا هذه؛ تتكون من فصلين: ففي فصل الاول؛ نتحدث عن مفهوم الشباب و نحاول ان نحدد مفهوم الشباب فلسفيا و وجوديا، حيث ما هو مفهوم الشباب؟ و من هو؟ وما هي وظيفته؟ وما هي تصور الثورات له؟ و من ثم حاولنا ان نحدد مفهوم الشباب في المجتمع الكوردي. وكيف ينظر المجتمع الكوردي الى الشباب. من حيث ان المجتمع الكوردي يرى فيه كائن قليل العقل والتجربة. اما الفصل الثاني؛ فهو الجزء التطبيقي المعنون ب(رؤية دلدار للشباب). اذ انه من خلال اشعاره يحاول ان يحدد هوية للشباب وجودا له. ومن هذا المنطق عملنا على جوانب عدة، وعلى سبيل المثال ان دلدار يحدد لنا هوية شباب ما، و سميناه ب(الشباب العجوز)، وهو شاب فيه طاقة ميتة، فقد هويته. ويحدد دلدار هوية نوع اخر لنا ايضا، و اشرنا اليه ب(حلم الشباب). وهو شاب مليء بالحلم، مليء بالطاقة والحيوية في الحياة. فان دلدار يقارن بين شبابنا وشباب اوروبا و حددنا ذلك بالشواهد الشعرية. وفي الخاتمة لخصنا نتيجة الدراسة هذه من خلال مجموعة من النقاط. وثبتنا قائمة المصادر والمراجع وفق نظام هارفرد.

**Abstract**

The poet (Dldar) is one of the poets who have worked deeply on some of concepts in his poems. He worked philosophically and existentially on the concept of (youth) in his poems. He tried to identify of the youth. An identity that would begin with the identity of the youth.

This study consists of two chapters. In the first chapter, we talk about the concept of youth. We try to define the concept of youth philosophically and logically. What is the concept of youth? And who is he? What is its function? What is the concept? Revolutions? And then we tried to define the concept of youth in the Kurdish society. And how the Kurdish society to young people, In terms of the Kurdish society sees the him as a little mind and experience.

The second chapter is the practical part of Dldars vision to youth. Through his poems, he tries to identify young people, and in this sense we have worked on many aspects. For example, Dldar identifies us with the identity of a young man, the old man, who is a young man with a dead energy, is losing his identity. Dldar also identifies another young man as a young man a dream full of vital energy in life. Dldar compares the youth with youth of Europe, and we have identified this with poetic evidence.

In conclusion, we summed up the result of this study through a set of points. We have established a list of sources and references under the Harvard system.

# پێگەی کەسێتی (ڕۆستەمی زاڵ)ی شانامەی فیردەوسی لە ناو شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا

**د. پایان کاکە ساڵح عەسکەری**
دیوانی وەزارەتی خوێندنی باڵا و
توێژینەوەی زانستی

**پێشەکی**

**ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە:** ناونیشانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە ((پێگەی کەسێتی ڕۆستەمی زاڵی شانامەی فیردەوسی لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا)) ڕۆستەمی زاڵ کەسێتییەکی ناسراوە لە بواری ئەدەب بە گشتی شیعر و داستان و فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکی کوردی و فارسی، لە ناو کەمی و زۆری ناوی کەسێتییەکانی شانامەی فیردەوسیدا، هەوڵدراوە تیشک بخرێتە سەر پێگەی کەسێتی ڕۆستەمی زاڵ وە لەناو دیوانی شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا ئەم کاریگەرییە دەرخراوە و وێنای بۆکراوە .

**پرسیاری لێکۆڵینەوەکە:** لێرەدا چەند پرسیارێک هاتە ئاراوە کە ئایا ڕۆستەم هەر بە هەمان وێنای ڕۆستەمی زاڵی ناو شانامەی فیردەوسی بووە یا وێنە و ناوەڕۆکی جیاوازی لەخۆ گرتووە لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا؟

**گرنگی و ئامانجی لێکۆڵینەوەکە:** ئامانج لە ئەنجامدانی ئەم لێکۆڵینەوەیە کردنەوەی دەروازەیەکی نوێیە لە شانامەی فیردەوسی لە ناو شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا شیکردنەوەی کاریگەرییەکانی لە ڕووی ناسین و ڕۆچوون لە کەسێتی ڕۆستەمی زاڵی شانامەی فیردەوسی لەناو دیوانی شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا لەگەڵ ئەوەشدا دەرخستنی توانا و لێهاتوویی زیاتری شاعیرانی کلاسیکی

کــوردی لەو ڕێگــایەوە وە ناســینی ڕوویەکــی جیــاوازی شــانامە لە ئامانجێکی تری ئەم لێکۆڵینەوەیە هەژمار دەکرێت.

**پێکهــاتەی لێکــۆڵینەوەکە:** بە شــێوەیەکی گشــتی لێکــۆڵینەوەکە پێکهاتووە لە دوو بەشی سەرەکی. بەشی یەکەم باسی ناسینی شانامە لە خۆ دەگرێت بەشی دووەم شەش تەوەر لە خۆ دەگرێت وێناکردنی ڕۆستەمی زاڵە لە شیعری کلاسیکی کوردی بە شێوەی جۆراوجۆر.

**ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:** ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە ڕێبازێکی وەسفی شیکارییە پێگەی کەسێتی ڕۆستەمی زاڵی شانامەی فیردەوسی وێنا و وەسف دەکات لە ناو شیعری کلاسیکی کوردیدا کە سروشتی بابەتەکان و خستنە ڕوویان ئەم ڕێبازە دەخوازێت.

**دەروازە:**

ئەدەبیاتی فارسی و کوردی، بە هۆی نزیکی و هەبوونی فەرهەنگی یەکسان هاوبەشییەکی زۆریان هەیە، کە شایانی سەرنجی لێکۆڵەرانە، زۆر بــابەت و نــاوەڕۆکی ئەم دوو زمــانە تــێکەڵ بەیەک کــراون، بە شێوەیەک، کە لێکۆڵینەوەی زۆری پێویستە تابتوانین نهێنییەکانی ئاشکرا بکەیــن. لەم لێکــۆڵینەوەیەدا تیشــک دەخــرێتە ســەر پــێگەی کەســێتی ڕۆستەمی زاڵ لە شیعری کلاسیکی کوردیدا. هەروەک دەزانین قۆناغی شیعری کلاسیکی کوردی دەتوانرێت بە درەخشانترین قۆناغی ئەدەبی کوردی هەژمار بکرێ. شاعیرانی ئەم قۆناغە بە داهێنەری شاکاری ئەدەبی دادەنرێن، هەرچەندە کە ئەدەبیاتی ئەو کاتە تەنها لەسەر شێوەی شیعر بووە، وەکو ئەدەبی ئەوروپییەکان شانۆنامە و وتار و ڕۆمان نەبووە.

ئەدەبیات سەرەکیترین پایەکانی فەرهەنگی مرۆڤایەتییە، لەسەر زەوی ڕۆڵێکی گرنگی لە بەهێزکردن و مانەوەی کۆمەڵگای جیهانیدا گێــڕاوە، لە کــۆنەوە لە ناوچەکــانی کوردســتان داســتانی حەماســی (ورەبەرزی) و لیریکی میللەتی کورد بە ئەدەبی فۆلکلۆر بەناوبانگ

بووە، بناغەی ئەدەبیات لە فۆلکلۆردایە (مصطفی،٢٠١١،ج١:ص٢٦)، زۆربەی ئەدیب و نووسەران باوەڕیان وایە، کە ئەدەبی کلاسیکی کوردی لە سەدەی یازدەی زایینییەوە دەست پێدەکات و تا چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم و دوایی کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهان درێژەی دەبێ، نووسەری گەورەی کورد (مارف خەزنەدار) دیارترینییانە (خەزنەدار،٢٠١٠:ج١،ص١٨١)، دواتر بەهۆی گۆڕان و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئابووریی ناوچەکە و کاریگەریی تازەبوونەوەی ئەدەبیاتی میللەتانی دراوسێ، لە ڕێگەی ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا و هەست و هۆشی نەتەوەیی و بەرزبوونەوەی ڕادەی هۆشیاریی نەتەوەیی و گەڕانەوە بۆ کەلتووری دێرینی کوردی و بە تایبەتی گەڕانەوە بۆ کەلتووری دەوڵەمەندی ناوچەی هەورامان شیعری کوردی بە ئاراستەی جیاوازدا برد (حسێن، ٢٠٠٧: ص٥٩).

(عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ) دەنووسێ، کە دێینە سەر نووسینی مێژووی ئەدەب، پێش هەموو شت ئەم سێ بەش دانانە، واتا دابەشکردنی ئەدەبیاتەکە بەسەر فۆلکلۆر و ئەدەبی میللی و ئەدەبیاتی نووسراو بەکارێکی پەسند ئەزانین (٢٠١١:ج١،ص٢٦)، کلاسیزمی کوردی لەسەر بنەمای هیچ تیۆرێکی ئەدەبی و میتۆدی فەلسەفی دانەمەزراوە، ئەوەی لە باوەشیدا دروست بووە. شارستانیەتی ئیسلامییە، کە لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی بەرهەمی ئەدەبی بەتایبەت شیعر هەبووە، تێکستەکانی ئەم نەتەوانە لە حوجرەکانی کوردستان خوێندراون و کاریان کردۆتە سەر خوێندەوار و شاعیرانی کورد، تا وای لێهاتووە ئەو تێکستە ئەدەبییانە بوونەتە نموونەیەک، کە شاعیرانی کلاسیزمی کوردی لاساییان بکەنەوە، لەسەر بنەمای داهێنان و ئیستاتیکای کاری ئەدەبیی ئەوان، ئەوانیش شیعر بنووسن و داهێنانی تێدابکەن (عبدالله، ٢٠٠٦:ص٤٢ ).

ڕێبازە ئەدەبییەکان هەر لە (کلاسیزم)ەوە تا (ڕۆمانسیزم) و(ڕیالیزم) تا ڕێبازەکانی دیکە، هەر هەموویان لە ژینگەیەک

سەرچاوەیان گرتووە، لە ئەوروپایە، کە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا، لە ڕووەکانی ئایینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و داب و نەریت و ڕەوشت و ڕواڵەتەکانی ژیان و فیکر و هونەر و کەلتوور و سەرجەم ڕووەکانی تریش جیاوازی زۆری هەیە. (عبدالله،٢٠٠٦: ص٣٦) بە واتایەک هەندێک لە ئەدیبان و لێکۆڵەرانی ئەدەبی ڕۆژهەڵات لەو باوەڕەدان، کە ڕەنگ و بۆنێک لە ڕێبازی ئەدەبی هەتا کلاسیک، لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتدا نییە. شیعری کلاسیکی کوردی جگە لە زاراوە جیاوازەکانی زمانی کوردی بە زمانەکانی دیکە بە تایبەت زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی دەنووسرا، هەروەها بە شێوەی خۆ ویستانە وشەی ئەم زمانانەیان لەنێو شیعرەکانیاندا بەکارهێناوە.

شاعیرانی کورد بەگشتی زۆر گرنگییان بە ڕوونبێژی و ڕەوانبێژی داوە، وەک هەڵێنجراو و دۆزراوەی ئەدەبی لە کەسێتییەکانی شانامە دەڕوانن، کە لە ئەفراندنی ڕوونبێژی و ڕەوانبێژیدا بەکاریان هێناون، کارتێکراوی شاعیرانی کورد کە بە کەسێتییەکانی شانامە هەیانە، پەیوەستە بە ئاستی ئاگایی و زانیاریی شاعیران دەگۆڕێت و جیاوازە، بەڵام جگە لە کاریگەریی شاعیران بە شانامە لە هەندێ جێگای بەرهەمەکانیاندا کاریگەری لە ئەدەبی سەر زارەکی دەبینرێ، بۆ نموونە یەکێ لە شاعیرەکان بەهەمان شێوە، کە کەسێتی (شغاد) لەسەر زمانی خەڵک بەپێی گێڕانەوەکانی ئەدەبی زارەکی (شغال) بیستراوە، بەهەمان شێوە لە شیعری خودی شاعیر ڕەنگی داوەتەوە، ئەم شێوە کارتێکەرییە نیشانەی سوودبینینە لەسەر زمانی خەڵک، نائاگایی نیمچەیی خودی شاعیر لە کەسێتی (شوغاد)ە، هەندێ جار شاعیرانی کورد هیجر و دووری لە خاک و وەتەن و یارەکەیان بە ڕۆستەم لێکچوواندووە، بە هۆی ئەوەی، کە شکستی بە شاعیر هێناوە، کە ڕۆڵی عاشق بە خاک و وەتەن و مەعشووقی گێڕاوە، بە شێوەیەکی زۆر کەم (ڕۆستەم) بە بێ دەسەڵات و بێ هێز و ستەملێکراو وێنای کراوە و وەسفیان کردووە، بە هۆی ئەوەی، کە دوای بریندارکردنی کوڕەکەی (کەیکاوس) یارمەتییان

نەداوە، هەروەها خۆی نەیتوانی کارێک بکات. لەو سەردەمەدا شاعیر ئەگەر لەیەک زمان زیاتر شیعری نەبووایە، خاوەنی بەرهەم و دیوان نەدەبوو، ناوبانگێکی وایان نەدەبوو، بە جۆرێک لە لێهاتوویی شاعیر هەژمار دەکرا، زیادەڕەویی لە وەسفی مەعشووق و شانازی و پیاهەڵدان و داشۆرین لە شیعری کوردیدا بەرچاو دەکەوێ. وەسف لە گرنگترین ناوەڕۆکەکانی شیعرەکانیانە، وەسفی ئازایەتی و کۆمەڵایەتی و دڵداری و نەتەوایەتییە وەسفی ڕۆستەمی زاڵی شانامەی فیردەوسی بەشێکی زۆری دەکەوێتە ناو ئەم وەسفەوە.

ڕۆستەمی زاڵ ناوی پاڵەوانێکی نەتەوەیی ئێرانە، کە لە ئەدەبیاتی دێرینی فارسی (پەهلەوی) بە ناوەکانی (رستخم) و (رستهم) بە واتای کەسێکی بە هێز و بە توانا هاتووە، لەگەڵ وشەی (تهمتن) کە لە فارسیدا بە نازناوی ڕۆستەم هاتووە، هاوواتایە (یاحقی، ١٣٢٦: ص٣٩٣) سەرنجدان بەکەسێتی ڕۆستەم ئەوەمان نیشان دەدات، کە لە زۆر ڕووەوە، کەسێتی ڕۆستەم لە ناو شانامەدا ڕیشەی لە ناو شارستانیەتی ئێرانی کۆنەکاندایە. واتا ڕۆستەم سیمبولی خودایانی هێزە لەناو دینە زەمینییەکانی شارستانییەتی ئێراندا (هەمان: ص٣٩٤). ڕۆستەم بەنازناوەکانی ڕۆستەمی دەستان، پوردەستان، پاڵەوانی جیهان، تەهمتن، فیل تەن، .... لە شانامە و تەنانەت لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیشدا ناو دەهێنرێ، ڕۆستەم کوڕی زاڵ و ڕودابەیە، ڕەسەنی باوکی بۆ گرشاسپ و جمشید، ڕەسەنایەتی دایکی بۆ مهران کابولی و ضحاک دەگەڕێتەوە.

ڕۆستەم حەماسەیەکی زۆر بە درێژایی شانامە بەدی دەهێنێ. بۆ نموونە دەتوانرێ بە ڕزگارکردنی قەڵای سپند کێو، ڕزگارکردنی کەیکاوس و پاڵەوانەکانی تر لە بەندی دێوی سپی لە مازەندەران بە ڕزگاربوون لە حەوت خان پاراستنی سنوور ئاماژە بکرێ (اسلامی ندوشن، ١٣٩٠ش: ص٢٦١)، لە کەلتووری ئێران دوای ئیسلام ڕۆستەم بەناوبانگترین و کاریگەرترین پاڵەوانی ئەفسانە و چیرۆکەکان خۆی

نیشـان دەدات، لە چوارچێوەی ئەدەبیـاتی فارسـی هێـزی نەترسـی و بەتوانـا بـوو لە هـیچ کتێبێـک نیـیە، کە بەبـێ نـاوی ئەم پـاڵەوانەبێ، وا پێدەچێت، کە لە کەلتووری ئێرانی ئـازایەتی و بەتوانا بـوون، پاڵەوان بـوون لەگەڵ نـاوی ڕۆسـتەم گـرێ درابـێ، ئەگەر چـی هەمیشـە نـاوی ڕۆسـتەم هێمـای بە توانـابوون هێزێکـی شـەڕکەر بـووە، هەندێک جـار شـاعیران، بەتـایبەت لەو سـەردەمانەی کە ڕوحـی نەتەوایەتـی لەنـاو کۆمەڵگـادا بەرەو سسـتی دەڕۆیشـت، بەبـێ هـیچ گرینگـی پێـدانێک ڕۆسـتەمیان لەبەرامـبەر ئەو شـتانەی کە پێیانـدا هەڵـدەگوت پەراوێـز دەخسـت و بەهیچیـان دانەدەنـا (یاحقی، ١٣٢٦: ص٣٩٤) ڕۆسـتەم یەکێکە لە پـاڵەوانە سـەرەکی و پایەکـانی شـانامە، پڕخـوێنەرترین و بەرچـاوترین چیڕۆکەکـانی شـانامە پەیوەسـتە بە بـوون و ڕۆڵـی ڕۆسـتەم لە شـانامە، دیـارترین و خۆشەویسـتترین کەسـێتیە لەنـاو کەسـێتیەکانی شـانامەدا، باسـکردنی ئـازایەتی و نەترسـی چەنـدین سـەدە پێش نووسـینی شـانامە لەناو خەڵک دەنگۆیی هەبووە.

ناپایەداریی جیهان، ستایشی خواوەند و عەقڵ و زانیاری و هـۆش، لایەنـی مێژوویـی جەنـگ و کێشمەکێشـی شـایەکانی ئێـران و چـۆنیەتی سـەرکەوتن و داکەوتـن و مەیـدانی جەنـگ و چیرۆکـی خۆشەویسـتی لە ناوەرۆکە دیارەکانی داستانەکە هەژمار دەکرێت و لە ناو هەندێک بەشی داسـتانەکە جێگایـان گرتـووە. هەروەهـا دەچێتە سـەر باسـی چـۆنیەتی لەدایکبوونی زاڵ هەتا تۆمارکردنی هەندێک بۆنەی خۆشـی و ناخۆشـی تـایبەتی ژیـانی خـۆی بە دیـارکردنی بەروارەکەی لەنێـو داسـتانەکە، لە دەسـتپێکی داسـتان تـا کۆتـایی ڕووداو و پێشـهات و کـورتە چیرۆکـی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت. ئەمەش جوانی و تایبەتمەندییەکی جیاوازی بە داستانەکە بەخشیوە.

کەسێتی ڕۆستەم لە داستانی ڕۆستەم و ئەسفەندیار کەسێتییەکی بەهێز و بەجێیە. پاک، میانڕەو و گەورەئاسا: تێکەڵاوێکە لە میهر و قەهر (اسـلامی ندوشـن،١٣٩٠ش: ص٢٦١)، لە سـەرەتای داسـتانی ڕۆسـتەم و

ئەسفندیاردا، فیردەوسی لێکچوونێکی سەرنجراکێش و شیاوی هێناوە، بۆ یەکەم جار فیردەوسی لە سەرانسەری داستانی شانامەدا ڕۆستەمی بە لەوچوو (مشبە بە) داناوە، چونکە خوازیارە توانا و بەهێزییەکەی زیاتر لە هەموو شتەکان نیشان بدات (شفیعی، ١٣٧٨،ص٤٦١)

**نگه کن سحرگاه تا بشنوی ز بلبل سخن گفتن پهلوی**
**همی نالد از مرگ اسفندیار ندارد بجز ناله زو یادگار**
**چو اواز رستم شب تیره ابر بدرد دل وگوش غران هژبر**

(شاهنامە،١٣٨٢: ٩٧٩)

فیردەوسی لەم سێ دێڕەی سەرەوەدا لە شین و ناڵەی مەرگی ئەسفندیار ئاماژە بەوە دەدات بۆ بیستنی ئەم چیرۆکە دەبێ سپێدە گوێ لە بولبول بگری تا بە زمانی پەهلەوی بۆت بگێڕێتەوە کە چۆن لە مەرگی ئەسفەندیار دەناڵێنێ، کە شەوی تاریک وەکو ئاوازی ڕۆستەم ئەوەندە بڵندە، کە دڵ و گوێچکەی شێرانی جەنگ دەدڕێنێ، نەخشی ڕۆستەم لێرەدا بەرزترین پلە و پێگەیە، بە بەکارهێنانی هونەر، جوانکار، لەوچوو (مشبە بە) وەکو ئاشکرایە، کە ڕۆستەم هەمیشە ڕۆڵی سەرەکی لەنێو شانامەدا گێڕاوە، پێویستی بە لێکچوواندن نەبووە، بەڵام لە شیعری کلاسیکی کوردیدا هەمیشە بەکارهێنان و ڕەنگدانەوەی کەسێتی ڕۆستەمی زاڵ بەگشتی بەرزترین پلەی پێدراوە لەڕێی هەمان بەکارهێنانی هونەری جوانکاری لەوچوو (مشبە بە) بەوەی، کە هەمیشە پێهەڵگوتراوەکانی خۆیان بە ڕۆستەم لێک چوواندووە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا نیشانەی زیرەکی و لێهاتوویی شاعیرانێکە، کە لەم زەمینە، زیرەکانە پێنووسەکانیان تاوداوە، چونکە بەبێ خوێندنەوەیەکی ڕاست و ڕۆچوون بەئەدەبی فارسی، بەتایبەت شانامە، نەیاندەتوانی جوانی و نەرمی کەسێتییەکانی ناوهێنراو لە شاناوە دیارترینیان، کە ڕۆستەمی زاڵە لە شیعری خۆیان نیشانبدەن، هەڵبەتە کە هەر ئەم شاعیرانە کەسانێکن، کە بەشێکی گەورەیان لە شانامە و کەسێتییەکانی بە سەرجەمی خوێنەرەکان بەگشتی- و فەرهەنگ دۆستانی کورد

ناسـاندووە یەکـێ لە ناوەڕۆکەکـانی کە گەلێـک لە شـاعیرانی کـورد لە شـیعری خۆیـان ئاماژەیـان پێداوە تیـری نیگـای غەمزەیـی یارەکەیـان لێکچووانـدووە بە نـاوەڕۆکی چیرۆکـی ڕۆسـتەم، کـاتێ ئەشـکەپوس و ئەسفەندیاری بە ئامانج گرتووە و شکستی بەعاشق هێناوە.

**١-١- ناسینی شانامەی فیردەوسی:**

پێش فیردەوسی، دەقیقی شاعیر دەستی بە نووسینی پەرتووکێکی وەکـو شـانامە کردبـوو، بەڵام مەرگـی لەناکـاوی بـواری پێـنەدا، کە نووسینەکەی تەواو بکات، لە ساڵی (٣٦٥ ک.م)، کەمێک دواتر کوژرا ، فیردەوسـی لەسـەرئەنجام و چارەنووسـی دەقیقـی و نـاتەواوی پەڕتـووکەکە ئاگـاداربۆوە، بیـری- کـردەوە کە کـاری نـاتەواوی دەقیقـی تەواو بکـات، دواتـر شـانامە بەنـاوی (حکـیم ابـو قاسـم فیردەوسـی) ناوبـانگی دەرچـوو نەک تەنهـا گەورەتـرین و پڕمـایەترین داسـتانی شیعرییە کە لە ڕۆژگاری سامانییان و غەزنەوییـان بەجێمـاوە، بەڵکو لە ڕاستیدا لە گرنگترین بەڵگە گرانبەهاکانی ناسنامەی ئێرانییە، ڕووناکترین بەڵگەی شـکۆدار و ڕەونەقـی فەرهەنـگ و شارسـتانیەتی ئێرانـی کـۆنە، گەنجینەی وشە و ئاخاوتنی ڕەوانی زمانی فارسییە، داستانە کۆنەکان و مێـژووی میللەتـی ئێـران بە درێژایـی داسـتانەکە بە باشـترین شـێوە نیشاندراوە هەستی قووڵی نەتەوەیی فێرکردنی ڕەوشت لەنێو هەموو داستانەکە نیشاندراوە.

شـێوەی بەیـانی شـانامەی (حکیم ابـو قاسـم فیردەوسـی) زۆرجـار وشـەکانی کـورت دەکـاتەوە، لە درێژکـردنەوە دوور دەکەوێـتەوە، داسـتانێک کە لە بنەڕەتدا بە شـێوەی پەخشـان بـووە، شـاعیر بەو پەڕی لێهاتوویی بەشـێوەی داسـتانی شـیعری دایڕشـتووە، هەوڵـیداوە شـتێکی لێ کەم نەکاتەوە، زۆربەی ئەم داستانانە لە پەڕتووکە ئـایینییە کۆنەکـان وەرگیراوە، هەندێ لە ئاڤێستا و پەرتووکە پەهلەوییە کۆنەکان بەجوانی هـاتووە (زرین کوب، ١٣٨٩:ص٤٠)، ئەو توانـایەی، کە فیردەوسـی لە هێنـانی

دەربڕینی جۆراوجۆر هەیەتی، نەرمی و جوانییەکی بێ هاوتا بە داستانە شیعرییەکەی بەخشیوە، کە لە دەربڕینی شاعیرانی دیکەدا نییە، لە داهێنانی واتا و هێنانی وەسف و پێکهاتەسازی عەرەبی تا ئەندازەیەک خۆی پاراستووە، ناوەڕۆکەکەی ڕەنگی ئێرانی پێداوە، بەهەرحاڵ لە وەسفکردنی دیمەن و وێناکردنی پێشهاتەکان و هەتا لە بەیانی پەند و عیبرەتیش لە وردبینی ڕەوانبێژی کەمتەرخەمی نەکردووە (هەمان:ص٤٠)، فیردەوسی زمانی فارسی لە لەناوچوون ڕزگارکردووە، هەر ئەمە هۆکاری زیندوومانەوەی زمانی فارسی بووە، زمانی فیردەوسی لە شانامە زمانێکی ئەوەندە ڕەوانە، دوور لە گرێ و ئاڵۆزی، کە بە زمانی گفتوگۆی ئاسایی ڕۆژانەی خەڵک دەچێت، لەم ڕووەوە لەگەڵ ئەوەی هەزاران ساڵ بەسەر شانامەدا ڕۆیشتووە، بەڵام زمانی شانامە دەتوانرێت بە زمانی ڕۆژگاری ئێستا هەژماربکرێ (کزازی،١٣٧٠:ص٦٣)، شانامە گەنجینەیەکی گەورەی پەند و ئامۆژگارییە، کە بە هۆی توانای (فیردەوسی) بە شیعر هۆنراوەتەوە، تا بۆ خوێنەر وانەی ژیان بێ (شعبانی، ١٣٨٨: ص١٨)، داستانەکانی شانامە لەڕووی وەسفی مێژوویی و زنجیرەی مێژوویی بە سێ دەورەی، ئەفسانەیی، پاڵەوانی، مێژوویی دابەشکراون، لە سەرەتا تا دەورەی فەرەیدوون ئەفسانەیی، پاشایەتی فەرەیدوون تا ئەسکەندەر دەورەی حەماسی پاڵەوانی، دوای ئەوە دەورەی مێژوویی ناونراوە (صفا،١٣٦٣:صص٢٠٦_٢١٤)، ئەفسانە لە چیرۆکی ڕۆستەم و ئەسفەندیار هیچ ڕێگایەکی بۆ بەچۆکدادان و شکستی ڕۆستەم نەهێشتۆتەوە، هەڵبەتە کە مەرگ چارەی نییە، بەڵام ڕۆستەمی زاڵ دەبێ مەرگی تایبەت بەخۆی هەبێ (یاحقی،١٣٢٦:ص٣٩٤). بە شێوەیەک لە دێڕە شیعرێکدا کە لە خوارەوە ئاماژەی پێدراوە (فیردەوسی) لە پێهەڵدادانێکی ئەفسانەییدا ئاماژە دەدات، کە چەرخی بڵندی ڕۆژگار ناتوانێت دەستی ڕۆستەمی پاڵەوان ببەستێت کێ گوتی برۆ دەستی ڕۆستەم ببەندە، هەرچەندە توانایی و هێزو بازوو و پاڵەوانێتی لە (ئەسفەندیار)یش دا هەبووە :

**که گفتت برو دست رستم ببند نبندد مرا دست چرخ بلند**

(شاهنامه،١٣٨٢: ص٩٧٥)

لە دیدگای دەروون و ناوەڕۆک دەتوانرێت بە داستانی جەنگی، عاشقانە، عارفانە، شاعیرانە، سیاسی و کۆمەڵایەتی، ڕەوشت، فەلسەفی و ئایینی دابەش بکرێت.

یەکێ لە هۆکارەکانی، کە بووە هۆی زیندوو مانەوەی شانامەی فیردەوسی، شانامەخوێنی و بەیت بێژی بووە، لە کۆڕ و دانیشتنی شەوانە، کاتی بەتاڵی خەڵکی بە گشتی پڕ دەکردەوە لەو سەردەمەدا، بەهۆی ئەو کاریگەرییەی، کە لەسەر گوێگرەکان هەیبووە، بە خێراییەکی زۆر ناوبانگی دەرکرد، شانامە خوێنی هەتا لە مەیدانی جەنگ بەکاردەهات، بەمەبەستی هاندانی جەنگاوەرەکان، لە پێویستییە گرنگەکانی جەنگ و پێکدادانەکانی ئەو سەرزەمینە هەژمار دەکرا (گۆرانی، ١٣٧٩: ص٤) وەکو حاجی قادر لە پیشاندانی گرنگی شانامەدا دەنووسێت:

**ئەوەی ئازایە شاهنامە دەخوێنێ ئەوەی مسکێنە گەنم و جۆ دەچێنێ**

(٢٧٠٧: ١٩٤)

لە نێو کورددا دوو جۆری سەرەکی شانامە هەیە، یەکەمیان شانامەی نووسراو، وەک دەستنووسی ڕۆستەم و زۆراب، دووەمیان شانامەی زارەکی، کە ڕەنگە دەیان شێوازی جیاوازی هەبێت، کە لەبەیتبێژان و میرزاکانی کوردستان بەدەنگ تۆمارکراون (گودەرزی، ١٩٩٨: ص١٦). بابەتی شانامەی کوردی و- فارسی وردەکارییەکانی لەم لێکۆڵینەوەیەدا جێگای نابێتەوە، پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی وردی مەیدانی هەیە، لە سەرەتای دەسپێکی لێکۆڵینەوە سەرنج لەسەر ئەمە بووە، کەسێتییەکانی شانامە بەتایبەتی ڕۆستەمی زاڵ لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا جێگایەکی تایبەتییان هەبووە، زۆرترین کارتێکەری لە شانامە لە خۆ گرتووە، لەلایەنی شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا.

**١-٢- چۆنیەتی وێناکردنی ڕۆستەمی زاڵ لای شاعیرانی کلاسیکی کوردی:**

لە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیدا بە ناوەڕۆکی جۆراو جۆر باس لە کەسێتی ڕۆستەمی زاڵ دەکرێت، وێناکردنی بەئازایەتی و سوارچاکی و پاڵەوانێتی و سەرکەوتن لە مەیدانی جەنگ، تا توانایی و هێز لە داهێنان و نووسین، کە شاعیران پاڵەوان یا پێهەڵگوتراوەکانیان و سەرکردە و دەسەڵاتدارانی سەردەمی خۆیان یا شاعیرانی هاوقۆناغی خۆیان وەیا ڕووی مەعشووقەکانیان بەئازایەتی لە ڕادەبەدەری- و بوێریی ڕۆستەم لێکچواندووە، ڕۆستەمانە و رۆستەم ئاسا لە شیعرەکانیاندا جێگایان گرتووە، ڕەنگدانەوەی ئازایەتی ڕۆستەمی زاڵ، بەشێوەیەکە بۆتە ئەفسانەیی، هەرچەندە بەپێی گێڕانەوەکانی ئەدەبی زارەکی کوردی ئەم ڕاستییەکی مێژوویی هەیە، لە خوارەوە بەپێی ناوەڕۆکی شیعرەکان پۆلێنکردنەکان ئاماژەی پێدراوە.

**١-٢-١- ئازایەتی و سەرکەوتن:**

وێناکردنی کەسێتی ڕۆستەمی زاڵە بە پاڵەوانێتی و ئازایەتی و سەرکەوتن لە مەیدانی جەنگ - و سوارچاکیدا، بۆنموونە لەم پارچە شیعرەی خوارەوەی حاجی قادری کۆیی (١٨١٦-١٨٩٧م) دەتوانرێت دوو لایەن بەدیبکرێن، شاعیر دەیەوێت لە ڕووی هەستی نەتەوەیییەوە ئەم کەسێتییە ئازایە وابەستەی نەتەوەی کورد بکات، کە ئازایەتی ئەم قارەمانە شانازییە بۆ نەتەوەکەی، لە ڕوویەکی دیکەوە جەنگ و شەڕ بە ماڵ وێرانی و خوێن ڕشتنێکی زۆر بێ واتا دادەنێ، بە بەڵگەی ئەوەی، کە سیاوەش کوڕی کەیکاوس کوژراوە، بەکوشتنێکی ناحەق بە هەدەر خوێنی ڕژاوە، ئەمەش لە شیعری شاعیران ڕەنگی داوەتەوە، وەسفی ئازایەتیی ڕۆستەم وەکو ئازایەکی کورد باس دەکات و وشەکانی (کەیانی) و ئالای (کاویان) کە تەواوکەری یەکترن وەکو دوو هێما مێژووی کورد لە ڕۆستەمدا دەبینێ، ئالای کاویانی ئالای کەیانی و کاوەی ئاسنگەرە زۆربەی شاعیرانی کورد کە لە ناو

لێکۆڵینەوەکەماندایە وەکو ئەحمەدی خانی و فیدایی لە دلاوەری و قارەمانێتی ڕۆستەم ئاسا پێشەنگی ڕۆژگاربوونە:

**– پەرچەم و فێسی کەچی تۆ ئەی جوان**
**تاجی کەیانە و عەلەمی کاویان**
**من لە غەمت ڕێگەیەکم کەوتەبەر**
**خوانی بەهەشتە و سەفەری هەفت خوان**
**بێژەنی چاهی زەقەنی تۆیە دڵ**
**ڕاهی نەجاتی فەلەک و ڕێسمان**
**تیری موژەت بۆ دڵی ئەسفەندیار**
**تیری گەزی ڕۆستەمی مازەندەران**
**فیرقەتی تۆ لەشکری ئێرانیە**
**سەبری منیش لەشکری توورانیان**
**بەسیەتی سا خوێنی سیاوەش نیە**
**جان و دڵت بردووە هەم دینمان**
**(حاج)یە فیردەوس یی کورد، سا ئەتۆش**
**گوێ وەکوو مەحموود مەدە قەولی بەدان**

(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ١٩٠)

**– ڕۆستەمی مازەندەران ئەو وەقتە دەستی بردەوە**
**هاتە ڕێی دێوی سپی ئازانە دەستی کردەوە**

(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ١١٨)

ئازایەتیی ڕۆستەمی زاڵ بە شێوەیەکی لە ڕادەبەدەر بووە، تەنانەت ڕووبەڕووی ئەژدیها و دێوی سپی و شتە ترسناکەکانی، کە لە ئاستی توانای مرۆڤ زیاترە بۆتەوە، تەنانەت ڕووبەڕووی ڕووداوە ترسناکەکانی سروشتیش بۆتەوە، لێرەدا توانا و لێهاتوویی لە ڕادەبەدەری خۆی وەسف دەکات، کە شوهرەتی ئەبیاتی خەڵکی لەسەر کۆکردەوە.

**– کێشای لە زمانی شیری دوو دەم**
**ڕۆستەم بووە سواری ڕەخشی پەنجەم**

(ئەحمەدی خانی، ١٣٨٩: ١٢٨)

ئەمەی جێگــای گــرنگییە کــارتێکردنی مســۆگەرانەی شــانامە لە شـاعیرانی کورد و بەقەرز وەرگرتنی کەسێتییەکان و بەکارهێنانیـان لە داتاشین و داهێنانی خوڵقاندنی ناوەڕۆکی تایبەت بە خۆیانە، خوڵقاندن و داهێنانی جوانترین ناوەڕۆک و پێکهاتەسازی، کە بەکەڵک وەرگرتن لە ڕۆستەم لە شیعری شاعیرانی کورددا هاتووە، پەیوەستە بە(ئەحمەدی خـانی) کە پێنووســی نووســینی بە ڕۆســتەم و پەنجەکـانی دەســتی بە ئەســپەکەی رۆســتەم (ڕەخـش) لێکچووانـدووە، کە لە مەیـدانی کـاغەز مەیدانداری دەکات (ئاماژە بە توانایی نووسین و کاریگەری کە لەسـەر ڕۆشنگەری کۆمەڵگا هەیەتی)

**– زۆر عەیبە گەلێک عارە کە ئەم قەومە نەجیبە**
**مەشهوور بە شەجاعەت هەموو وەک ڕۆستەمی دەستان**

(کۆکەیی، ١٣٨٧: ١٦٢)

مەبەســت لەم دێــڕەی مەلا مــەعــروف کــۆکەیی ئەوەیە، کە ئەی نەتەوەی کورد، کە ئێوە وەکو ڕۆستەم بەئـازایەتی مەشـهوورن، ڕاپەڕن بۆ عیلم و سەنعەت، ئەم تەمبەڵی و خەوتن و غەفڵەتە تا کەی.

**– (نالیا) بێ هیممەتی تاکەی بە دەست میحنەتتەوە**
**فاتیحیی و ڕۆستەماسا، ساحیبی تێغ و عەلەم** (نالی، ١٣٨٢: ٧٢)

نالی تاکەی وا بەدەست دەرد و بەڵاوە بێ هیممەتانە گیر ئەخۆی؟ ڕاپەڕە، تـۆ کە ئـازایەکی وڵات داگیـرکەری وەک ڕۆســتەم و خـاوەنی شمشێر و ئاڵایت لەسەر چی پەکتکەوتووە هەستە.

**– ئەو خوسرەوە وا حاتەمی تەی بوو بە سەخاوەت**
**ئەو ڕۆستەمە وا شێری ژیان بوو لە نەبەردا** (کەمالی، ١٩٨٦: ٢٩)

کەمالی شیوەن بۆ شـاعیری بەناوبانگ (ئەحمەد موختار بەگ)ی وەسمان پاشای جاف دەکات کە لە سەخاوەت وەکو حاتەمی تەی بووە، لە ئازایەتیشدا وەکو ڕۆستەمی زاڵ بووە.

**- لە عەرسەی عیلم و ئادابا فراندی گۆی هونەر (مەحوی)**
**عەجایەب شاسوارێکە بە وێنەی ڕۆستەمی زاڵە** (کەمالی، ١٩٨٦: ١٠٤)

لە ستایشـی (سـاجیدە ئـاوارە)دا کەمـالی دەنووسـێت، جـگە لە مەیـدانی ئـازایەتی لە زانسـت و هـونەر و ئەدەبـیش گـۆی هـونەری بردۆتەوە، ناوبراو شاسـوارێکی بێ وێنەیە، لە ئازایەتی و زیرەکیشدا وەکو ڕۆستەمی زاڵە.

**- بە پەیکانی موژەی پێکامی ئەو بێ ڕەحمە وای زانی**
**کە تیری ڕۆستەمە و بۆ دیدەنیی ئەسفەندیار ئەڕوا** (کەمالی، ١٩٨٦: ٤٤)

کەمالی تەنانەت لە باسی یاردا، یارەکەی کە بە تیری موژگانی بێ ڕەحمانە و بێ بەزەییانە دڵی پێکاوە دەشوبهێنێ بە تیری ڕۆستەم کە بۆ دیدەنی ئەسفندیار ئەڕوا و دەیپێکێت.

**- بەرامبەر تیرەبارانی موژەت خۆی ناگرێ ئینسان**
**هەزیمەت هەر ئەکا با ڕۆستەمی مازەندەرانی بێ** (کەمالی، ١٩٨٦: ١٢٨)

خەڵک ناتوانێت خۆی بگرێت لە بەرامبەر کاریگەریی تیری موژەی یـاردا بـۆیە هەرتێـک ئەشـکێنێ ئەگەر بە ئـازایەتی ڕۆسـتەمی مازەندەرانیش بێ.

**- سوپاشکێن بوو خاوەنی حەشەم　　ئازا و قارەمان**
**لە ڕۆژی جەنگا مانەندی ڕۆستەم　　لە جەرگەی مەیدان**

(کەمالی، ١٩٨٦: ١٥٩)

لە شین و لاوانەوەی کۆچی سەرکردە (شێخ مەحموودی نەمر)دا کە کەسـێکی ئـازا و پـاڵەوان و سـوپا و لەشکرشـکێن بـووە، خـاوەنی حەشـیمەت بـووە، لە ڕۆژی جەنگیشـدا وەکـو ڕۆسـتەم لە ناوەنـدی مەیدانی جەنگ و شەڕدا جەنگاوە.

**- لە وەقتی خۆی هەموو شا بوون سەراپا بێ غەم و شا بوون**
**لە جوودا حاتەمی تایی، لە شەڕدا ڕۆستەمی مەیدان**

(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ٨٣)

کاتی خۆی کورد هەموو وەک شا بوون سەراپا دوور لە غەم ، پاشا و حوکمدار بوون لە سەخاوەتا وەکو حاتەم و لە جەنگدا وەکو ڕۆستەم پاڵەوانی مەیدان بوون.

**– سەد وەکو ڕۆستەم لە دڵ، قەمچی لە ڕەخشی دا، بەزی**
**وەک گەیشتە خەندەکی پایانی عومری دابەزی**

(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ١٤٢)

بوێرییەکەی ئەوەندە زۆرە، کە وەکو ڕۆستەم لەگەڵ ئەسپەکەی سەد کەسی بە کوشت دەدا چونکە کۆتایی ژیانی بوو بە ئاسانی لە ژیاندا ڕۆیشت.

**– مەوقووفە بە ڕۆستەمی عینایەت**
**موحتاجە بە هیممەت و هیدایەت**
**دەرچم لە ئەسیری میسلی بێژەن**
**ڕاهی بوو بە قووەتی تەهەمتەن**
**تەعیین بکە ڕۆستەمی دیرایەت**
**تەوسەن بدە خوسرەوی عینایەت**
**تا کورد و ئەمن لە دەستی دوونان**
**دەرچین هەر ئەتۆی ڕەحیم و ڕەحمان** (حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ١٦٣)

**– ئەهالی ڕۆستەمن وەقتی شەجاعەت**
**لە حاتەم زێترن وەقتی سەخاوەت** (حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ٢١٠)

لە شیعری (مەیدانی بەهار) شاعیر پێهەڵگوتراوەکانی خۆی لە شەجاعەت وەکو ڕۆستەم، لە سەخاوەتیشدا وەکو حاتەم دەبینێ، لەم دێڕە شیعرەی خوارەوەش بەهەمان شێوە.

**– بە شەجاعەت هەموو وەکو ڕۆستەم**
**بە سەخاوەت هەموو وەکو حاتەم** (حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ١٨٠)

**– شەوکەتی جووتەی سمێڵت تاکە مانەندی کەمە**
**تەرکەشی تیری تەژاو و شیری دەستی ڕۆستەمە**

**ڕووی لە تەختی ڕوومەتت هێناوە بۆ شانت دەڵێی**
**ماری سەرشانی زوحاک و دوژمنی تەختی جەمە**

(حاجی قادر کۆیی، ۲۷۰۷: ۲۲٤)

حاجی ئەم چوارینەی بە سیمای پیاوێکی تەق تەقی دا هەڵگوتووە، هەیبەت و شکۆی سمێڵت وێنەی نییە گۆشەی سمێڵت وەکو پەیکانی شمشێری ڕۆستەمە، لە تەخت و بارگەی ڕوخسارت بۆ لای شانەکانت ڕۆیشتووە، وەک بڵێی ماری شانەکانی ضەحاک و دوژمنی تەختی جەمشیدن.

**– باش تەنیومە هەرد و بەرد و دەشت و کێو**
**ڕۆستەمم، هەرگیز دەرۆستم نایە دێو** (حەقیقی، ۱۳۸۹: ۹۵)

زەوی و دەشت و بەرد و کێوم گرتووە، وەکو ڕۆستەمم، دێو ناتوانێ ڕۆستەم شکست پێبێنێت.

**– هەرچەندە لە زیندانی فیراقام وەکو (بیژەن)**
**بیلا بە تەمای (ڕۆستەم)ی داستانی کوەیتم** (بێخود، ۱۳۸٦: ۵۸)

لەم دێڕەدا بێخود ئاماژە بە داستانی (بیژەن و مەنیژە) دەدات ، بیژەن کوڕی (گیو) خوشکەزای ڕۆستەم بووە، دڵی ئەچێ لە مەنیژەی کچی ئەفراسیاب. جارێکیان ئەفراسیاب لە ماڵی کچەکەیدا ئەیبینێ، ئەیگرێ و لە چاڵێکدا بەندی ئەکات، پاشان ڕۆستەمی خاڵی دێت ڕزگاری ئەکا، بێخود ئەم پارچە شیعرەی بەبۆنەی گەڕانەوەی (شێخ مەحموودی حەفید) نووسیوە، کە لە هیندستانەوە لەو کاتەدا گەیشتۆتە کوەیت.

**_ ئەگەر ببێ بە (سکەندەر) بە بازووی قووەت**
**وەگەر ببێ بە پەلەنگەر بە قووەتی بازوو**
**بە حوکمڕانی ئەگەر ببیە شاهی (کەیخەسرەو)**
**بە پاڵەوانی ئەگەر ببیە ‹‹ڕۆستەم›› و (بورزوو)**
**کە هاتوو رشتەیی عومرت گەیشتە وەختی پسان**
**تەخەللوفی نیە باللە بە قەدری یەک سەری موو** (بێخود، ۱۳۸٦: ۸٤)

ئەگەر بە هێز و بازوو وەکو ئەسکەندەر کەسێکی پەلەنگەر بێ وە ئەگەر لە حوکمڕانی شای کەیخسرۆ بێ نییە وە لە پاڵەوانی وەکو ڕۆستەم بێ، کاتێک کە تەمەن بە کۆتایی نزیک دەبێتەوە بە ئەندازەی تاڵە موویەک لەگەڵ کەسانی دیکەدا جیاوازی نییە.

**_ گەرچی چەند ڕۆژێ بوو تەعلیمی تفەنگبازیی دەکرد**
**ڕۆستەم ئاسا چووە پارێز لە یەکێ تیتلە بیجاغ**
**هەر کە ئەنگاوتی وتم: دەک دەس و بازووت نەڕزێ**
**هەر کەسێ پێت نەڵێ ڕۆستەم تەرەسە و قوڕمساغ** (تاڵەبانی، ٢٠٠٣: ٦٨)

ئەگەرچی چەند ڕۆژێک بۆ تیر هاوێشتن و تفەنگبازی ڕاهێنانی دەبینی، وەکو ڕۆستەم خۆی بۆ دوژمن لە کەمین دانا، لەگەڵ پێکانی ئامانج گوتم: ئافەرین بۆ دەست و بازووی تۆ، هەر کەس بە تۆ نەڵێ ڕۆستەم، بێ غیرەت و بێ ئابڕۆیە.

**_ لە جوود و بەخشش و ئەنعامی خۆی و قەوم و ئەتباعی**
**وەکو شانامە و ڕۆستەم لە هەر جێ داستانێ بوو**

لە جەور و بەخشش و سەخاوەتی خۆیی و ئەقوام و پەیڕەوەکانی، وەکو ڕۆستەم و شانامە لە هەر شوێنێک باس باسی ئەوانە.

**_ سەعدی سەفدڕ مالیکی ئەژدەر هۆژبری پڕ هونەر**
**بێژەن و گیو ، تووس و نەوزەڕ، پووری دەستان هاتەوە**
**حەمد و لیلا باز لە بۆ قەتڵی سەری توورانییان**
**ڕۆستەمی مازەندەران سامی نەریمان هاتەوە** (تاڵەبانی، ٢٠٠٣: ٩٢)

سەعدی سەفدر، مالیکی ئەژدەر، هۆژبری پڕ هونەر، بیژەن و گیو، تووس و نەوزەڕ، پوری دەستان (ڕۆستەم) هات شوکری خودا دووبارە بۆ کوشتنی توورانییان ڕۆستەمی مازەندەران، سامی نەریمان هات.

**_دەست ڕژدی ئەمانە حاتەمێکە**

**هەر کوردێ لەوانە ڕۆستەمێکە** (ئەحمەدی خانی، ١٣٨٩: ١٠)

دەست و دڵ فراوانی ئەمانە وەکو حاتەمە، هەر کوردێ لە ئەوان وەکو ڕۆستەمێکن.

**_لە ئەسپی حودوودی دەبوو گەر سوار**

**دەلەرزی دڵی تووس و ئەسفەندیار**

**دەبا بەس بکەم باسی ئەو ڕۆستەمە**

**ئەوەندەی کە بدوێم لەودا کەمە** (فیدایی، ١٣٧٧: ٣٢)

هەر کاتێک سواری ئەسپی حودوود دەبوو، دڵی تووس و ئەسفەندیار دەکەوتنە لەرزین، ئیتر وەسفی ڕۆستەم ناکەم، چونکە هەرچەند بڵێم کەمە (لەبارەی ئەمیرخانی لەپ زێڕین یەکێک بووە لە فەرماندەکانی کورد).

**_وەکو ڕۆستەمی زاڵ بوو بۆ شەڕی**

**بە یەک دەست گرچوویی تورکی بڕی**

**دەڕازاوە بەزمێکی کەیخوسرەوی**

**بە ئاهەنگ و ئاوازی نەرم و قەوی** (فیدایی، ١٣٧٠: ٣٩)

فیدایی پێهەڵگوتراوەکانی خۆی لە مەیدانی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمناندا بە ڕۆستەمی زاڵ دەشوبهێنێ، وەکو ڕۆستەمی زاڵ لە جەنگدا بەیەک دەست (ئەمیرخانی لەپ زێڕین) دوژمنەکانی لەناو دەبرد، وەک بڵێی پاشا کەیخسرۆ هاتووە، لەهەرلایەکەوە ئاهەنگ و ئاوازی نەرم و بەهێز دەبیسترا..

**_ ئەگەر کۆوەبێ کورد لە بن پەرچەمی**

**سەرۆکێکی کوردی وەکوو ڕۆستەمی**

**کە ئەو خوسرەوە، خانی کوردم ئەمن**

**کە گورگی دڕە، کوردی مەردم ئەمن** (فیدایی، ١٣٧٠: ٤٥)

ئەگەر کوردەکان لە ژێر یەک ئالادابن، فەرماندەی کورد وەکو ڕۆستەم بەناوبانگ دەبێ، ئەو پاشا و من وەزیربم، گورگ ناتوانێ ڕووبەڕوومان بێتەوە، من پیاوێکی بوێری کوردم.

**_ قزڵباش چون نۆکەری خوسرەون**
**ئەگەر بێت خزمەت گوزاری ئەون**
**نەڵێ کەس کەوا خانی یەک باڵە ئەو**
**لە مەیدانی شەڕ ڕۆستەمی زاڵە ئەو** (فیدایی، ١٣٧٠: ١٤٤-١٤٣)

قزڵباشەکان واتا لەشکری سەرسوورەکان شیعەچین، نۆکەری خوسرەون ئەمانە چین لەبەرامبەر ئازایەتی و قارەمانێتی خوسرەوا، خزمەتکاری ئەون، نەڵێن خوسرەو تەنیایە، یا وەکو خانی لەپزێڕین یەک دەست و باڵی هەیە، بەڵام لە جەنگ و شەڕ بەیەک دەستییەوە وەکو ڕۆستەمە لە شەڕ و جەنگدا.

**_ وەزیر وای ئەو کاتە فەرموو بە میر**
**کە ئەی ڕۆستەمی کورد ئەی شێر گیر**
**لە بۆ کۆمەگی لەشکری خوسرەوی**
**دەبێ تۆ وەپێش عالەمی دی کەوی** (فیدایی، ١٣٧٠: ١٥٤-١٥٣)

ئەو کاتە وەزیر فەرمووی بە ئەمیرخان، کە ئەی ڕۆستەمی کورد شێر ئاسا بۆ یارمەتی خەسرۆ پاشا دەبێ پێشڕەوی هەموو لەشکرەکانی تریش بیت.

**_ کەوا بێ دەبێ نەچمە کن حاتەمی**
**بکەم روو لە شەڕ هەر وەکو ڕۆستەمی** (فیدایی، ١٣٧٠: ١٥٨)

ئەگەر بەم شێوەیە بێت، نەڕۆمە لای حاتەم، بڕۆمە مەیدانی کار زار وەکو چۆن ڕۆستەم دەڕۆیشت.

**_ بە بێ ترس وەکو ڕۆستەمی زاڵ بوون**
**لە کوورەی شەڕ و شۆڕدا قاڵ بوون** (فیدایی، ١٣٧٠: ١٧٤)

بەبێ ترس وەکو ڕۆستەمی زاڵ بوون لە مەیدانی جەنگ گرفتاری جەنگ و هاوار و دەنگ بوون.

**_ بە غیرەت وەکو رۆستەم و قارەمان**
**لە پیتۆڵیپا پیرەزاڵی زەمان** (فیدایی، ۱۳۷۰: ۱۹۱)

بە غیرەت وەکو ڕۆستەم و قارەمان لە ئازایەتی وەکو (زاڵ پیر)ی جیهان بوو.

**_ بە عەقڵ و بە تەگبیر وەک زاڵی زەڕ**
**وەکو رۆستەم بوو کە دەیکرد شەڕ** (فیدایی، ۱۳۷۰: ۲۳۲)

لە ڕووی هۆش و بیر و تەگبیرەوە، وەکو ڕۆستەمی زاڵی دەس ڕەنگین کە شەڕی دەکرد و دەجەنگا لەم ڕووەشەوە هەروەک ڕۆستەم بوو.

**_ وەک رۆستەم و رەخشە خۆی و ئەسپی**
**رمبازی و چوونە کێوە کەسپی** (فیدایی، ۱۳۸۰: ۷۳)

خۆی بە ڕۆستەم و ئەسپەکەی بە ئەسپی ڕۆستەم ( ڕەخش) دەشوبهێنێ کار و پیشەی تیر هاوێژی و ڕۆشتنە بۆ کێو و بیابان.

**_ بۆ جلیت بازی قسە و مەیدانی فێڵ و دەس بڕین**
**شاسوارێکم بە چەشنی رۆستەمی مازندەران** (قانع، ۱۳۸۸: ۵۰)

لە پاراوی زمان و سوارکاری و مەیدانی کەڵەک و فێڵ سوارکارێکی باشم، وەکو ڕۆستەمی مازەندەرانم.

**_ لاوی خوێن گەرمم بزانە خاکەکەت هەر نێعمەتە**
**حورمەتی خاکت بزانە موستەحەققی حورمەتە**
**مەعدەنی زیو و تەڵایەکانی دوڕ و سەروەتە**
**پێت بڵێم ئەم خاکە کامە تابزانی جەنەتە**
**یادگاری هۆزی ماد و زەند و پوری زاڵتە** (قانع، ۱۳۸۸: ۸۷)

لاوی خوێن گەرم بزانە، کە خاکەکەت پڕی نیعمەتە، قەدری بزانە، کە شایستەی قەدر زانینە، خاک جێگای زیو و زێڕ و سامانە، بڵێم کامە خاک تا بزانی، کە وەکو بەهەشتە ئەو خاکەی کە یادگاری نەتەوەی ماد و زەند و کوڕی زاڵە.

**_تفەنگی زۆر چاک فیشەک کارخانە**

**ئەت وت رۆستەمی مازەندەرانە** (قانع، ١٣٨٨: ١٢٥)

تفەنگەکەی باش و گوللەکەی کارگەیە وەک بڵێی ڕۆستەمی مازەندەرانە.

**_ هەمو زەخمێ بەدەن کوچەی دەر و دیو چۆن نەبێ یاران؟**

**کەسێ پێکراوی پەیکانی کەمانی پوری زاڵی بێ** (قانع، ١٣٨٨: ١٥٧)

هەموو بەشەکانی لەشی لە دەرەوە و ناوەوە چۆن برین نابێ دۆستان؟ کەسێک، کە بە تیری پوری زاڵ پێککراو بێ، قانع لە (پەرۆشی دڵ) دا پێکراوی و تێکشکانی دەشوبهێنێ بە پەیکانی کەمانی زاڵ.

**_هەڵم ئەکێشای وەک رۆستەمی زاڵ**

**دەفر شۆرینی ناو ماڵ و مناڵ** (قانع، ١٣٨٨: ٢٨٤)

لە چوارخشتەکی (نۆکەری پیر) ستایشی خانمی ماڵەکەی دەکا و هەڵی ئەکێشێ و دەیشوبهێنێ بە رۆستەمی زاڵ.

**_ مێشکی من مێشکی بەهێزە غیرەتم وەک ڕۆستەمە**

**ئیشی من خزمەت بە خاکە و فکری من قەهرە و عیتاب**

(قانع، ١٣٨٨: ٤٣١)

لە قەسیدەی (شێخی من)، قانع غیرەت و ئازایەتی خۆی بە ڕۆستەم دەشوبهێنێ.

**_ نایە لاوە ملک و ماڵ و عائلە و ڕۆح و ژیان**

**ڕۆستەمانە موکریانی کرد بە دەشت مازەندەران**

**پێشەوامان هەر بژی بۆ خزمەتی کوردی زمان** (قانع، ١٣٨٨: ٤١١)

لە پێنج خشتەکی (قانع و شەماڵ) دێتە سەر باسی چوار جەنەڕاڵەکەی کۆماری کوردستان، ڕۆستەم ئاسا ستایشیان دەکات.

**_خوا! کوا ڕۆستەمی ئەمڕۆ سەری خوێنخۆری بشکێنێ؟**

**خوا! کوا ئاگرێکی وا، کە پیاوی بەد بسووتێنێ؟** (قانع، ١٣٨٨: ٣٣٢)

پێنج خشتەکی وریای کوڕی قانع، لەسەر شیعری باوک، کە ئازایەتییەکەی بە ئازایەتی ڕۆستەم دەشوبهێنێ.

**_ شاری ڕەی بۆ ڕۆستەمە! جێی ڕەحمەو و ئەسمەر نیە**

**سەر کە خاڵی بێ لە فکری میللەتی قەت سەر نیە** (قانع، ١٣٨٨: ٣٤٦)

لە پێنج خشتەکی کوتەک لەسەر شیعری قانعی باوکی ئاماژە دەدات بە شاری ڕەی، کە جێگای ئەم قارەمانانەیە، کە ڕۆستەم ئاسابن.

**_لە دنیا تا دەگاتە ئاخیرەت کاریگەرە تیری**

**وەکو تیری تەهەمتەن زامی پاک ئەم دیو و ئەو دیوە**

(مەحوی، ١٣٨١: ٣٣٠)

تیری نەفس لە هەرکەس بدا، لەم دنیایەوە دەڕوا و لەو دنیایەوە دەردەچێ و تووشی سزا و دەردی دنیا و قیامەتی دەکا، وەک تیری تەهەمتەن، کە لە هەرکەسی دابێ ئەم دیو و ئەو دیوی کردووە.

**_ بە شیرینی نەگەهت دەست ئەگەر رۆستەم بت**

**دی بە بازوو ملان شوبهەتی فەرهاد چکەت؟** (مەلای جزیری، ١٣٦١: ١٢٩)

سوێند بە شیرینیی نیگات، ئەگەر خوا بیەوێت کار سەر دەگرێت، ئەگەر نەیەوێت، چە بگات بە فەرهاد هەتا ڕۆستەم کە لە فەرهاد بەهێزترە.

**_ موعجیزەی (موسی) کە رووی دا سیحر و جادوو چی دەکا**

**هیممەتی رۆستەم ببێ مەکر ئەفکەنی گورگین چییە؟** (ناری، ١٣٨٣: ١٣٠)

حەزرەتی موسی ئەگەر موعجیزە بکات، سیحر و جادوو بەتاڵ ئەکاتەوە، پیاوەتی و ئازایەتی ڕۆستەم ئەگەر ببێ مەکر و حیلەی گورگین شتێک نییە، بەهای نییە.

**_بۆ عەدالەت شاهی کیسرا بۆ سەخاوەت حاتەم صیفەت**
**بۆ فیراسەت پووری سینا وەک توهەمتەن بۆ هونەر**

(ویسالی، بی‌تا: ٢٨٦)

لە دادپەروەریدا شای کیسرا و لە سەخاوەتیشدا سیفەتی حاتەمی تەی هەیە، لە زیرەکی پووری سینا، بۆ هونەریش وەکو توهەمتەن بووە.

**١-٢-٢- خۆڕاگری پاڵەوانێتی ڕۆستەم:**

ڕوون و ئاشکرایە لە پاڵ وێناکردنی پاڵەوانێتی ڕۆستەم بە ئازایەتی و سەرکەوتن وێناکردنی خۆڕاگریش لە خۆ دەگرێت چونکە بەبێ خۆڕاگری بێ گومان سەرکەوتن نابێ و سەرناگرێت وەکو لەم دێڕە شیعرانەی خوارەوەی بێخود دا دەردەکەوێت:

**_ لە هەفت خوانی سینەدا موژەی خەدەنگی ڕۆستەمە**
**لە فەتحی (خەیبەر) دڵا برۆی لە (ذوالفقار) ئەکا**

(بێخود، ١٣٨٦: ١٧)

بۆ گەیشتن بە حەوت خانی ڕۆستەم تۆ دەبێ وەکو ڕۆستەم سەختییەکی زۆر بکێشی، بۆ بەدەستهێنانی دڵ تۆ دەبێ هەوڵێکی زۆر بدەی، وەکو چۆن ئەگەر (ذوالفقار) عەلی نەبووایە (خەیبەر) ڕزگار نەدەکرا.

**_ بە تێغی شەرع و دیرعی وەرع و بەرزی عیلم و گورزی زوهد**
**خودا بیکەی بە سەر هاوعەسری خۆیا وەک (توهەمتەن) زاڵ**

(بێخود، ١٣٨٦: ٥٢)

بە شمشێری شەریعەت و لباسی جەنگ و مەقامی بەرزی زانست و گورزی زوهد، بە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هاوشانی سەردەمی خۆی براوە دەبێ وەکو چۆن ڕۆستەمی براوە کرد .

**١-٢-٣- وێنا کردنی کەمی توانایی پاڵەوانێتی ڕۆستەم:**

زۆرجار شاعیرانی کلاسیکی کوردی بە سوود بینین لە ڕەوانبێژی پێهەڵگوتراوەکانی (ممدوح) خۆیان بە کەمتر یا زیاتر لە توانای ڕۆستەمی زاڵ وێنا دەکرد لە شیعرەکانیاندا لێرەدا بە چەند دێڕە شیعرێک ئەمە دەخەینە ڕوو کە هەرچەندە ڕۆستەم پاڵەوانە بەڵام لە ئاستی پێهەڵگوتراوەکانیاندا توانای پاڵەوان کەمە شاعیران هەندێک جار لەبەر هەستی نەتەوەیی زیادەڕەویان (اغراق) دەکرد چونکە کورد هەمیشە بە درێژایی مێژوو لە نەتەوەیەکی ئازاردراو و چەوساوەدا بوونە لە بەرامبەر دوژمندا.

**_ ڕۆستەم دەسی بەسترابوو لای ئەو**
**بۆ جوانی نەبوو یەکێکی تای ئەو**
**سەر تۆپی کوڕان و ناوی گورگین**
**مەرد و بە ئەمەگ گران و سەنگین** (ئەحمەدی خانی، ١٣٨٩: ٨٢)

لەلای گورگین خان ڕۆستەم کەسێکی دەست بەستراو زیاتر نەبوو، لە جوانیشدا بێ هاوتا بوو، ناوی گورگین بوو وە لە هەموو کوڕان لە پێشتر بوو پیاوێکی بەواتا تەواو شیرین و کەسێتی تایبەت بە خۆی هەبووە.

**_ تاقەت و سەبرم ئەگە ڕووبینتەنی ئەفراسیاب**
**ڕۆستەمی هیجری لە ئەرزی داوە دەستی بەستووە**

(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ١١٤)

خەم مەخۆ بۆ نان و خوانت، تاقەت و سەبرم ئەگەر ئەو پاڵەوانە بەهێزەیە، کە تیغ کار لە جەستەی ناکات، ڕۆستەمی لە ئەرزداوە و دەستی بەستووە.

**_ عەقڵەکی خوا داویە گەر پیرەژن سەرفی بکا**
**دەستی ڕۆستەم بادەدا تووران لە ئێران دادەنێ**

(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ١٥٦)

عەقـڵ و بیـر کە خـوا بە کەسـێکی بـدات، ئەگەر پیرێـژنیش بـێ، ڕۆستەم شکست پێدێنێ و توووران دەهێنێتە ئێران.

**_بە سەر رۆستەمی زالا ، زاڵ ئەبوو**
**دوشمن لە نەعرەی ، عەیشی تاڵ ئەبوو** (پیرەمێرد، ۲۰۱۰: ٤٧٢)

بەسـەر ڕۆسـتەمی زاڵـدا زاڵ ئەبـوو، لە هێـز و توانـادا بە هێزتـر بوون، خۆشی و شادی دوژمن لە هاوار و نەعرەی ئەو تاڵ ئەبوو .

**_دارێک بوو یەک جار ، هەر وەک مشتومال**
**هەزار ڕۆستەمی ئەخستە ناو چاڵ**
**پێی بەبۆن ئەکەوت ئەمرد ، دایکی ئاڵ**
**تیری برژانگی ، وەک خەدەنگی زاڵ** (پیرەمێرد، ۲۰۱۰: ٥٢٩)

دارێـــک بـــوو کە بە یەک جـــار هەزار ڕۆســـتەمی بـــێ هێـــز دەکرد...برژانگەکانی وەکو تیری خەدەنگی ڕۆستەمی زاڵ بوو.

**_ وەکوو شێر ئاوی لە جێ ماڵ نا**
**لەشی رۆستەمی هەر لە نێو چاڵ نا** (فیدایی، ۱۳۷۰: ۹٥)

فیدایی ئیدیۆمێک بەکاردەهێنێ بۆ پێهەڵگوتراوەکەی، کە وەکو شێر شکست بە دوژمنەکەی دێنێ و لەناوی دەبات.

**_دڵی رۆستەمی زاڵ لەت لەت دەبوو**
**ئە لەو کاتە بێ سام و هەیبەت دەبوو** (فیدایی، ۱۳۷۰: ۱٦٥)

دڵـی ڕۆسـتەمی زاڵ لەت لەت دەبـوو، لەو کـاتەدا کە ئـازایەتی و هەیبەتی لەدەست دەدا.

**_ ئەگەر چی وەکو رۆستەمی زاڵ بوون**
**ئە لەو وەختە بێ دەست و بێ باڵ بوون** (فیدایی، ۱۳۷۰: ۲۳٤)

ئەگەر چی وەکو ڕۆستەمی زاڵ بوون، بەڵام لەو کاتەدا وەک بلێی دەست و قاچیان بەسترابوو.

**_ بە شەربەتە ئەو دەمەی کە کاسم**
**خۆ نیمە لە رۆستەما هەراسم** (فیدایی، ۱۳۸۰: ۸٥)

هەتا کاتێک لە جەنگدا گێژ ببووم لە ڕۆستەم هیچ باکم نییە.

**_ یەک دێوی بە شەڕ دەخا لە نێو بەند**
**یەک چەرمی لە شانی ئەژدەها سەند**
**بەورن لە کولێن و کونجی ژووری**
**ڕۆستەم گر و گورگی سەر تەنووری** (فیدایی، ١٣٨٠: ١٤٦)

لە جەنگدا جەنگاوەرەکان لە سەنگەری دوژمن وەکو بەور ئازان، ئەگەر ڕۆستەمیش بێ ئەسیری دەکا، وەکو گورگ لەسەر ئاگری تیژ دەڕۆن.

**_ هەتا کورد بێ دەوڵەت و ماڵ بێ**
**سەری شۆڕە گەر ڕۆستەمی زاڵ بێ** (فیدایی، ١٣٧٠: ٧٤)

تا کورد دەوڵەتی نەبێ، ژێر دەستەیە، هەتا ئەگەر ڕۆستەمی زاڵیش بێ.

**_ بەچکە شێرانی عەشایر بۆ قڕانی دوشمنان**
**هەر وەکو ڕۆستەم ئەکەونە هاتو چۆو جەولانەوە**

(ئەحمەد موختار جاف، ١٩٨٦: ١٣٥)

ئەحمەد موختار بەگی جاف (١٨٩٥ - ١٩٣٢م)ی شاعیر، وەکو شۆڕشگێڕێک لە کاروانی بەرەوپێشچوونی شیعری نەتەوەکەی خۆی و ڕۆژهەڵات دانەبڕاوە، بە زمانێکی تایبەتی شاعیرانەی خۆی شیعرەکانی داڕێژراون بە مەبەستی ئاماژەدان بە توانا و بوێری هەر تاکێک لە گەل و نەتەوەکەی، کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنان ڕۆستەم ئاسا دەجەنگان.

**_ بە قولاپی مژە و حەڵقەی کەمەندی زوڵفی چین چینم**
**ئەگەر بێ ئارەزووم بێ ڕۆستەم و ئەسفەندیار ئەگرم**

(ئەحمەد موختار جاف، ١٩٨٦: ٨١)

بە قوڵاپی برژانگ و حەڵقەی کەمەندی زوڵفی چین چینم، ئەگەر خوازیاربم ڕۆستەم و ئەسفەندیار ئەگرم.

**_چی‌یە ئەم قووەتە وا ئینس و جین مەجذووب و مەغلووبن؟**

**کەمەندی رۆستەمی دەستانە یا زەنجیری شێرانە** (نەقشی، ١٣٨٦: ٤٣)

ئەمە چ هێــزێکە، کە (ئیــنس و جــن)ی بۆخــۆی ڕاکێشــاوە و شکاندوونی؟ کەمەندی ڕۆستەمی دەستانە یا زنجیری شێران.

**_ بولبول لە شاخساری چەمەن باربود نەوا**

**گوڵ نایەسەر بە شەوقو شەغەف تاجی خسرەوی**

**سەد زۆری ڕۆستەمی نیەتی زۆری سیم و زەر**

**طالع ئەگەر ضعیف بێ پەنجە با قەوی** (سالم، بی‌تا: ـ ٢ـ ١٥١)

سەد هێزی ڕۆستەم توانای کاریگەری وەکو زێڕ و زیوی نییە هەرچەند کە بازووی مرۆڤ بە هێز بێت، ئەگەر بەخت بێ هێز و خراپ بێت، چارەیەکی نییە.

**_ ڕۆستەمی مازیندەران شێری ژیان بەبری بەیان**

**ناگرن بەرگەی هوجوومی عەسکەری قازاخی کورد!**

(کەمالی، ١٩٨٦: ٦٠)

ڕۆســتەمی مازەنــدەران، شــێری ژیــان و بەبــری بەیــان، نــاتوانن بەرامبەر هێرشی لەشکری کوردان بەرگە بگرن.

**_ ئەگەر ئەو دەستە دەستی ڕۆستەم بێ**

**لە خوام داوایە ئێفلیچ و کەم بێ** (وەلی دێوانە، ١٩٧٩: ٥١)

ئەگەر ئەم دەستە دەستی ڕۆستەم بێ لە خوا داوا دەکەم کە بێ دەسەڵاتی بکات.

**_ دڵی هەر بۆیە خۆشە (کامیلی) بێ دەست و پێ ئێستێ**

**کە فەرقی ڕۆستەم و پیاوێکی وا بێ دەست و پا ناکەی**

(ئاوات، ١٣٨١: ١٢٣)

دڵی کامیلی بۆیە خۆشە کە جیاوازی لە نێوان ڕۆستەم و پیاوێکی بێ دەست و پێ ناکات.

**١-٢-٤- وێنا کردنی سادەیی تاج و تەختی پاڵەوانێتی ڕۆستەم:**

هەرچەندە ڕۆستەم وێناکردنێکی پاڵەوانانەی هەیە بە شێوەیەکی گشتی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سادەیە لە تاج و تەخت وەکو لەم دێڕە شیعرەی خوارەوەی ڕەنجووری ئاماژە دەدات کە تەخت و جێگای ڕۆستەمی قارەمان وەکو پێخەفی بەندەکان سادەیە.

**_ کورسی ڕۆستەمی قارەمان سامان**
**بی‌یەن وە یاتاغ سادە غوڵامان** (ڕەنجووری، ١٩٨٣: ٦٦)

**١-٢-٥- ناپایەداری جیهان بۆ مرۆڤ و پاڵەوانێتی ڕۆستەم:**

جیهان ناپایەدارە بۆ هەموو ئەوانەی ڕۆستەم ئاسان وەکو پادشایەکان و دەسەڵاتداران و ناودارانی کە ڕۆستەم ئاسا لە ژیاندا بوون جیهان بۆکەس نییە هەتا سەر وەکو لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا دەردەکەوێت.

**_ئەگەر چی پووری زاڵە پیرە زاڵە ڕۆستەمی دونیا**
**وەکو زولفی تەبان شێواوە حاڵی دەرهەمی دونیا**
**هەموو کاتێکی مەحکوومی نەمانە عالەمی دونیا**

(کەمالی، ١٩٨٦: ٢٠٢)

جیهان ئەگەر چی کوڕی زاڵە پیرێکی زاڵمە وەکو زوڵفی یار پەرێشان و ئاشوفتەیە ژیانی سەر زەوی بۆ کەس هەتا سەر نییە، هەرکاتێک دەبێ خۆت بۆ ڕۆشتن ئامادەبکەی.

**_ کامە لوقمانە کەوتە چەنگی پیری، دەستی بانەدا**
**کامە ڕۆستەم تووشی بوو، نەیخست و دەست و پێی نەبەست**

(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ٤٧)

کامە رۆستەم ئاسا هاتە سەر دنیا و وەفاتی نەکرد لە جیهاندا هیچ کەسێک پایەدار نییە، هەتا خەسرۆ پاشا و دارا، لوقمانی حەکیم و ڕۆستەمی جەنگاوەر.

**_ بە جاهی خۆت مەنازە رۆستەمی قابیز لە ریتایە**
**ئەگەر سەت شاهی چینیش بێ کیشکت هاتە بەر ماتی**

(بێخود، ١٣٨٦: ١١٤)

بە جێگا و مەقامی خۆت مەنازە، ڕۆستەمی مەرگ لەسەر ڕێگات ڕاوەستاوە، ئەگەر وەکو پاشای چین سەد ئەوەندە بەهێزبیت، مەرگ بە سۆراغت دێت.

**_کوانێ شاهی ئەسکەندەر، کوا سولەیمانی زەمین؟**
**کوا تەخت و تاجی جەمشید، کوانێ شەددادی بێ دین؟**
**کوا پەشەنگ و کەیقوباد کوا ڕۆستەمی سەهمگین؟**
**کوا عەدلی نەوشیرەوان، کوانێ جوودی حاتەمین؟**
**کوانێ پیری کۆنە سال، کوا جوانانی نازەنین؟**
**هەمووی جوون و قووتی دان، ئەو لەعینی نائەمین**

(ویسالی، بی‌تا: ٢٦١)

لێرەدا شاعیر ویسالی ڕوودەکاتە زەمانە و خەمی خۆی بەشیعر دارشتووە بۆ نەمانی ناوداران، پاڵەوانەکان بۆ تەخت و تاج و دەوڵەتەکانی، کە لە مێژووی کوردا دەوریان هەبووە، مەخابن ئێستا نەماون، هەموو نەماوی دەستی زەمانەی لەعینن، وەکو ئەسکەندەر تەختی سلێمان، تاج و تەختی جەمشید و پاشا و ناودارانی مێژووی کۆنی کورد کوان؟ ئێستا نەماون؟ زەمانە هەمووی جوین و قووتی‌دان.

**_ کوانێ جەمشید و ڕۆستەمی زاڵت؟**
**کوا کەریم خان؛ خان و خانانت؟** (قانع، ١٣٨٨: ١٠٢)

لێرەدا شاعیر ئاوات دەخوازێت بۆ بوونی جەمشید پاشای پێشدادییەکان و ڕۆستەم، کەریم خان و خانی لەپ زێرێن، کە ئێستا نەماون، بۆیە ئێمەی کورد بێ خاوەن ماوین.

**_ ئەی وەتەن کوا ڕەونەقی عەسری صلاح‌الدین تۆ؟**
**ئەی وەتەن کوا نەعرەتەی سەد ڕۆستەم و گورگین تۆ؟**
(قانع، ١٣٨٨: ١١٢)

**_ کوانێ دیاکۆی شاری هەمەدان**
**کوانێ ڕۆستەمی دەشتی مازندەران** (قانع، ١٣٨٨: ٤٣٨)

لەم چوار دێڕە شیعرەی سەرەوە قانع لە لاواندنەوەی پاڵەوانەکانی ڕووی زەمین کە نەماون شیوەن دەگێڕێ، دیاکۆی دامەزرێنەری دەوڵەتی ماد کە شاری هەمەدان پایتەختەکەی بووە، شیوەن بۆ نەمانی ڕۆستەمی مازەندەران دەگێڕێ هەروەها بۆ سەردەمی صلاح الدین بۆیە ئێمە واین، چونکە ئەم پاڵەوانانە نەماون .

**_ ئەی وەتەن سەد حەسرەتا بۆ غیرەتی عەهدی قەدیم**
**بۆ صلاح‌الدین و عادڵ بۆ قوباد و بۆ کەریم**
**کوانێ نەعرەی ڕۆستەمت کوا بیژەنی بێ ترس و بیم**
**شێرەکانت مردن و بێ کارەکان ساغ و سەلیم**
**شێرەکان نەماون بێ کارەکانیش ساغ و سەلیم.** (قانع، ١٣٨٨: ٧٤)

**١-٢-٦- وێنا کردنی ڕۆستەم وەک زوڵم لێکراو:**

حاجی قادر لە ڕێی داستانی ڕۆستەم و سهراب کاتێ ڕۆستەم کەوتە بەر زوڵمی نزیکان و پاشای سەردەمی خۆی بەدەستی باوکی، سهرابی کوڕیان بە کوشت دا وەکو لەداستانی یوسف و زولێخا، کە یوسف خزم و براکانی زوڵمیان لێکرد، باسی زوڵم لێکراوی خۆی دەکات وەبیری خوێنەر دەهێنێتەوە بۆ پیشاندانی ئەو زوڵمەی لێی‌کراوە.

**_ ئەو دەمی هاتمە سەر شەکوە لە خزم و کەسی خۆم**
**ڕۆستەم و یوسفی گوڵ پیرەهەنم کەوتەوە بیر**
(حاجی قادر کۆیی، ٢٧٠٧: ٦٣)

**ئەنجام:**

گرنگترین ئەنجام لە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی پێگەی کەسێتی ڕۆستەمی زاڵ لە شیعری کلاسیکی کوردیدا لەم خاڵانەی خوارەوە گەڵاڵە دەکرێت:

١- شانامە هێمایەکی جیهانییە کە شیعری کلاسیکی کوردی لە نێو هەموو ئەدەبیاتەکانی تر زیاتر پێی کاریگەر بووە لە ڕووی کەسێتییەوە، بەرهەمێکی حەماسییە زیاترین کاریگەری لەسەر بەرهەمێکی شیعرییە کە بەکارهێنانی حەماسی هەیە و شاعیرەکان لە پەروەردەکردنی ناوەڕۆک و بابەتەکانیان بەکاریان هێناوە وەکو حاجی قادری کۆیی، قانع، فیدایی لە بەرهەمی دمدم نامە ڕەنگی داوەتەوە، ڕۆستەم کەسێتییەکە لەنێو کەسێتییەکانی شانامە هەڵگری زۆرترین جلوە و بەکارهێنانە لە ئەدەب و شیعری کوردی زۆرترین وێناکردنی بە ئازایەتی و بوێرییە، خۆشەویستترین کەسێتی و قارەمانی شانامەی فیردەوسییە لەم ڕووەوە شاعیرانی وەکو ئەحمەدی خانی پێ هەڵگوتراوەکانی خۆیان بە ڕۆستەم داناوە.

٢- شاعیرانی کلاسیکی کوردی لەنێو کەسێتییەکانی شانامەدا کەسێتی ڕۆستەم بە کەسێتییەکی نەتەوەیی و سەرەکی و ڕاستەقینە و کوردی دەزانن هەستی بێگانەبوون لەگەڵ کەسێتی ڕۆستەمدا هەستی پێ ناکرێت، داستانەکانی شانامە جێگای سەرنجی شاعیرانی کورد بووە و زۆرینەی شاعیرە کوردەکان ئاوڕیان لە داستانی مێژوویی شانامەی فیردەوسی داوەتەوە وە بە لێهاتوویی نەرمی و جوانی و زەریفییەکانی وەرگرتووە و لەنێو شیعری کوردیدا بەکاریان هێناوە.

٣- شاعیرانی کورد کەسێتییەکانی شانامەیان وەرگرتووە بەمەبەستی داهێنانی ناوەڕۆکی نوێ لە شیعرەکانیان لە ڕووی ڕەوانبێژی: داهێنانی تازە و تازەگەریی هاوچەرخ جاروبار لە هەندێ بابەتی تر لەلایەنی ڕەوانبێژی وەک لێکچوون (تشبیە)و خواستن (استعارە) بەکاریان هێناوە، کەسێتییە دیارەکانی نێو شانامەی

فیردەوسی جگە لە ڕۆستەم لە شیعری شاعیرانی کوردی ئاماژەیان پێکراوە وەکو ئەسفەندیار، کاوە، کەیخسرۆ، جەمشید، بەهرام هەروەها شاعیرانی کورد وەکو سەلیقەیەکی ئەدەبی سوودیان لە شانامە و هێماکانیان وەرگرتووە و بۆ جوانکاری لە شیعری کلاسیکدا بەکارهێناوە.

٤- بەکارهێنانی کەسێتییە پاڵەوانەکانی شانامە بەتایبەت ڕۆستەم بۆ گەیاندنی پەیامێکە کە شاعیرانی کورد توانا و هێزیان هەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمنانیان هێمایەکن لە قارەمانانی میللەتەکەیان کە هەمیشە لە نەبەرد و ڕکابەری لەگەڵ دوژمنانیان وەسف و ستایش کراون.

**سەرچاوە کوردییەکان:**


- ئـاوات، سـەیدکامیل ئیمـامی زەنبیلـی (١٣٨١ش.)، دیـوانی ئـاوات، لێکۆڵینـەوە و لەسەرنووسینی سەید نەجمەدینی ئەنیسی، مەهاباد: ڕەهرەو.
- ئەحمەد موختار بەگی جاف، (١٩٨٦م.)، دیوانی ئەحمەد موختار بەگ، کۆکردنـەوەی عیزەدین مستەفا ڕەسول و ئەفراسیاب ئەحمەد موختار، بەغدا: الادیب .
- بێخود، مەلا مەحموودی موفتی (١٣٨٦ش.)، دیوانی بێخود، کۆکردنەوە و ڕێکخستن و لەسەر نووسینی محەمەدی مەلاکەریم، سنە: کوردستان.
- پیرەمێرد، تۆفیق مەحمود (٢٠١٠ م.)، دیوانی پیرەمێرد، سلێمانی: شڤان.
- تاڵـەبانی، شـێخ ڕەزا. (٢٠٠٣م.)، دیـوانیشـێخ ڕەزای تاڵـەبانی، لێکدانـەوەی شـێخ محەمەدی خاڵ و ئومێد ئاشنا، هەولێر: کتێبخانەی گشتی ڕۆشنبیری و هونەری.
- حـاجی قـادری کـۆیی (٢٧٠٧ک.)، دیـوانی حـاجی قـادری کـۆیی، لێکۆڵینـەوە: سـەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، پێداچوونەوەی مەسعوود محەمەد، سنە: کتێبی میدیا.
- حەقیقی، عەباس، (٢٠٠٩م.)، دیوانی حەقیقی، چ٢، سنە: ژیار.
- فیدایی، مەلا کەریم (١٣٧٧ش.)، دمدمنامە، ئامادەکردنی سەید محەمەد سەمەدی، سنە: سەقز.
- قانع، محمد شێخ قادر (١٣٨٨ش.)، دیوانی قانع، سنە: مەردۆخ.
- کـەمالی، عـەلی باپیرئاغـا (١٩٨٦م.)، دیـوانی کـەمالی، ئامـادەکردنی شـوکور مسـتەفا، بەغدا: بێنا-.
- کۆکەیی، مەلا مارف (بێتا)، دیوانی مەلا مارفی کۆکەیی، بێجا: بێنا.
- گودەرزی، سیاوش (٢٠١٢)، شـانامەی کوردی داسـتانی ڕۆسـتەم و زۆراب، هەولێر: ئاراس.
- حوسێن، هیمداد (٢٠٠٧م.)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، هەولێر: ئاراس.
- مەحوی، مـەلا محەمـەدی کوڕی مـەلا عوسـمانی بـاڵخی (١٣٩١ش.)، دیوانی مـەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و محەمـەدی مـەلا کـەریم، سنە: کوردستان.
- مەلای جزیری، شـێخ ئەحمـەد (١٣٦١ش.)، دیوانی مـەلای جزیـری، شـەرحی مامۆسـتا هەژار، تاران: سروش.
- مسـتەفا ڕەسـوڵ، عێزەدین (٢٠١٢م.)، مێـژووی ئـەدەبی کـوردی، بـەرگی١، سـلێمانی: بێنا.

- ناری، مەلا کاکە حەمەی بێلوو کوڕی مەلا ئەحمەد (١٣٨٣ش.)، دیوانی ناری، سنە: کوردستان.
- نالی، مەلا خدری کوڕی ئەحمەدی شاوەیسی مکائیلی (١٣٨٢ش.)، دیوانی نالی، بۆکان، ژیوار.
- ڕەنجووری، سەید محەمەد (١٩٨٢م.)، دیوانی ڕەنجووری، لێکۆڵینەوە و شەرحی مەلا عومەری زەنگەنە و محەمەد عەلی قەرەداغی، بەغدا: ئافاق.
- سالم، عبدالرحمن بەگ (بی‌تا)، دیوانی سالم، هەولێر: کوردستان.
- عبداللە مصطفی، ئیدریس (٢٠٠٦م.)، قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی، هەولێر: بی‌نا.
- ویسالی، جەمال محەمەد محەمەدئەمین (بی‌تا.)، دیوانی ویسالی، بەغدا: وەزارەتی رۆشنبیری.
- خانی، احمد (٢٠١٠م.)، مەم و زین، شەرح و لێکدانەوەی مامۆستا هەژار، سلێمانی: ئازادی.
- خەزنەدار، مارف (٢٠١٠م.)، مێژووی ئەدەبی کوردی، (٧ بەرگ)، هەولێر: ئاراس.


**سەرچاوە فارسییەکان:**


- اسلامی ندوشن، محمد علی (١٣٩٠ش.)، داستان داستان‌ها، تهران: شرکت سهامی.
- شفیعی کدکنی، محمد رضا (١٣٨٧ش.)، صور خیال در شعر فارسی، چ١٢، تهران: آگه.
- محمود گورانی، مصطفی (١٣٨٩ش.)، شاهنامەی کردی، ایرج بهرامی، تهران: آنا.
- نقشی، محمدخان بیگ (١٣٨٦ش.)، قصیده سماعیه، محمد رئوف توکلی، تهران: توکلی.
- یاحقی، محمد جعفر (١٣٧٦ش.)، بهین‌نامەی باستان، چ ٥، مشهد: آستان قدس رضوی.
- زرین‌کوب، عبدالحسین (١٣٨٩ش.)، با کاروان حله، تهران: علمی.
- فردوسی، ابوالقاسم (١٣٨٢ش.)، شاهنامه (بر اساس چاپ مسکو)، ٢ جلدی، تهران: هرمس.
- شعبانی، اسدالله (١٣٧٨ش.)، قصەهای شیرین شاهنامەی فردوسی، تهران: پیدایش.
- صفا، زبیح الله (١٣٦٣ش.)، حماسه سرایی در ایران، تهران: امیر کبیر.
- کزازی، میر جلال‌الدین (١٣٧٠ش.)، مازهای راز، تهران: مرکز.

**چکیده:**

شـاهنامه اثـر عالیقـدر و مسـتطاب فردوسـي، در زمـره ٔ آثـار گرانبهایی است که نه تنها زبان و ادب فارسی را از زنده نگهداشته، بلکه ظرافتها و نکتهسنجیها و دقایق آن به دیگر زبانها و ادبیاتهاي جهان راه پیدا کرده است. زبان و ادبیات کردی یکی از متأثرترین نمونههای ادبیات جهان میباشد که از ادبیات فارسی به ویژه از شاهنامه تأثیر پذیرفته است. این تأثیرپذیری تنها منوط به یکی از جنبههای حماسهسرایی فردوسی نیست، بلکه در بیشتر موارد میتوان این تأثیرپذیری را جستجو و بررسی کرد. شخصیتهای شاهنامه یکی از مواردي است که ميتوان دنبالۀ آن را در ادبیات کردی بررسی و تحلیل کرد، دراین تحقیق جنبههای شخصیت رستم را که بیش از اسامی دیگر شاهنامه مدنظر شاعران کلاسیک کردی بودهاست، مورد بررسي قرار میگیرد نمود شخصیت رستم در شعر و ادبیات کردی به گونهای است که هر شاعر کرد بسته به درک و مطالعهای خود ازشاهنامه ، شخصیت های را که دارای خصلت پهلوانی بوده، برگزیده و حسب حال ممدوح یا شعر خود آن را پرورده ومضمون نو وبدیع آفریده است، رستم از این دسته شخصیت های است که هم در شاهنامه و هم درشعر شاعران کلاسیک کرد نقش برجستهاي دارد.

احیانا شاعران کرد ممدوحان خودرا از لحاظ دلیری وپهلوانی به شخصیت برجستهای شاهنامه رستم تشبیه کردهاند وگاهی نیز با تشبیه تفضیل ممدوح را قوی تر و برتر از رستم ویا هم ردیف او توصیف کرده اند.آن چه حائز اهمیتاست دراین آثار به اسامی دیگری غیر از شخصیت های انسانی توجه شده است همانند سیمرغ ونمادهای دیگر مانند هفت خوانرستم تصویری جالبی از آنها کشیده و اسپرخش و اژدهاو و رويين تن، حتی نام شخصیت  فردوسی و اثرش شاهنامه در شعر شاعران کرد نقش گرفته اند.

کلید واژهها : شانامه ی فردوسی ، رستم زال، شعر شاعران کلاسیک کرد

## Abstract

**Rostami Zal's Legendary Hero in Shahnameh Firdowsi among the Poems of the Kurdish Classical Poets.**

Shahnameh is a long epic poem written by the Persian poet Ferdowsi, it is the national epic of Iran. This literary masterpiece had been translated into many different languages.

It influenced the language and literature of other countries in the world. Kurdish literature is one of the clear example that influenced by the Persian literature especially Shahnameh. This influence can be seen in many aspects.

This study focuses on the character and role of Rostami Zal among the other figures of Shahnameh, which is clearly revealed in the literary works of the Kurdish classical poets. Rostam's legendary hero was very popular among the storytellers which is entitled Rostam and Zorab or Zorabnama . Also, the influence can be seen in the Folklor poems and idioms.

He was such a prominent figure that Firdowsi have struggled thirty years to write about this epic poem which consisting of Five thousand rhyming couplets; and to keep Persian (Ajam) from Arabic.

The content of the epic tackles the Iran's ancient history, the struggle of the Persian kings; how they won or defeated in the war, and stories of love. Moreover, it is about the birth of Zal and he registered some happy and sad events which are about his own personal life. From the beginning till the end of the epic one can notice that there are different stories and events which lead the epic to be a distinguished masterpiece.

Rostami Zal's hero and character has provided an inspiration for many literary works of the Kurdish poets. Sometimes, they exaggerated in praising the character of their works more than Zal. In addition to the characters of protagonist and antagonist in the epic; places and legendary animals such as Smeagol, and (Hawt xani) Rostam are depicted attractively in the literary works of kurd as well.

# هاوواتایی له دیوانی (کامەران موکری)دا

**م. ی. مەسعود بەکر ئەحمەد**
بەشی کیمیای ژیانی کلینیکی
کۆلێژی زانستە تەندروستییەکان
زانکۆی هەولێری پزیشکی

**پێشەکی**

هاوواتایی دیاردەیەکی زمانییە و بەشێکی گرنگی پەیوەندییە واتاییەکان پێکدەهێنێت و لە گشت زمانەکانی جیهاندا هەیە، ئەگەرچی ڕێژەیان لە زمانێک بۆ زمانێکی تر جیاوازە، هاوواتایی کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە سەر فەرهەنگی زماندا بۆ ڕوونکردنەوەی واتای وشەکان. ئاشکرایە زمان بەردەوام لە گەشە و گۆڕاندایە، بەهۆی ئەم گەشە و گۆڕان و پێشکەوتنەی زمانیش دیاردەی هاوواتاییش پەرە دەسێنێت و گەشە دەکات. هاوواتایی لە زمانی کوردیدا زۆر بە ڕوونی هەستی پێدەکرێت و لەم دیاردە زمانییە بێبەش نییە، ئەم توێژینەوەیە باس لە دیاردەی هاوواتایی دەکات، کە بابەتێکی سەرەکیی زمانە لە چوارچێوەی پەیوەندییە واتاییەکانی نێوان وشەکان.

هۆی هەڵبژاردنی توێژینەوەکە ئەوەیە، کە هاوواتایی بابەتێکی گرنگە لە زماندا، بۆیە ئێمە هەوڵمانداوە بەشێوەیەکی ورد و پوخت باس لە دیاردەی هاوواتایی بکەین لە زمانی کوردیدا.

سنووری توێژینەوەکە لە ئاستی واتاسازی وشەدایە لە چوارچێوەی ڕستە و دەقی شیعری لە دیوانە شیعرییەکانی کامەران موکریی شاعیردا.

گرنگی توێژینەوەکە ئەوەیە، کە بە شێوەیەکی کارەکی و ورد باسمان لە دیاردەی هاوواتایی کردووە لە زماندا بەگشتی و لە زمانی کوردیش بەتایبەتی بەپشت بەستن بەنموونە هاوواتاییەکان لە (دیوانی

کامەران موکری)دا، لەگەڵ لێکدانـەوە و شـرۆڤەکردنی وشـە هاوواتاکـان و تیشـک خسـتنە سـەریان بـە شـێوەیەکی پراکتیکی لـە زمـانی کوردیدا. توێژینەوەکە لە پێشەکی و دوو بەشی سەرەکی پێکدێت و بـە ئـەنجام و سەرچاوەکان کۆتایی پێدێت.

بەشـی یەکـەم، لـە سـێ تـەوەر پێکهـاتووە. تـەوەری یەکـەم ئـەم بابەتانــە لــەخۆدەگرێت: هاوواتــا لــە ڕووی زاراوە و زمانەوانییــەوە، چــەمکی هاوواتـایی، بیروبۆچـوونی چەنـد زمانـەوانێک سـەبارەت بـە هاوواتایی، چەند پێناسـەیەک بۆ هاوواتـایی. تەوەری دووەم پێکهاتووە لـە: پێناسـەی هاوواتـایی لای هەنـدێ لـە قوتابخانـە زمانەوانییـەکان، سـەرچاوەکانی دروسـتبوونی هاوواتـایی، جۆرەکـانی هاوواتـایی، نزیکـی واتـایی، چەنـد بابـەتێکی تـری تایبـەت بـە هاوواتـایی. تـەوەری سـێیەم پێکهـاتووە لـە: شـێوەکانی هاوواتـایی، هاوواتـایی بـەپێی بەشـەکانی ئاخاوتن.

بەشی دووەمی توێژینەوەکە، بەشـی کارەکی توێژینەوەکەیـە و لـە چوار تەوەر پێکدێت. تەوەری یەکەم: تـەرخانکراوە بۆ هاوواتـایی نێوان دوو ناو لە دیوانی کامەران موکریدا. تـەوەری دووەم: هاوواتـایی نێوان دوو ئاوەڵکـار. تـەوەری سـێیەم: هاوواتـایی نێـوان دوو کـار. تـەوەری چوارەم: هاوواتایی نێوان دوو ئاوەڵناو.

## بەشی یەکەم
## ئاوڕدانەوەیەک لە هاوواتایی

### ١-١- هاوواتایی لە ڕووی زاراوە و زمانەوانییەوە:

وشـەی (Synonym)، یـان (Synonymy) وشـەیەکی یۆنانییـە و لـە یۆنـانیی کۆنـەوە هـاتووە، (Syn) بـە واتـای "لەگـەڵ" و (onoma) بـە واتـای "نـاو" دێت. (Wikipedia Synonym) لـە زمـانی ئینگلیزی ئەمڕۆشـدا وشـەکە بووە بە (Synonymy)، کە بـە واتـای "هاوواتـایی" دێت لـە زمـانی کوردی، هاوواتاییش بەو وشانە دەگوترێت، کە لـە فۆڕمدا جیاوازن و لـە واتـادا وەک یەکن، یاخود نزیکی یەکن، واتاسازی زانستێکە گرنگی بـە وشـە و دەستەواژە هاوواتاکان دەدات و لێکۆڵینـەوە لـە بارەیانـەوە دەکات و لـە زماندا دەیانخاتە ڕوو.

هاوواتـایی وشـەیەکی داڕێـژراوە، پێکهـاتووە لـە مـۆرفیمی بەنـدی پێشـگری {هـاو}، کـە بـەواتای (هـەمان)، یـان (وەک یـەک) دێـت، لەگـەڵ مـۆرفیمی سـەربەخۆیی {واتـا} و مـۆرفیمی بەنـدی وشـەگۆڕی {یـی}، کـە مـۆرفیمێکی پاشـگری وشـەگۆڕە بـە کۆتـایی وشـەوە دەلکێت و فـۆڕم و واتای وشە دەگۆڕێ.

### ١-١-١- چەمکی هاوواتایی:

Synonymy زاراوەیەکە لە واتاسازیدا بـەکاردێت بـۆ ئامـاژەکردن بـە جۆرێکی سـەرەکی لە پەیوەندیی واتـایی نێوان وشـەکان. ئـەو وشـانەی، کە هەمان واتایان هەیە ئەوا هاوواتان. بۆ ئەوەی دوو وشە هاوواتا بـن، مانای ئەوە نییە کە ئەوان (هەردوو وشەکە) وەک یەک بن لە واتـادا، بـە واتا ئەوان قابیلی ئـاڵوگۆڕپێکردنن لـە هـەموو سـیاق (دەوروبەر)ێکدا بـە هەمان واتا. هەندێ جار ئاماژە بۆ ئەوە دەکرێ، کە ئـەو ئەگـەرە بـوونی نییە کە پێی دەگوترێت (هاوواتای تەواو)، بەڵکو ئـەوەی هـەیـە هاوواتـای ناتـەواو و جۆرەکـانی تـری هاوواتـان، دەکرێ بڵێین کـەوا هاوواتـا ئـەو کاتە ڕوودەدات، ئەگـەر هـات و یەکـەکان واتاکانیـان بەڕادەیـەک لەیـەکتر

نزیک بێت، بتوانرێت ڕێگە بە هەڵبژاردنی هەر یەکێکیان بدرێ لە هەندێ سیاقدا، بەبێ ئەوەی هیچ جیاوازییەک لە واتای ڕستەکە ڕووبدات.

لێکۆڵینەوە زمانییەکان لە بارەی هاوواتاوە جەختیان لە سەر گرنگیی سیاق (دەوروبەر) کردۆتەوە لە دەستنیشانکردنی وشە هاوواتاکاندا. (David Crystal, 2008: 470) پەیوەندیی نێوان وشە هاوواتاکان پەیوەندییەکی شوێنی ستوونییە و وشەکانیش یەک واتایان هەیە. (عەبدولواحید موشیر دزەیی، ٢٠١٠: ١١٠) ئەگەر چاوێک بە فەرهەنگدا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێ، کە چەندین وشەی وەک: (شۆخ و شەنگ) لەگەڵ (جوان)، (مانگ) لەگەڵ (هەیڤ)، (ئێش) لەگەڵ (ئازار)، هاوواتان و لە زۆر دەوروبەردا شوێنی یەکتر دەگرنەوە.

**١-١-٢- بیرو بۆچوونی چەند زمانەوانێک سەبارەت بە هاوواتایی:**

١- دوو وشە هاوواتا دەبن لە زمانێکدا ئەگەر بێت و بتوانرێت ئاڵوگۆڕیان پێبکرێت لە هەر ڕستەیەکی زمانەکە بەبێ گۆڕانی بەهای ڕاستیی ڕستەکە. (B. Mates, 1952: 119)

٢- هاوواتایی لە دوو لایەن پێکدێت. (أ) و (ب) دەبنە هاوواتای یەکتر، ئەگەر بێت و (أ)، (ب) بگرێتەوە و بە پێچەوانەوەش (ب)یش (أ) بگرێتەوە. (A. Lehrer, 1974: 23)

٣- وشەی هاوواتا Synonym بەو وشانە دەڵێن، کە یەک مانا دەبەخشن، یاخود ماناکانیان لێک نزیکە، بەڵام لە وتن و خوێندنەوە و نووسیندا جیاوازن. (ئەورەحمانی حاجی مارف، ٢٠١٤: ٣١٧) وەک (قاچ، پێ).

٤- هاوواتا: دوو، یان چەند وشەیەکە، ئاماژە بۆ یەک واتا دەکات. (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ١٤٥)

٥- هاوواتا: ئەو وشانەن، کە لە ڕوخسار و دەربڕیندا جیاوازن و لە واتادا وەکو یەکن. (کلۆد جێرمان و ریمۆ لۆبلان، ٢٠٠٦: ٤٦)

٦- هاوواتا: بریتییە لە دانانی دەربڕینێک لە شوێنی دەربڕینێکی تر لە واتایەکدا، هەموو دەربڕینەکانیش لە یەک واتادا کۆدەبنەوە. (ستیفن اولمان، ١٩٧٥: ١٠٥)

٧- وشە هاوواتاکان ئەو دەربڕینانەن، کە لە واتادا وەک یەکن و دەتوانرێن ئاڵوگۆڕ بکرێن و لە شوێنی یەکتردا بێن لە هەر سیاقێکدا. (رمضان عبدالتواب، ١٩٩٩: ٣٠٩) وەک: (تلمیذ، طالب) کە دوو وشەی هاوواتان لە زمانی عەرەبی و بە واتای قوتابی دێن لە زمانی کوردیدا.

٨- هاوواتایی: ئەو وشانەن، کە بۆ یەک واتا بەکاردێن، ئەمانەش لە زماندا زۆرن، وەک هەردوو وشەی (universe, world) بە واتای (جیهان) دێن، (purchase, buy) بە واتای (کڕین) دێن و (fraternal, brotherly) بە واتای (برایانە) دێن. (ف- بالمر، ١٩٨٥: ١٠٣- ١٠٤)

٩- ئەو دەربڕینانەی خاوەن یەک واتان بە هاوواتا دادەنرێن. (جون لاینز، ١٩٨٧: ٥٣) ئەگەر بتوانرێت شوێنی یەکتر بگرنەوە لە سیاقدا. (جون لاینز، ١٩٨٥: ٧٣)

١٠- هاوواتا: بریتییە لە دوو دەربڕین، یان زیاتر کە لە واتادا وەک یەکن، وەک: (کچ، کیژ)، کە لە گوتندا دەتوانرێت لە شوێنی یەکتردا بێن و ئاڵوگۆڕ بکرێن. وەک:

کچێکم بینی.

کیژێکم بینی. (حازم علي كمال الدين، ٢٠٠٧: ١٦٢)

١١- هاوواتا: بریتییە لە دوو وشە یان زیاتر، کە یەک واتایان هەیە. (نورالهدی لوشن، ١٩٩٥: ١٠٦)

١٢- الشريف الجرجاني زمانەوان لە بارەی هاوواتا دەڵێ ((ئەو وشانەن، کە لە چەمکدا یەکن، و دەربڕینەکان ئاماژە بە یەک شت دەکەن)). (الجرجاني، ١٩٨٣: ٣٤)

١٣- أبو البقاء الكفوي دەڵێت: هاوواتایی بریتییە لە وەک یەکی لە چەمکدا، نەک لە خودی وشەدا، وەک: (ئینسان) و (بەشەر). (الكفوي، ١٩٨٨: ٣١٥)

١٤- زمانەوانی ناوداری عەرەب "فخرالدين الراضي" بە پشت بەستن بە نموونەی قورئانی پیرۆز چەندین نموونەی هاوواتا دەهێنێتەوە، وەک: وشەکانی (شرعة ومنهجا) المائدة "٤٨" بەواتای

"ڕێباز"، یاخود "ڕێچکە" دێن لە کوردیدا، هەروەها (لاتبقي ولا تذر) المدثر "٢٨"، بە واتای "لەناوبردن " دێن. (الشریف بوشارب، ٢٠١٥: ٣٤)

### ١-١-٣- چەند پێناسەیەک بۆ هاوواتایی:

"ئەحمەد موتەوەکیل"ی لێکۆڵەر دەڵێت: ((دەربڕینە هاوواتاکان ئەو وشە جیاوازانەن، کە ئاماژە بۆ یەک شت دەکەن بە هەمان ڕێگە، وەک (اللیث) و (الأسد) هەردووکیان ئاماژە بۆ ئەو ئاژەڵە ترسناکە دەکەن))، کە ئێمە لە کوردیدا پێی دەڵێین (شێر). (سهیلة دریوش، ٢٠١١: ٩٦،٩٧)

لێکۆڵەر جۆرج پۆل (George Paul) بەم شێوەیە پێناسەی هاوواتای کردووە و دەڵێ: ((هاوواتا بریتییە لە دوو شێواز، یان زیاتر کە لە هەمان واتادا هاوبەشن، زۆربەی جاریش لە شوێنی یەکتردا دێن لە ڕستەدا، نەک هەموو جار))[1] (جورج بول، ١٩٩٩: ١٣٠،٩٧) کلۆد جێرمان و ریمۆن لۆبلان (Claude German & Raymond Leblance) دەڵێن: ((هاوواتا ئاماژە بە کۆمەڵە وشەیەکی پێکهاتە جیاواز دەکات، کە بە نزیکی هەمان واتایان هەیە، ئەمەش بە گوێرەی فەرهەنگە هاوواتاییەکان)). (Claude German et Raymond Leblance, 1982: 46)

وادیارە هەردوو لێکۆڵەرەکە گەیشتوونەتە ئەم پێناسەیە لە چوارچێوەی بەدواداچوونیان بۆ هەموو پێناسەکانی هاوواتا لە فەرهەنگەکاندا و ئەوەی جێگای تێبینییە ئەم دوو لێکۆڵەرە نزیکایەتی واتایی نێوان دوو وشە بە هاوواتای یەکتری دادەنێن، مەرج نییە دوو وشەکە واتاکەیان تەواو وەک یەک بێت، ئەمەش بواری ئەوە دەدات دەرگا بە ڕووی زۆرێک لە وشەکان بکاتەوە بۆ ئەوەی بچنە خانەی هاوواتاوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم پێناسەیە ئاماژە بۆ هەبوونی جیاوازی زمانیی نێوان وشەکان دەکات.

((بەگەڕانەوە بۆ فەرهەنگە واتاییەکان لە چەمکی هاوواتایی نزیک دەبینەوە بەوەی کەوا لە زۆربەی کاتەکاندا دوو وشە، یان دوو زاراوە، بە هاوواتای تەواو لەقەڵەم نادرێن، تەنها بەشێکی هاوواتان و هەندێ

جاریش جیاوازی بەرچاو لە واتاکانیاندا بەدی دەکرێت، کە پێویستە ئاماژەیان بۆ بکرێت، وەکو ئەوەی یەکێک لە وشەکان لەوەی تریان بەهێزتربێت، یان زیاتر ئاماژەیە بۆ واتای مەبەست)). (Emile Genourrier, 1977: 8) ئەم پێناسەیە ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە هاوواتایی تەواو دروست نابێت، چونکە بەردەوام تووشی جیاوازییەکان دەبین کەوا کاریگەری لەسەر ئەو واتایە دەبێت کە مەبەستمانە بیگەیەنین، هەرچەند ئەگەر سادەش بێت.

توێژەر جۆن دوبوا (Jean Dubois) وای دەبینێ ((هاوواتا ئەو دوو وشەیەیە کە واتایەکی وەک یەک، یان نزیک لەیەکیان هەیە، دوو وشەکەش لە پێکهاتەدا جیاوازن، ئەمەش پێناسەی هاوواتایە بەواتا فراوانەکەی)). (Jean Dubois, 1973: 460) لێرەدا توێژەر پێناسەیەکی وردی بۆ هاوواتا نەکردووە، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی باسی کردووە هەروەکو دەڵێت بە واتا فراوانەکەی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە پێناسەی وردتر بۆ هاوواتا هەیە. ئەم پێناسەیەش جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ ئەوەی پێش خۆی نییە، چونکە ئەمەش ئاماژە بۆ چوونیەکی واتای نێوان دوو وشەکە دەکات، یان بەلایەنی کەم نزیکی واتایی نێوان دوو وشەکە دەکات.

زمانەوان "سیوطي" لەبارەی هاوواتاوە دەڵێت: ((ئەو دەربڕینە جیاوازانەن، کە ئاماژە بە یەک شت دەکەن، وەک: (الحنطة- **البُـرّ**- القمح)، هەر سێ وشەکەش بە واتای (گەنم) دێن لە زمانی عەرەبیدا. (عبدالرحمن جلال الدين السيوطي، ٢٠٠٨: ٤٠٢)

هەرچی فەرهەنگی زمانەوانی لێکۆڵەر جۆرج مۆنان (George Mounin)ە دەمانبات بۆ خاڵێکی تر، کە دەڵێ: ((بڕیاری هاوواتابوونی دوو وشە، یان دوو دەستەواژە دەدەین، ئەگەر هات و توانرا دوو وشەکە ئاڵوگۆڕیان پێبکرێت لە شوێنی یەکتر، بەبێ ئەوەی ناوەڕۆکی پەیامەکە بگۆڕێت)). (George Mounin, 2000: 317) لەم پێناسەیەدا تێبینی ئەوە دەکەین، گرنگترین شت بۆ دیاردەی هاوواتابوون ئەوەیە، کە پارێزگاری

لە ناوەرۆکی پەیامەکە بکرێت، بەبێ ئەوەی گۆڕانکاری لە ئاستی واتای هەست و سۆز (عاطفي)، یان واتای تر ڕووبدات، کە ئاخاوتن لەخۆی دەگرێت، جا چ وشە، یاخود ڕستە بێت. لێرەدا جیاوازی نێوان بۆچوونی "سیوطي" و "جۆرج مۆنان"مان بۆ دەردەکەوێت، بەوەی کە ئەمەی دواتر دەرگا لەسەر هەردوو لایەنی (وشە) و (پێکهاتە) والآ دەکات لەبارەی هاوواتاوە.

لە ئینسکلۆپیدیای ئۆنکارتای فەرەنسی پێناسەی هاوواتا کراوە بەوەی کە ((چوونیەکی زمانی ڕاستەقینەیە لە نێوان وشەکان، یاخود نزیکییەکی زۆرە لە واتادا و لە تۆماری زمانیشدا جیاوازن، وەک: pomme de terre و patate، کە هەردوو دەربڕینەکە بە واتای (پەتاتە) دێت. لە شوێنێکی تریشدا واهاتووە، کە دەڵێ: ((هاوواتا پەیوەندییەکی واتاییە لە نێوان دوو وشەی یەکسان لە واتادا، بۆ نموونە وشەی pensée "بیر" بە هاوواتای وشەی réfléchir "بیرکردنەوە" دانانرێت لە زمانی فەرەنسیدا، چونکە کار تەنها دەبێتە هاوواتای کار، یان ڕۆنانێکی کاری، بەهەرحاڵ ئەم پەیوەندییانە دەرناکەون، تەنها لە چوارچێوەی سیاقدا نەبێت. (Microsoft Encarta, 2009) ئەمەش دووبارە گرنگیی سیاقمان بۆ دەردەخات لە دەستنیشانکردنی واتا و بەربەستێک لە بەرامبەر هاوواتای تەواو دادەنێت، ئەم دیاردەیەش تەنها لە تاکە زمانێک کورت نابێتەوە، بەڵکو بەسەر هەموو زمانەکانی جیهاندا جێبەجێ دەبێت.

لێکۆڵەر "حلمي خلیل" نموونەیەکی نزیکبوونەوەی شێوەکان لەیەکتر لە بارەی هاوواتا دێنێتەوە و دەڵێت: (فلان مرد)، یان (فلان وەفاتی کرد)، هەردوو ڕستەکە یەک واتایان هەیە لە ڕوانگەی دەربڕینی (مردنەوە)،  چونکە کاری (مرد) و کاری (وەفاتی کرد) هەمان واتایان هەیە لەسەر ڕوودانەکەدا، بەڵام جیاوازیی نێوانیان بۆ کاری (مرد) دەگەڕێتەوە، کە ئاماژە بۆ ڕوودان دەکات بەبێ ئاماژەدان بە سێبەری ئایینی، یان هەر شێوەیەک لە شێوەکانی ڕێزلێنان بەرامبەر ڕوودانەکە، بەڵام کاری (وەفاتی کرد) جگە لە ئاماژەدان بە واتای ڕوودانەکە، واتای

ئایینی و ڕۆحیش لەخۆدەگرێت و هەستی پێدەکەین لە چوارچێوەی بەکارهێنانی کاری (وەفاتی کرد)دا، کە ئەمە زانایانی فەرهەنگ و زمان زاراوەی (connotations)ی بۆ بەکاردێنن. (حلمي خليل، ١٩٩٧: ٧٧)

لە کۆتاییدا دەگەینە ئەو بۆچوونەی کە جیاوازیی ڕوون هەیە لە دەستنیشانکردنی چەمکی هاوواتادا، لەگەڵ ئەوەی هەندێک لە لێکۆڵەران هاوواتای تەواو بەدوور دەزانن، وەک ئەوەی دوو وشەکە تەواو لە واتادا وەکویەک بن، بەڵام ئەوانەی کەوا هاوواتا بەو دەربڕینانە لەقەڵەم دەدەن، کە لە واتادا لەیەکتر نزیکن، ئەمە ڕاستییەکە و هیچ شک و گومانی تێدا نییە، چونکە واقیع پاڵپشتی دەکات و بەڵگەش هەبوونی فەرهەنگەکانی تایبەت بە هاوواتاکانن.

**١-٢- پێناسەی هاوواتایی بەگوێرەی هەندێ لە قوتابخانە زمانەوانییەکان:**

چەمک و پێناسەی هاوواتایی لەنێو هەندێ لە قوتابخانە زمانەوانییەکان جیاوازە، بەگوێرەی ئەو ڕێبازەی، کە قوتابخانەکە گرتوویەتیە بەر، بۆیە لێرەدا هەندێک پێناسە بۆ هاوواتا دەکەین بەگوێرەی چەمکی هەندێ لە قوتابخانە زمانەوانییەکان:

أ- هاوواتایی لای ڕۆنانکارییەکان: وشە هاوواتاکان بۆ یەکێک لە بەشەکانی ئاخاوتن دەگەڕێنەوە. وەک: (ناو، کار، ئاوەڵناو،...) و دەتوانرێت لە شوێنی یەکتر دابنرێن و ئاڵوگۆڕیان پێبکرێت بەبێ ئەوەی واتا و ڕۆنانی ڕێزمانی ڕستە بگۆڕێت. (A. Lehrer, 1970: 11)

ب- هاوواتایی لای هۆشەکییەکان: ئەو کاتە دروست دەبێت ئەگەر هات و هەردوو دەربڕینەکە ئاماژە بن بۆ هەمان بیری هۆشەکی، یان هەمان وێنە (شت).

پ- هاوواتایی لای ئاماژەییەکان: ئەو کاتە دروست دەبێت ئەگەر هات و دوو دەربڕینەکە بۆ هەمان شت و بە هەمان چۆنیەتی بەکاربێن. (N. Goodman, 1952: 67, 69)

ت- هاوواتـــایی لای ڕەفتارییـــەکان (ڕەوشـــتییەکان): ئـــەو کاتـــە دروست دەبێت ئەگەر بێت و دوو دەربڕینەکە یەکتر بنوێنن لە ڕێگەی بەکارهێنانی هەریەکێکیان بەهـەمان کاریگـەری و بەهـەمان وەڵامدانـەوە. (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ٢٢٤)

ج- هاوواتایی لای شیکارییەکان: ئەو کاتە دروست دەبێت ئەگەر هـات و لقە درەختی شیکاری هـەر یـەکێک لـە دوو وشـەکە هـەمان لقە ڕۆنانی ئەوی تری هـەبێت، یـاخود کاتێک دوو وشـەکە بەشداربوون لـە هەموو سیفاتە سـەرەکییەکان. (R. Harris, 1973: 4)

**١-٢-١- سەرچاوەکانی دروستبوونی هاوواتایی:**

دیـاردەی هاوواتـایی لـە زمانـدا زانـا هاوچەرخـەکانی بـەخۆوە سـەرقاڵ کـردووە، هـەروەکو لـە کۆنیشـدا زانـا دێرینـەکانی سـەرقاڵ کردبوو. هاوواتا دیاردەیەکە لە هەموو زمانەکانی جیهاندا بوونی هەیە و بـە چەنـد ڕێگەیـەک لـە زمانـدا دروسـت دەبێـت، لـە زمـانی کوردیشـدا هاوواتایی لەم خاڵانەی خوارەوە سەرچاوەی گرتووە:

١- بـەهۆی جیـاوازیی زار، یـان شـێوەزارەکانی زمـان. زۆرجـار وشـەکانی هەنـدێ لـە زارەکـان، یـان لـە شـێوەزارەکانی زمـان لەیـەکتر جیاواز دەبن و بەمەش لە بەرانبەر یەکتردا هاوواتایی دروست دەکەن. (رمضـان عبدالتواب، ١٩٩٩: ٣١٦) وەک وشـەکانی: (پـەلک- گـەڵا)، (گنـدۆرە- کاڵەک)، (شیر- شمشێر)، (چۆک- ئەژنۆ)، لە نێوان هـەردوو شـێوەزاری هەولێری و سلێمانی زمانی کوردیدا.

٢- لە ئەنجامی بەکارهێنانی دوو شێوازی جیاواز، یان بەکارهێنانی زاراوەی جیاواز، وەک: (جەناب- تۆ/ خوێ- کلۆریدی سۆدیۆم). (محمد معروف فتاح، ١٩٩٠: ١٧٦)

٣- بەهۆی خواستنی وشەی بێگانە بۆ ناو زمانی ڕەسەن، کە وشە بیانییـە خوازراوەکـە لـە پـاڵ وشـە ڕەسـەنەکە بـەکاردەهێنرێت، وەک: (ئینسـان- مـرۆڤ/ فـەقیر- هـەژار). (ئـەورەحمانی حـاجی مـارف، ١٩٧٥: ٢٦) هـــەروەها وشـــەی (ئـــەرز)، کـــە زۆر جـــار لـــەجیاتی وشـــەی (زەوی)

بەکاردێت لە شێوەزاری سلێمانیدا، لە بنچینەدا لە وشەی (أرض)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە و بووەتە هاوواتا بۆ وشەی زەوی لە زمانی کوردیدا. (ساکار ئەنوەر حەمید، ٢٠٠٩: ٥١) کە وشە وەرگیراوەکە گۆڕانی دەنگی بەسەردا هاتووە و دەنگی / ض/ گۆڕاوە بۆ دەنگی / ز/، هەروەها لە شێوەزاری هەولێری وشەکە دەبێ بە (عەرد).

٤- هەندێ وشە هاوواتان لە واتای هۆشەکیدا، بەڵام واتای لاوەکییان جیاوازە، وەک: کچ- کیژ، ژن- ئافرەت. (محمد معروف فتاح، ٢٠١١: ١٦٨) بۆ نموونە وشەی (کچ) بەهایەکی زیاتری هەیە لە (کیژ) و (ئافرەت)یش بەهاکەی فراوانتر و گشتگیرترە لە وشەی (ژن) لە زمانی کوردیدا.

٥- زۆرجار هۆکاری دەروونی دەبێتە هۆی دروستبوونی هاوواتایی، بۆ نموونە بۆ وشەی (مرد) چەند دەستەواژەیەکی تریش هەیە، بەهۆکاری دەروونی لەجیاتی ئەم وشەیە بەکاردێت، لەوانە: (چرای ژیانی کوژایەوە- ئەمری خوای کرد- کۆچی دوایی کرد،...). (عبدالحمید حسن، ١٩٧١: ٧٢)

٦- هەندێ جار گەشەکردنی زمان دەبێتە هۆکارێک بۆ دروستبوونی وشەی نوێ لە پاڵ وشەی تر لە زماندا، وەک دروستبوونی وشەی (بەڕاشکاوی)، کە بوو بە وشەیەکی هاوواتا بۆ وشەی (بەڕاستی).

**١-٢-٢- جۆرەکانی هاوواتایی:**

زۆرێک لە زمانەوانە هاوچەرخەکان جیاکاری لە نێوان جۆرە جیاوازەکانی هاوواتا و شێوەکانی دەکەن بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١-٢-٢-١- هاوواتای تەواو:**

لە زمانی ئینگلیزیدا ئەم زاراوانەی بۆ بەکاردێت، وەک: (perfect synonymy ، complete synonymy ، genuine synonymy ، full synonymy)، ئەمەش کاتێک دەبێت، کە دوو دەربڕینەکە تەواو وەکو یەک بن لە واتادا

و تاکەکانی خاوەن زمانەکە هەست بە هیچ جیاوازییەک نەکەن لە نێوان وشەکان، زۆر بە ئاسانیش بتوانن وشەکان لە شوێنی یەکتر دابنێن لە هەموو سیاقەکاندا. (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ٢٢٠) بۆیە پێوانە بۆ هاوواتای تەواو ئەوەیە، کە وشەکان واتایان تەواو وەک یەک (هاوتا) بێت، نەک تەنها واتاکانیان لێک نزیک بێت. (جون لاینز، ١٩٨٧: ٥٣) هاوواتای تەواو لە زماندا زۆر بە دەگمەن ڕوو دەدات، چونکە هاوواتای تەواو جۆرێکە لە (کمالیات- بێ کەموکوڕی)، ئەمەش بەئاسانی لە زماندا بەرجەستە نابێت. (رمضان عبدالتواب، ١٩٩٩: ٣٠٩) وەکو وشەکانی (عام- سنة)، کە بە واتای (ساڵ) دێن لە زمانی کوردی، هەردوو وشەکەش بە یەک ئاست هاتوونە لە قورئانی پیرۆزدا. (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ٢٢٠-٢٢١)

هاوواتای تەواو ئەو کاتە دروست دەبێت، کە ئەو دوو مەرجەی تێدا بێتە دی:

١- وشەکان، یان (دوو وشەکە) لە واتای سەرەکی و واتای لاوەکیدا وەک یەک بن.

٢- وشەکان، یان (دوو وشەکە) بتوانرێت لە هەموو سیاقێکدا ئاڵوگۆڕیان پێبکرێت و لە شوێنی یەکتر دابنرێن.

زۆربەی لێکۆڵەرانی زمانیش لەسەر ئەو ڕایەن، کەوا هاوواتا بەو چەمکە زۆر مەحاڵ دەبێت، یاخود زۆر دەگمەن دەبێت. (عبدالکریم محمد حسن جبل، ١٩٩٧: ٣٦)

### ١-٢-٢-٢- هاوواتای ناتەواو (نیمچە هاوواتا):

لە زمانی ئینگلیزیدا ئەم زاراوانەی بۆ بەکاردێت، وەک: near less- than- full ، approximate synonymy ، quasi synonymy ، synonymy) (synonymy)، یان لێکچوو (likeness)، یان نزیکی (contiquity)، یان چوونە ناو یەک (overlapping) بۆ بەکاردێت، ئەمەش ئەو کاتە دەبێت، کە دوو دەربڕینەکە زۆر لەیەکتر نزیک دەبنەوە بەڕادەیەک ئەگەر کەسێکی تایبەتمەند بە بواری واتاسازی نەبێت ئەستەمە بتوانێت واتاکانیان لێک جیابکاتەوە. (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ٢٢٠) بۆیە هاوواتای ناتەواو ئەو کاتە

دروست دەبێت، کاتێک کەوا دەربڕینە هاوواتاکان لە واتای سەرەکی و واتای لاوەکیدا لەیەکتر بچن، هەروەها لەم جۆرەیاندا ناتوانرێت وشەکان ئاڵوگۆڕ بکرێن لە هەموو سیاقێکدا، بەڵام لە هەلومەرجی گونجاودا دەکرێت وشەکان لە شوێنی یەکتر بێن لە ڕستەدا. (عبدالكريم محمد حسن جبل، ١٩٩٧: ٣٦) نموونەی ئەم جۆرە هاوواتایە زۆرە لە زمانی کوردیدا، وەک:

زەوی - خاک

نەوە - وەچە

بەڵێن - پەیمان (تالیب حوسێن عەلی، ٢٠١٤: ٥٢) هەروەها هەردوو وشەی (answer) و (replay) زمانی ئینگلیزی، کە بە واتای (وەڵامدانەوە) دێن لە زمانی کوردیدا نموونەی ئەم جۆرەی هاوواتان، وەک لەم دوو ڕستەیەی خوارەوە دەردەکەوێت:

What was his answer?

What was his replay?

هەروەها هەر یەک لە جووت وشەکانی nearly و almost، کە بە واتای (بە نزیکی) و large و big بە واتای (گەورە) و wide و broad بە واتای (فراوان)، هاوواتای یەکترن لە زمانی ئینگلیزی. پێویستە ئەوە لە یاد نەکەین، کە بیرۆکەی "وەک یەک" لە واتای بەکارهێنراو لە گفتوگۆی هاوواتادا مەرج نییە تەواو وەک یەک بن. (George Yule, pdf: 113-114)

### ١-٢-٢-٣- نزیکی واتایی، یاخود پەیوەندیی واتایی (semantic relation):

ئەم جۆرە لە هاوواتا کاتێک ڕوودەدات، کە واتاکان لێک نزیک دەبنەوە، بەڵام هەر دەربڕینێک بەلایەنی کەم لە ڕوانگەیەکەوە لەوی تریان جیاواز دەبێت، نموونەی ئەم جۆرەش هەر یەک لە وشەکانی کێڵگە واتاییەکانن، بەتایبەتیش کاتێک کەوا بواری کێڵگەکە تەسک

دەکەینــەوە بــۆ ژمارەیــەکی دیــاریکراوی وشــە. نموونــەی ئــەم جــۆرە لــە زمانی ئینگلیزیدا وەکو وشەکانی: walk ڕۆیشتنی ئاسـایی- run ڕاکردن- skip بازدان- crawl ڕۆیشتن بە خشین (گاگۆلکێ)... کـە نزیکـی واتاییـان هەیە و هەموویان بەشداری دەکەن لە واتای (جوولـە) لـە بوونـەوەرێکی زینـدوو کـە قاچـەکانی بـەکاردێنێ، بـەڵام ژمـارەی قاچـەکان، و چۆنیـەتی جووڵانـــەوە، و پەیوەنـــدیی قاچـــەکان بـــە بەرکـــەوتنی بـــە زەوی، لـــە دەربڕینێک بۆ دەربڕینێکی تر جیاواز دەبێت. (E.A. Nida, 1975: 17) بۆیـە ئەم جۆرە هاوواتایە واتاکانیان نزیکە لەیەک، نەک وەک یـەک بن، وەک:

بەند – گیراو

وریا – زیرەک

سوور – ئاڵ (محمد معروف فتاح، ٢٠١١: ١٦٨)

**١-٢-٢-٤- بەکارهێنانی گوزارشتی هاوشێوە** (Paraphrase):

ئەم جۆرە لـە هاوواتـا کاتێک ڕوودەدات، کە دوو ڕسـتەکە هـەمان واتایان هەبێت لە زماندا. زمانـەوان Nilsen ئـەم جـۆرەی بـۆ ئـەم بەشـانە دابەش کردووە:

أ-شوێن گۆڕین: ئەمەش بـە گـۆڕینی شـوێنی وشـەکان لـە ڕسـتەدا ڕوودەدات، بەتایبـەتی لـەو زمانانـەی، کـە ئـازادی ڕێپێـدانی گـۆڕینی وشەیان هەیە، ئەمەش بە مەبەستی دەرخستنی وشەیەکی دیاریکراوە لە ڕستەدا بێ ئەوەی واتا گشتییەکەی ڕستە بگۆڕێت. وەک:

موحەممەد بە هێواشی چووە ژوورەکە.

بە هێواشی موحەممەد چووە ژوورەکە.

چووە ژوورەکە موحەممەد بە هێواشی.

ب- گۆڕین، یان پێچەوانە: وەک:

کۆمپیوتەرێکم بە ٢٠٠ هەزار دینار لە موحەممەد کڕی.

موحەممەد کۆمپیوتەرێکی بە ٢٠٠ هەزار دینار پێ فرۆشتم.

ئـەم دوو ڕسـتەیە ئەگـەرچی لـە ڕووکەشـدا جیـاوازن، بـەڵام لـە ڕاستیدا هەردووکیان ئاماژە بۆ هەمان ڕووداو دەکەن، بۆیـە دەگوترێت

دوو ڕستەکە هاوواتان، لەگەڵ ئەوەشدا هەر یەکێک لە دوو ڕستەکە "پارافرەیز"ە بۆ ئەوی تریان.

ت- بەیەکداچوونی فەرهەنگی: ئەمەش وەکو ئەوەی ڕستەیەکی چەند وشەیی بە گوزارشتێک دەرببڕدرێت. وەک:

بە چیمەنتۆ داپۆشی.

چیمەنتۆی کرد.

**١-٢-٢-٥- وەرگێڕان** (translation):

ئەو کاتە دروست دەبێت، کە دوو گوزارشت، یان دوو ڕستە، لە دوو زمانی جیاواز، یان لە زمانێک، کە ئاستی گوتاریان جیاواز بێت، لە واتادا یەکبگرنەوە (وەک یەک بن)، ئەمەش وەکو ئەوەی دەقێکی زانستی وەرگێڕی بۆ زمانێکی باو، یان دەقێکی شیعری وەرگێڕی بۆ دەقێکی پەخشان. (أحمد مختار عمر، ٢٠٠٩: ٢٢٢-٢٢٣) بۆ نموونە ڕستەیەکی وەک (کارزان دمە خفیف) لە زمانی عەرەبیدا دەبێت بە (کارزان خوێنی شیرینە) لە زمانی کوردیدا، دوو ڕستەکەش دەبن بە هاوواتای یەکتر، بەڵام لە دوو زمانی جیاوازدا.

**١-٢-٢-٦- لێکدانەوە** (interpretation):

(أ) دەبێتە لێکدانەوە بۆ (ب)، ئەگەر بێت و (أ) وەرگێڕان بێ بۆ (ب)، هەروەها دەربڕینەکانی پێکهاتەی (أ) نزیکتربێ بۆ تێگەیشتن لە دەربڕینەکانی ناو پێکهاتەی (ب)، بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە هەموو لێکدانەوەیەک وەرگێڕانە، نەک بە پێچەوانەوە. پلەی تێگەیشتن بۆ زمان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاواز دەبێت، بۆیە لێکدانەوەی کەسێک لەوانەیە وەکو لێکدانەوەی کەسێکی تر نەبێت. (B. Mates, 1952: 113)

**١-٣- شێوەکانی هاوواتایی:**

هاوواتایی بەپێی داڕشتن چەند شێوەیەکی هەیە ئەوانیش ئەمانەن:-

١-وشەی سادە: کە هیچ پێشگر و پاشگرێکی لەگەڵدا نییە، وەک:

بەرز: بڵند

٢- وشــەی داڕێـژراو: کـە پێکهـاتووە لـە وشـەیەکی سـادە لەگـەڵ پێشگر، یان پاشگرێک، وەک:

لە بەین: لە نێوان

٣- وشــەی لێکـدراو: لـەدوو وشـەی واتـاداری لێکـدراو پێکهـاتووە، وەک:

گیروگرفت: تـەنگ و چەڵەمـە (عەبدولواحید مشیر دزەیی، ٢٠٠٩: ١٠٧-١٠٨)

**١-٣-١- هاوواتایی بەپێی بەشەکانی ئاخاوتن:**

هاوواتــایی لــە پۆلــە فۆڕمــەکانی زمــانی کــوردی ئــەم بەشــانە دەگرێتەوە:

١- ئەوانەی ناون، وەک: فرمێسک: ڕۆندک:

٢- ئەوانەی ئاوەڵناون، وەک: مەزن: گەورە

٣- ئەوانەی کارن، وەک: نوست: خەوت

٤- ئەوانەی ئاوەڵکارن، وەک: لە بن: لە ژێر

٥- ئەوانەی جێناون، وەک: تۆ: ئەتو، تە

٦- ئەوانەی ئامرازن، وەک: بۆ: لۆ

## بەشی دووەم

## هاوواتایی بەپێی بەشەکانی ئاخاوتن لە دیوانی (کامەران موکری)دا

### ٢-١- هاوواتـــای نێـــوان دوو نـــاو لـــە دیـــوانی (کامـــەران موکری[٢])دا:

**١- (ستەمکاری – زۆرداری):**

**جێمی وڵسن**

جێمی وڵسن: بمرێ هێزی ستەمکاری
وەرگەڕێ تەختی زۆرداری (دیوانی کامەران موکری، ل ١٧)

وشەی (ستەمکاری)، کە لە نیوە دێڕی یەکەم هاتووە هاوواتای ناتەواوە لەگەڵ (زۆرداری)، کە لە نیوە دێڕی دووەمدا هاتووە، هەردوو وشەکەش بەشە ئاخاوتنی ناو پێکدێنن لە زمانی کوردی، کە دوو ناوی واتایان، لە ئاوەڵناو و پاشگری (ی) پێکهاتوون.

**٢- (لەرە – بزووتن):**

**زەبر**

لە سنگا دوو سێوی گوڵ بە دەم کاڵ و تورت
گۆی دڵیان بە تیری خورپەی تیژدا ئەگرت
وەک قوببەی هەیاسە بێ لەرە و بزووتن
ڕووی دەمیان ئەکردە چەناگە و بەرگەردن (ل ٨٠)

وشەکانی (لەرە) و (بزووتن) دوو زاراوەی جیاوازی هەڵگری یەک واتان لە زمانی کوردی، کە هەردووکیان جوولە دەگرنەوە، بۆیە دەبنە هاوواتای ناتەواوی یەکتر لە بەشە ئاخاوتنی ناودا. (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠١٧: ٣٩، ٥٣٦)

**٣- (شین – گریان)**

**کامیل**

ئەی باڵندەی شیعری غەمگین
با پێکەوە بیکەین بە شین
گریانێک بگرین گەرم و گوڕ
ئەسرین بڕێژین لێڵ و خوڕ (ل ١٧١)

وشــەی (شـین) لـە زمـانی کوردیدا هاوواتـای ناتـەواوە بۆ وشـەی (گریـان)، زیـاتر لــە شــێوەزاری هــەولێری بــەکاردێت، لــە شــێوەزاری سلێمانیدا لـە پـاڵ ئـەم وشـەیە زاراوەی (شـیوەن)یش بـەکاردێت، کـە بـە واتای گریانی بە کوڵ دێت. لە پلەدا شین گریانەکەی لە گریـانی ئاسـایی زیاترە، چونکە لە شیندا گریان بە دەنگی بـەرزە و زۆرجـاریش هـاوار و ناڵــە و لەخۆدانیشــی لەگەڵــە، بــۆ کەســی مــردوو بــەکاردێت. (شــێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠١٧: ٣٨١)

**٤- (ئەسرین - فرمێسک):**

**کامیل**

گریانێک بگرین گەرم و گوڕ
<u>ئەسرین</u> بڕێژین لێڵ و خوڕ
وەرە ناو هێلانەی دڵم
گوێ بگرە لە گریەی کوڵم
بزانە چۆن <u>فرمێسکی</u> لێڵ
ئەڕژێتە سەر ڕووم گەرم و وێڵ (ل ١٧١)

(ئەسرین و فرمێسک) دوو وشەی هاوواتـان، هاوواتـای ناتـەواون لــە بەشــە ئاخــاوتنی نــاودا لــە زمــانی کــوردی، بــەڵام لــە پــاڵ وشــەی (فرمێسک)، وشەی (ئەسرین)یش بەکاردێت، بەڵام زیـاتر لـە شـیعر و لـە شێوەزاری سلێمانیدا بەرچاو و بەرگوێ دەکەوێت.

**٥- (زەردەخەنە - خەندە):**

**کوشتنی عەبە**

<u>زەردەخەنە</u> لە ئەسرینا
وەک گۆیەکی زێڕ توایەوە
<u>خەندە</u> لە قوڵپی گرینا
خنکاو یەکسەر بڕایەوە (ل ١٨٨)

وشـــەی (زەردەخەنــە) هاوواتــای وشـــەی (خەندە)یــە، هــەردوو وشـەکەش بـە واتـای بـزە (پێکـەنین) دێن، پێکـەنینێکی لێوی سـەر زاری بەبێ دەنگ و بەبێ قاقا.

**٦- (بڵێسە - گڕ):**

**کانی بەهرە**

هۆنراوەی جوان لە گوڵاڵە جوانترە

لە کەژاو و لە ڕووبار ڕەوانترە

لە لووتکەی کێو بەرز و گەردن کەش ترە

لە بڵێسەی گڕی ئاگر گەش ترە (ل ١٩٥)

وشـــەی بڵێســـە هاوواتـــای ناتـــەواوە بـــۆ وشـــەی گـــڕ، هـــەردوو وشەکەش (ئاگر) دەگرنەوە لە پۆلە فۆرمی ناوی زمانی کوردی.

**٧- (کار - فرمان):**

**ئەم ئادەمزادانە**

کاتێ زەردە توایەوە ناو ئەو دیو شاخ

تاریک داهات دارستان و چەم و باخ

گەڕایەوە بۆ بەردەمی دیواخان

تا بزانێ چی هەیە کار و فرمان (ل ٢٠٢) کار و فرمان دوو وشەی هاوواتان، هاوواتای ناتەواوی یەکترن.

**٨- (خاک - خۆڵ):**

**گوڵی وەریو**

چوونە ژێر خاک ئەبن بە خۆڵ

شەماڵ گەردیان ئەبا بۆ دۆڵ (ل ٢١٤)

وشەی (خاک) هاوواتای ناتەواوی وشەی (خۆڵ)ە، لە پۆلە فۆرمی ناو لە زمانی کوردی. (گیوی موکریانی، ٢٠١٧: ٥١٣)

**٩- (هاوڕێ - دۆست - هەڤاڵ):**

**گوڵی وەریو**

هاوڕێم حەسەن،
نەهاتیەوە تا هەواڵ
بێنیتەوە بۆ دۆست و هەڤاڵ (ل ٢١٤)

هەرسێ وشەی (هاوڕێ، دۆست، هەڤاڵ) هاوواتای ناتەواون، دەبنە هاوواتای یەکتر لە بەشە ئاخاوتنی ناو، بە واتای (برادەر) دێن.

**١٠- (جوانەمەرگ - مرد - هەرگیزاو هەرگیز نایبینینەوە):**

**گوڵی وەریو**

ئەی جوانەمەرگ، هاوڕێم حەسەن
مردی خەمگین دوور لە وەتەن
ئەی میوانی تازەی سەیوان
ئەی ڕیزە کێل، ئەی ئەرخەوان
چۆن بتوانم بە ((دڵ)) بڵێم
بە شەماڵ و بە ((گوڵ)) بڵێم
کۆچی کرد، هەرگیزاو هەرگیز
نایبینینەوە ڕووی ئازیز (ل ٢١٥)

وشەکانی (مرد، جوانەمەرگ، هەرگیزاو هەرگیز نایبینینەوە) کە لە هۆنراوەی شاعیردا هاتوون، لەگەڵ ئەوەی هەریەکەیان واتای (مردن) دەگەیەنن، بەڵام هەر یەکێکیان ڕەنگدانەوەی بارێکی دەروونییە لە زماندا، هەر یەکێکیشیان دەبێتە هاوواتای نزیکی واتایی بۆ ئەوی تر لە زمانی کوردیدا.

**١١- (سەهۆڵ - بەفر):**

**کچەکەی بەرتیلە**

توانەوەی سەهۆڵ، گەشانەوەی گوڵ
لەرەی شێنەیی گەڵا و پۆپی چڵ

بە تەنیا گەرمی و جۆش نادەن بە دڵ
کاتێ دڵی من ئەگەشێتەوە
کە بەفری خەمی کورد بتوێتەوە (ل ٢٢٤)

وشەی (سەهۆڵ) هاوواتای ناتەواوە بۆ وشەی (بەفر)، هەردوو وشەکەش لە سیمای ڕەنگدا وەک یەکن و لە ساردیدا هاوشێوەن. زۆر جار بەفر شوێنی سەهۆڵ دەگرێتەوە لە سیاقدا. بۆ نموونە لەجیاتی ئەوەی بگوترێ (کارزان کێلێک سەهۆڵ بکڕە) دەگوترێ (کارزان کێلێک بەفر بکڕە).

**١٢- (خاک - گڵ):**

**زەردەخەنە**

ببوورە! نەمزانی سامان
بۆتە هیوای تۆ .... کچی جوان
ناوت نایەنم .... تۆ وەک گوڵ
ئەوەرێیتە ناو خاک و گڵ (ل ٣٢٢)

هەردوو وشەی (خاک و گڵ) کە لە نیوەدێڕی دێڕی دووەمی شیعری شاعیردا هاتوون، دوو وشەی هاوواتان (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠١٧: ١٩٨) هاوواتای ناتەواوی یەکترن، لە پۆلە فۆڕمی ناو، لە زمانی کوردی.

**١٣- (زەردەخەنە - بزە):**

**پشکۆی هۆنراوە**

بۆ هۆنراوەی جوان و ڕازاوە و بە تام
چیای سەخت و پێ دەشت و گوڵزار گەڕام
لە گزنگ و زەردەپەڕ و هاژەی چەم
لە نیگای گەش، زەردەخەنە و بزەی دەم (ل ٣٤٠)

(زەردەخەنە و بزە) دوو وشەی هاوواتان، بە واتای (نەرمە پێکەنین. یا پێکەنینی بێ دەنگ) دێن لە زمانی کوردی.

**١٤- (خۆشی - شادمانی):**

**کۆتری ئاشتی**

لەو چەمانە
لەو کەژانە
بۆ خۆشی و شادمانی یە
بەیانی یە
کاتی خۆشی و گۆرانی یە (ل ٤١٦)

هەردوو وشەی (خۆشی و شادمانی) هاوواتای ناتەواون، بە واتای (کەیف خۆشی و دڵخۆشی) دێن.

**٢-٢- هاوواتایی نێوان دوو ئاوەڵکار لە دیوانی (کامەران موکری)دا:**

**١٥- (دەربەدەر - بێ جێ):**

**جێمی وڵسن**

حاکم: تەمەنت؟
- : پەنجا ساڵ ئەبێ
حاکم: ئیشت؟
- : دەربەدەر و بێ جێ (ل ١٣)

هەردوو وشەی (دەربەدەر و بێ جێ) هاوواتای نزیکی واتان لە پۆلە فۆرمی ئاوەڵکاری زمانی کوردیدا.

**١٦- (ئاوارە - دەربەدەر):**

**گوڵی وەریو**

هاوڕێم حەسەن،
نەهاتیەوە تا هەواڵ
بێنیتەوە بۆ دۆست و هەڤاڵ
هەواڵ: هی هاوڕێکانی من
کە ئاوارە و دەربەدەرن (ل ٢١٤)

وشەکانی (ئاوارە و دەربەدەر) دەبن بە هاوواتای یەکتر لە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵکاردا.

**٢-٣- هاوواتایی نێوان دوو کار لە دیوانی (کامەران موکری)دا:**

**١٧- (گڕم گرت - سووتام):**

**پەنجەرەی سەوز و سوور**

زڕەی زنجیر بوو بە نەغمەی خەمی دڵی من
بە نەعرەتەش بۆ هەڵمەت و بۆ تۆڵە سەندن
حەوتساڵی تیژ، پەڕەی دڵی ئارامی پێکام
بە حەوت ساڵی ئاگراوی گڕم گرت، سووتام (ل ٨٧، ٨٨)

هەردوو فرەیزی کاری (گڕم گرت) و (سووتام) هاوواتای یەکترن لە پۆلە فۆڕمی کار، لە زمانی کوردیدا.

**٢-٤- هاوواتایی نێوان دوو ئاوەڵناو لە دیوانی (کامەران موکری)دا:**

**١٨- (نەرم - شێنەیی):**

**لۆمۆمیا**

لە ئاگر و لە ئاسن و لە زەبری دوژمن
بەهێزترە، هێزی لەشە بۆ هەڵمەت بردن
پیاوێکی شەنگ، تەمەنی پڕ دنیا دیەیی
زمان شیرین، گفتوگۆ خۆش، نەرم و شێنەیی (ل ٧٦)

هەردوو وشەی (نەرم) و (شێنەیی)، کە لە نیوە دێڕی دووەمی دێڕی دووەمدا هاتوون، دوو وشەی هاوواتان، هاوواتای ناتەواون لە پۆلە فۆڕمی ئاوەڵناوی زمانی کوردی، چونکە شێنەیی بۆ مرۆڤی نەرم و هێدی و لەسەرخۆ بەکاردێت. (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠٠٥: ٤٧٩)

**١٩- (ڕێک - جوان):**

**باوەشێنی گیان**

بەڵام وەڵامی نەبوو مرد

نازانم بۆچی وات لێکرد

وا خۆم هاتوومە لات گیانە

تو ئەو بەژنە ڕێک و جوانە (ل ٦٧)

وشەکانی (ڕێک و جوان)، کە لە نیوە دێڕی دووەمی دێڕی دووەمدا هاتوون، هاوواتای ناتەواون لە پۆلە فۆڕمی ناودا لە زمانی کوردی. (شێخ محەمەدی خاڵ، ٢٠١٧: ١٥٣)

**٢٠- (نەشمیلە - جوان):**

**گوڵ ئەستێرە**

بەژنی وەک چووزەری ڕێواس

دەمی یاقووت، پەنجەی ئەڵماس

دەنگی بەسۆز، نەشمیلە و جوان

فریشتەیەکی کوردستان (ل ١٠٦)

هەردوو وشەی (نەشمیلە و جوان)، کە لە نیوە دێڕی یەکەمی دێڕی دووەمدا هاتوون، دوو وشەی هاوواتای ناتەواون لە پۆلە فۆڕمی ئاوەڵناوی زمانی کوردی. (گیوی موکریانی، ٢٠١٧: ٤٢٤)

**٢١- (جوان - شۆخ):**

**تیشکی چرایەک**

کچێکی هەبوو جوان، شیرین

خوێن گەرم و شۆخ و نازەنین (ل ١٣٢)

هەردوو وشەی (جوان و شۆخ)، کە لە دێڕی یەکەمدا هاتوون، دوو وشەی هاوواتان، هاوواتای ناتەواون، سەر بە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناون لە زمانی کوردی. (گیوی موکریانی، ١٩٩٩: ٢٨٩)

**٢٢- (جوان - شەنگ):**

**تیشکی چرایەک**

کچی جوانی تا بڵێی شەنگ

لە پڕ، هاتە گوێی، ترپە و دەنگ

کە، نواڕیە، بەر پەنجەرە

سەیری کرد، کوڕە نۆکەرە (ل ١٣٧)

هەردوو وشەی (جوان و شەنگ)، کە لە نیوە دێڕی دێڕی یەکەمدا هاتوون، دوو وشەی هاوواتای ناتەواون، لە پۆلە فۆڕمی ئاوەڵناوی زمانی کوردی. (گیوی موکریانی، ٢٠١٧: ٥١٣)

**٢٣- (ئازا - بێ ترس):**

**قورتوبە**

ئای ئەسپەکەم چەند ئازایە

چەند بێ ترسە، چەند خێرایە (ل ٢٨٥)

وشەی (ئازا)، کە ئاوەڵناوە لە زمانی کوردیدا، هاوواتای ناتەواوە لەگەڵ فرێزی بەندی (بێ ترس)، کە فرێزێکی ئاوەڵناو ئاسایە.

**٢٤- (خۆش - بە تام):**

**ئەستێرە**

پەنجەم لە ئاگری ڕووتا

لەو پریشکەدا، ئەسووتا

تەزووی ژانێکی پێ ئەدام

گەرم، ئێجگار خۆش و بە تام (ل ٢٨٦)

وشەی (خۆش)، کە ئاوەڵناوە لە زمانی کوردیدا، هاوواتای ناتەواوە لەگەڵ فرێزی بەندی (بە تام)، کە فرێزێکی ئاوەڵناو ئاسایە.

**٢٥- (بێ دەنگ - کپ - مت):**

**لە دایک بوونی ئینسانێک**

هاژەی ئاو

خورەی چەم
دێی بێ دەنگ
لە دۆڵێکی کپی متدا (ل ٤٣٤)

هەر یەک لە وشەکانی (بێ دەنگ)، (کپ)، (مت)، کە لە دێڕی دووەمی شیعری شاعیردا هاتوون، دەبن بە هاوواتای ناتەواوی یەکتر لە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناو، لە زمانی کوردی.

**ئەنجام**

لە کۆتایی نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا بەم خاڵانە گەیشتین:

١- هاوواتایی لە دیوانی کامەران موکریدا زۆربەی پۆلە فۆرمەکانی زمانی لەخۆگرتووە.

٢- بەشی هەرەزۆری دانە هاوواتاکانی نێو دیوانی کامەران موکری وشە و فرەیزن.

٣- وشە هاوواتاکان هاوبەشن لە واتایەکدا.

٤- هەریەک لە وشە هاوواتاکان بۆ هەمان بەشە ئاخاوتن دەگەڕێنەوە لە زماندا، نەک بۆ بەشە ئاخاوتنی جیاواز.

**پەراوێزەکان:**

(١) لێرەدا جۆرج پۆل لە بارەی هاوواتاوە ئاماژە بە شێواز دەکات، وادیارە مەبەستی لە شێواز تەنها وشە نەبێت، بەڵکو پێکهاتەکانی تریش بێت، بەڵام ئاماژە بە مەرجی لە شوێنی یەکتر هاتندا دەکات لە سیاقە جیاوازەکاندا.

(٢) کامەران موکری ناوی تەواوی (موحەممەد کوڕی ئەحمەد کوڕی تەها)یە، لە ساڵی ١٩٢٩ لە شاری سلێمانی لەدایک بووە، مامۆستا و شاعیر و چیرۆکنووس بووە، سەرەتا لە زانکۆی سلێمانی و دواتر لە زانکۆی سەلاحەددین مامۆستای ئەدەبی کوردی بووە لە بەشی کوردی. لە ١٩٨٦/١٢/٧ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی دەکات و لە گردی (سەیوان) لە شاری سلێمانی بە خاک دەسپێردرێ. (دیوانی کامەران موکری، ٢٠١٢: ٥)

## لیستی سەرچاوەکان

### أ- سەرچاوەی کوردی:

١-ئـەورەحمانی حـاجی مـارف (١٩٧٥)، وشـەی زمـانی کـوردی، چاپخانـەی کۆڕی زانیاری کورد-بەغدا.
٢----------------- (٢٠١٤)، فەرهـەنگی زاراوەی زمانناسـی، چـاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.
٣- تاڵیب حوسێن عەلی (٢٠١٤)، زانستی زمان و زمانی کوردی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.
٤- حەمەی ئەحمەدی تەها (٢٠١٢)، دیوانی کامەران موکری، چاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا-سلێمانی.
٥- ساکار ئەنوەر حەمید (٢٠٠٩)، وشە خواستن لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.
٦- شێخ محەمەدی خاڵ (٢٠٠٥)، فەرهەنگی خاڵ، کوردی- کوردی، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر.
٧--------------- (٢٠١٧)، فەرهەنگی خاڵ، کوردی- کوردی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات-هەولێر.
٨- عەبدولواحید مشیر دزەیی (٢٠٠٩)، واتاسازی، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی- هەولێر.
٩---------------- (٢٠١٠)، واتاسـازی وشـە و ڕسـتە، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات-هەولێر.
١٠- کلـۆد جێرمـان و ریمـۆ لـۆبلان (٢٠٠٦)، واتاسـازی، وەرگێڕانـی: یوسـف شەریف سەعید، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر.
١١- گیوی موکریانی (١٩٩٩) فەرهەنگی کوردستان، کوردی-کوردی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس- هەولێر.
١٢----------- (٢٠١٧)، فەرهـەنگی کوردسـتان، کـوردی-کـوردی، چـاپی دووەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات- هەولێر.
١٣- محمد معروف فتاح (١٩٩٠)، زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر.

١٤---------- (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.

**ب- سەرچاوەی عەرەبی:**

١٥- أحمد مختار عمر (٢٠٠٩)، علم الدلالة، الطبعة السابعة، مطبعة عالم الكتب- القاهرة.

١٦- جورج بول (١٩٩٩)، معرفة اللغة، ترجمة: محمود فرج عبدالحافظ، مطبعة دار الوفاء الدنيا-الأسكندرية.

١٧- جون لاينز (١٩٨٥)، علم الدلالة، ترجمة: مجيد عبدالحميد الماشطة، مطبعة جامعة البصرة.

١٨------- (١٩٨٧)، اللغة والمعنى والسياق، ترجمة: عباس صادق الوهاب، الطبعة الأولى، مطبعة دارالشؤون الثقافية العامة- بغداد.

١٩- حازم علي كمال الدين (٢٠٠٧)، علم الدلالة المقارن، مطبعة مكتبة الاداب- القاهرة.

٢٠- حلمي خليل (١٩٩٧)، مقدمة لدراسة التراث المعجمي العربي، مطبعة دار النهضة العربية- القاهرة.

٢١- رمضان عبدالتواب (١٩٩٩)، فصول في فقه العربية، الطبعة السادسة، مطبعة مكتبة الخانجي-القاهرة.

٢٢- ستيفن اولمان (١٩٧٥)، دور الكلمة في اللغة، ترجمة: كمال محمد بشر، مطبعة مكتبة الشباب، الجيزة.

٢٣- سهيلة دريوش (٢٠١١)، الفروق اللغوية في المعاجم العربية، كتاب "الفروق اللغوية" لأبي الهلال العسكري نموذجا، رسالة دكتوراه، جامعة مولود معمري، تيزي وزو- الجزائر.

٢٤- الشريف بوشارب (٢٠١٥)، ظاهرة الترادف والإشتراك اللفظي في كتابي الفروق اللغوية وفقه اللغة، رسالة ماجستير، جامعة محمد لمين دباغين- الجزائر.

٢٥- شريف الجرجاني (١٩٨٣)، التعريفاتي الجرجاني، ضبط مجموعة من العلماء، مطبعة دار الكتب العلمية، بيروت- لبنان.

٢٦- عبدالحميد حسن (١٩٧١)، الألفاظ اللغوية خصائصها وأنواعها، معهد البحوث والدراسات العربية-القاهرة.
٢٧- عبدالرحمن جلال الدين السيوطي (٢٠٠٨)، المزهر في علوم اللغة وأنواعها، تعليق: محمد أحمد جاد المولى بك، محمد أبوالفضل إبراهيم، علي محمد البجاوي، الجزء الأول، الطبعة الثالثة، مكتبة دار التراث- القاهرة.
٢٨- عبدالكريم محمد حسن جبل (١٩٩٧)، في علم الدلالة، مطبعة دار المعرفة الجامعية- الأسكندرية.
٢٩- ف-بالمر (١٩٨٥)، علم الدلالة، ترجمة: مجيد عبدالحميد الماشطة، مطبعة جامعة المستنصرية-بغداد.
٣٠- الكفوي أبو البقاء (١٩٨٨)، الكليات (معجم في المصطلحات والفروق اللغوية)، تحقيق: عدنان درويش ومحمد المصري، الطبعة الثانية، مطبعة مؤسسة الرسالة، بيروت- لبنان.
٣١- نورالهدى لوشن (١٩٩٥)، علم الدلالة دراسة وتطبيقا، الطبعة الاولى، بنغازي.

**ج- سەرچاوەی ئینگلیزی:**

32-A. Lehrer (1970), Meaning in Linguistics, in Theory of Meaning, ed. A. and K. Lehrer, U.S.A.

33-A. Lehrer (1974), Semantic Fields and Lexical Structure, Amsterdam – London.

34-B. Mates (1952), in Semantics and Philosophy of Language, ed. L. Linskey, U.S.A.

35-David Crystal (2008), A dictionary of Linguistics and Phonetics- Sixth Edition, Blackwell Publishing.

36-E.A. Nida (1975), Componential Analysis of Meaning- Mouton.

37-George Yule (pdf), The Study of Language-Fifth Edition, Cambridge University Press.

38-N. Goodman (1952), in Semantics and the Philosophy of Language, ed. L. Linskey, U.S.A.

39-R. Harris (1973), Synonymy and Linguistic Analysis, Oxford.

40-WWW.Wikipedia.net-Synonym.

## د- سەرچاوەی فەڕەنسی:

41-Ahmed Moutaouakil, reflexions sur la theore de la signification dans la pense Linguistique arabe, publication de la faculte des letters et des sciences humaines de Rabat.

42-Emile Genourrier (1977), et auters Nouveau dictionnaire des Synonymes, ouvrage couronne parl academie Francaise Librairie- Paris.

43-Jean Dubois (1994), et autres, dictionnaire de lingustique et des sciences du language- Paris.

44-George Mounin (2000), Dictionnaire de la linguistique quarige, 3eme edition.

45-Microsoft Encarta (2009), C 1993-2008 Microsoft Corporation.

**ملخص البحث**

**الترادف في ديوان (كامران موكري)**

**م.م. مسعود بكر أحمد**
قسم الكيمياء الصحية – كلية العلوم الصحية
جامعة هولير الطبية

هذا البحث يهتم بالترادف عموما، ويلقي الضوء على ظاهرة الترادف من الناحية الدلالية في اللغة الكوردية في أشعار كامران موكري خاصة، وتضم الدراسة مقدمة ومبحثين:

المبحث الأول: الذي بعنوان [نظرة إلى الترادف] يتكون من ثلاثة محاور. المحور الأول يتحدث عن الجوانب المهمة في الترادف. المحور الثاني يبحث عن تعريفات الترادف عند مدارس اللغويين، ومصادر إنشاء الترادف، وأنواع الترادف، ومواضيع كثيرة أخرى حول ظاهرة الترادف. المحور الثالث يبحث عن أشكال الترادف، والترادف من ناحية أقسام الكلام.

المبحث الثاني: والذي بعنوان [الترادف في أشعار كامران موكري]، هذا المبحث عبارة عن دراسة تطبيقية لإظهار الترادف وأنواعها في قصائد الشاعر (كامران موكري) من ناحية أقسام الكلام في اللغة الكوردية. وختمت الدراسة بنتائج البحث وقائمة المصادر.

**Abstract**

## Synonymy in Kameran Mukri's Divan

**Assistant Lecturer. Masud Bakir Ahmed**
Hawler Medical University- College of Health Sciences
Clinical Biochemistry Department

This research is entitled (Synonymy in Kameran Mukri's Divan). The study is concerned the oppositeness and Synonymy in Kurdish language and sheds light on connotation and meaning in addition to the ranges of connotation.

The work consists of an introduction and two chapters: Chapter One: includes four sections: Section one is named A Look at the Synonymy, talks about definition of synonymy and important aspects of connotation. Section two deals with the meaning and the synonymy of the word, sources of synonymy, types of synonymy, and many other objects about Synonymy. Section three talks about types of synonymy and synonymy with section of speech.

Chapter Two: talks about the main subject in this research it is Synonymy in the divans of Kameran Mukri. This chapter is a practical study that shows synonymy and its types in the poetry and poems of the Kurdish poet Kameran Mukri.

The whole study ends with a conclusion followed by outcome research and the bibliography.

# شێخ عەلی خانی زەنگەنە و رۆڵی لە بەرەوپێشبردنی دەوڵەتی سەفەوی (١٦٦٩-١٦٨٩)

م. ی. دڵزار ساڵح سادق　　　　د. مووسا محەمەد خدر
بەشی مێژوو- کۆلێژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

**پێشەکی**

دەوڵەتی سەفەوی لەماوەی فەرمانڕەوایی شا سلێماندا (١٦٦٦ – ١٦٩٤) قۆناغەکانی کۆتایی تەمەنی خۆی بەسەر دەبرد، بەهۆی ئەوەی ئەو شایە بەپێچەوانەی شایە دامەزرێنەرەکانی سەرەتا، گرنگییەکی ئەوتۆیان بە دەوڵەتداری و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەیان نەدەدا. بەڵکو زیاتر سەرقاڵی خۆشگوزەرانی و کات بەسەربردن و چێژ وەرگرتن بوون لە پێگەکەیاندا، بێگومان دوورکەوتنەوە و بێ ئاگایی کەسی یەکەمی وڵات لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا دەبێتە ڕێگا خۆشکەر بۆ سەرهەڵدانی پشێوی و ئاژاوە و تێکچوونی دۆخی سیاسی و سەربازی و ئاسایشی وڵاتەکە.

لە ئەنجامی بێتوانایی و دوورکەوتنەوەی کەسی یەکەمدا، وڵات سەر دەکێشێ بەرەو ئاڵۆزی و لەبارییەک هەڵتەکانی دام و دەزگاکان و نەبوونی ئاسایش، بۆیە لەو ماوەیەدا دەرکەوتنی کەسایەتییەکی کوردی بەتوانا لە هۆزی زەنگەنەی کوردی لە ئێران وەکو سەرۆک وەزیران لەنێوان ساڵانی (١٦٦٩ – ١٦٨٩) دا، ڕۆڵێکی کارای بینی لە گێڕانەوەی سەقامگیری بۆ وڵاتی ئێران لەو ماوەیەدا، جگەلەوەی توانی دۆخی ناهەمواری ئەو وڵاتە ڕێک بخاتەوەو وڵات ببووژێنێتەوە لە بوارەکانی سیاسی و ئابووری و بازرگانی و پەیوەندیی دەرەکیدا.

هاتنەپێشەوەی هۆزی زەنگەنە بۆ سەر شانۆی ڕووداوە سیاسییەکانی ئێران خۆی لەخۆیدا گرنگیی پێگەی کورد و هۆزە کوردییەکان لە مێژووی ئەو وڵاتە دەردەخات، کەوا چۆن کوردەکان توانیویانە ڕۆڵ بگێڕن لە ئاراستەکردنی مێژووی ئەو وڵاتانەی بەسەری دابەش ببوون، چۆن کوردەکان کاریگەرییان هەبووە لەسەر سیاسەتی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی، بۆمان دەردەکەوێت کەوا بۆچی هەریەک لەو دوو وڵاتە هەوڵیانداوە کوردەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن. ئەگەر تا بەر لە گەیشتنی شێخ عەلی خانی زەنگەنە بە لووتکەی دەسەڵاتی ئێران زیاتر لەڕووی سەربازییەوە بووبێت، لەدوای هاتنی ناوبراو پێگەی کورد لە ڕووی سەربازی و کارگێڕییەوە دەست پێدەکات، بەجۆرێک شێخ عەلی خان هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی بارو دۆخی شێواوی دەوڵەتی سەفەوی سەرلەنوێ ڕێک بخاتەوە.

ئەگەرچی دەوڵەتی سەفەوی لەکاتی دەست بەکاربوونی ناوبراو لەوپەڕی لاوازیدا بوو، زیاتر بەرەو ڕووخان و دارمان هەنگاوی دەنا، شێخ عەلی خان هۆکار بوو بۆ ئەوەی پرۆسەی ڕووخانی ئەو دەوڵەتە خاو بکاتەوە و بۆ ماوەی زیاتر لە ٣٠ ساڵ دواتر، بەهۆی ئەو هەنگاوە گرنگانەی لەبوارە جیا جیاکانی سیاسی و ئابووری و سەربازی و کارگێڕی و...، شێخ عەلی خان جگە لەوەی کەوا سیاسییەکی بەتوانا بوو لە بواری دەوڵەتداریدا، هاوکات سەرکردەیەکی سەربازیی لێهاتووش بوو لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی هەڕەشە و مەترسییە ناوخۆیی و بیانییەکاندا کە مەترسییان لەسەر ئاسایشی وڵاتی ئێران دروست دەکرد، ئەو کارانەی کە شێخ عەلی خان لەماوەی ٢٣ ساڵەی سەرۆک وەزیرانییەکەیدا لە مێژووی ئێران بە ئەنجامی گەیاند گەواهیدەرن لەسەر ئەوەی کەوا ناوبراو لەڕیزی پیاوە مەزنەکانی مێژووی ئەو وڵاتە هەژمار دەکرێت و سەردەمەکەی بەزێڕین ناودەبرێت.

**١- مێژووی هۆزی زەنگەنە:**

شێخ عەلی خانی زەنگەنە سەرۆک وەزیرانی شا سلێمانی سەفەوی یەکێک بوو لە گەورە و ئەندامانی هۆزی زەنگەنەی کوردی، ئەو هۆزە هەرچەندە دابەش بوونە بەسەر هەردوو بەشی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی مێژوونووسانی کورد و بیانی لەسەر ئەوە کۆکن کەوا زەنگەنەکان یەکێکن لە هۆزە ڕەسەنەکانی کورد. (mathee, 1994, p80). مێژوونووس نەتەنزی پێی وایە کەوا ئەو هۆزە لە سەرەتادا لەژێر دەسەڵاتی ئەتابەکی لوڕەکان نیشتەجێ بوونە. (نطنزی، ١٣٣٦ش، ص٦٤٩). هەر ئەمەش وایکردووە هەندێک لەمێژوو نووسان پێیان وابێت کەوا هۆزی زەنگەنە پێکهاتەیەکن لە لوڕ و کورد[1]. (میرزا سمیعا، ١٣٤٨ش، ص ٢٥).

سەبارەت بە ناوی زەنگەنە، بەهەمان شێوە سەرچاوەکان بۆچوونی جیاوازیان هەیە، لەوانە هەندێک پێیان وایە کەوا ناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ زێدی نیشتەجێ بوونیان کە بەو ناوە ناسراوە. (توحدی، ١٣٦٤ش، ص١٠١). بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕایەکی دیکە هەیە پێی وایە ناوی هۆزی زەنگەنە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە ڕووداوە ئەفسانەییەکانی مێژووی ئێران. (سلطانی، ج٢، ١٣٧٢ش، ص٦٤٩).

ئەو هۆزە لە شاری کەرکووک و خانەقین و کفری و ناوچەکانی دەوروبەری نیشتەجێن جگە لەوەی بەشێکی دیکەشیان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە شاری کرماشان نیشتەجێ بوونە. (مردوخی، ١٣٧٩ش، ص ١٠٦). هەرچەندە مێژووی کۆچکردنی ئەو هۆزە بۆ ناو خاکی ئێران دیار نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە مێژوونووسان پێیان وایە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شاڵاوی مەغۆلەکان بۆ سەر ناوچەکە لە ناوەڕاستی سەدەی ١٣ز. بۆیە بەشێک لەو هۆزە لەژێر کاریگەری ئەو شاڵاوەدا ناوچەکانی خۆیان بەجێ هێشتووە و لە باکووری ئێران و ناوچەی ئازربایجان نیشتەجێ بوونە. (توحدی، ج٢، ١٣٦٤ش، ١٠٣).

هۆزی زەنگەنە دابەشی سەر کۆمەڵێک تیرە و بەرەبابی جیاواز بوونە، بەجۆرێک بە سەر هەردوو پارچەی باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستاندا دابەش بوونە.[٢] لەرووی زمانەوە هۆزی ناوبراو بەزمانی کوردی شێوەزاری سۆرانی لە باشوور و ئەوانەشی کەوتوونەتە سنووری رۆژهەڵاتی کوردستان بەتایبەتی شاری کرماشان بەشێوەزاری کەلهوری گفتوگۆ دەکەن، لەگەڵ ئەمەشدا مێژوو نووس سوڵتانی پێی وایە کەوا زەنگەنە و کەلهور پێشتر بە یەک شێوەزار ئاخاوتنیان کردووە، لەرووی ئاینیشەوە جگەلەوەی لەسەر ئاینی ئیسلامن بەگوێرەی هەڵکەوتەی جوگرافییان بەسەر هەردوو مەزهەبی سوننە و شیعە دابەش بوونە، بەتایبەتی ئەوانەی کەوتوونەتە ناو سنووری رۆژهەڵاتی کوردستان و ناوچەی کرماشان بەشی زۆریان لەسەر مەزهەبی شیعەن، ئەوانەشی کەوتوونەتە باشووری کوردستان زۆربەیان لەسەر مەزهەبی سوننەن. (سنندجی، ١٣٦٦ش، ص ٢٣ –٢٤؛ سلطانی، ج٢ ، ١٣٧٢ش، ص٤٦٨).

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی دیکە لەمێژوو نووسان پێیان وایە هۆکاری دابەشبوونی ئەو هۆزەیە دەگەڕێتەوە بۆ دوای هاتنی شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠١ – ١٥٢٤) بۆ سەرتەختی پادشایەتی ئێران، بەهۆی ئەو پەیوەندییە نزیکەی لەگەڵ شای ناوبراو هەیانبووە بەشێک لەو هۆزە کۆچیان کردووە بۆ ناوچەکانی سنووری دەوڵەتی سەفەوی[٣] و لە جەنگی چاڵدێرانی ساڵی (١٥١٤) هاوکاری دەوڵەتی سەفەوییان لەدژی دەوڵەتی عوسمانی کردووە.. (بدلیسی، ١٣٦٤ش، ص ٤٣).

دوای ئەوەی هۆزی زەنگەنە چوونە ریزی شا ئیسماعیلی سەفەوی لە ئێران، لەلایەن شای ناوبراو پۆست و پلەی سەربازی و کارگێڕیی گرنگ درا بەسەرکردەکانی ئەو هۆزەیە لە دەوڵەتی سەفەویدا، بێگومان ئەمەش بوو بەجێگای نیگەرانی و بێزاری سەرکردەکانی قزلباشەکان[٤]. (سلطانی، ج٢، ١٣٧٢ش، ص٦٥ ).

هەرچەندە لە سەردەمی شا تەهماسبی یەکەم (١٥٢٤ – ١٥٧٦)دا بەهۆی کۆچی دوایی سەرکردە بەتواناکانی ئەو هۆزە ڕۆڵ و پێگەی سیاسی هۆزی زەنگەنە لەدەربـاری سەفەوی بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی شا ئیسماعیلی یەکەم پاشەکشەی کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گرنگیی پێگەی سەربازییان لەدەست نەدابوو، بەهەمان شێوەی سەردەمی پێشوو گەورەکانی ئەو هۆزەیە لەڕیزی سوپای سەفەویدا لەدژی عوسمانییەکان بەشدارییان لە شەڕەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتەدا کرد. شا تەهماسب لە کاتی سەرهەڵدانی هەرجۆرە هەڵگەڕانەوە و ڕاپەڕینێک لەناوچە جیا جیاکانی دەوڵەتی سەفەوی سوودی لە توانای سەربازی ئەو هۆزەیە وەردەگرت بەتایبەتی لەکاتی سەرکوتکردنی نەیارەکانیدا. (بدلیسی، ١٣٦٤ش، ص ٤٣١).

شا تەهماسبی یەکەم بە مەبەستی پاراستنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکەی و بەهێزی توانای سەربازی هۆزی زەنگەنە، بەشێک لە ئەندامانی ئەو هۆزەی ڕاگواستەوە بۆ ناوچەکانی خوراسان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران، تاوەکو ئەو ناوچەیە لە هەڕەشە و هێرشی بەردەوامی ئۆزبەکەکان[٥] بۆ سەر دەوڵەتی سەفەوی پارێزراو بێت. جگە لەوەی بەشێکی دیکەشی گواستەوە بۆ کرماشان و ناوچە سنوورییەکانی دەوڵەتی سەفەوی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆ مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی پەلاماری هێزەکانی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی کە لەو ناوچەیەدا دەیانکردە سەر دەوڵەتی سەفەوی. (توحدی، ج٢، ص ١٣٧ – ١٥٧).

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شا محەمەد خودابەندە (١٥٧٨ – ١٥٨٧)، هۆزی ناوبراو بەشدارییان لە شەڕەکانی دەوڵەتی سەفەوی کرد لەدژی عوسمانییەکان لە ناوچەکانی قەرەباغ و دەوروبەری لە باکووری ئێران، بێگومان لەو شەڕانەدا ئەندامانی ئەو هۆزە قوربانیی زۆریان دا بۆ پارێزگاریکردن لەدەوڵەتی سەفەوی، بەهۆی ئەو خزمەتەی بەدەوڵەتی سەفەوییان کرد، شای ناوبراو فەرمانڕەوایی ناوچەکانی

سەنقوڕ و کرماشانی بەو هۆزە ڕاسپارد، دواتر شا عەباسی یەکەم (١٥٨٧ – ١٦٢٩) یەکێک لە گەورەکانی هۆزی ناوبراو بەناوی عەلی بەگ ناسراو بە (عالی بالی – بالا) دەکرێتە یوزباشی[٦] و فەرماندەی هێزەکانی زەنگەنەی پێدرا لەنێو سوپای سەفەوی. (منجم یزدی، ١٣٦٦ش، ص ٢٧١؛ مهدوی، ١٣٦٩ش، ص ٧٦٥).

دواتر ناوبراو ڕۆڵی کارای دەبینێت لەنزیک کردنەوەی میرنشینی ئەردەڵان لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی و بەتایبەتی هەڵۆخانی ئەردەڵان، دوای ئەوەی خان ئەحمەد خانی ئەردەڵان لایەنگریی خۆی بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاندبوو، هەڵۆخان بە نێوانگیری عەلی بالی بەگی میری هۆزی زەنگەنە لە شا عەباس نزیک بۆوە و دواتر فەرمانڕەوایی ناوچەی ئەردەڵانی پێدرا. (برن، ١٣٧٥ش، ص ١١). جگە لە وەی ماوەیەکیش فەرمانڕەوای خوراسان بوو هەر لەسەردەمی شا عەباسی یەکەم. (سلطانی، ج٢، ١٣٧٢ش، ص ٦٥٣ ).

پاشان لەساڵی ١٦١٨ شا عەباس پۆستی ئەمیر ئاخورباشی[٧] دەدات بەناوبراو لەدەرباری شای سەفەوی و بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ لەو پۆستەدا دەمێنێتەوە. (اصفهانی، ١٣٦٨ش، ص ٢٤٦ – ٢٥٠). لەدوای ئەویش کوڕەکەی شێخ عەلی خانی زەنگەنە لەساڵی ١٦٣٨ هەمان پۆستی وەرگرت لە دەرباری شای سەفەوی لەو پۆستەدا مایەوە تا دەبێتە سەرۆک وەزیران لە ساڵی ١٦٦٩ دا. (اصفهانی، ١٣٦٨ش، ص٢٦٨).

### ٢– ژیانی شێخ عەلی خان:

لە ڕاستیدا باسکردن لە ژیانی شێخ عەلی خانی زەنگەنە بەر لەوەی ببێت بە سەرۆک وەزیران کارێکی ئاسان نییە، بەهۆی ئەوەی سەرچاوە مێژووییەکان زانیاریی زۆر کەمیان لەم بارەیەوە خستۆتە ڕوو و ئاماژەیان پێی نەکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەم توێژینەوەدا هەوڵدراوە تیشک بخرێتە سەر هەندێک لایەنی ژیانی ناوبراو و ڕوون بکرێتەوە. ناوی تەواوی شێخ عەلی خان کوڕی عەلی بالی بەگی

زەنگەنەیە، لە ساڵی ١٦١١ لەدایک بووە، ناسراوە بە زەنگەنە بەهۆی ئەوەی سەر بەهۆزی زەنگەنەی کوردییە، (خاتون ابادی، ١٣٥٢ش، ص ٥٠٣؛ قدیانی، ١٣٩٢ش، ص ٨٧٤).

سەبارەت بە شوێنی لەدایکبوونی و سەردەمی منداڵی و چۆنێتی پێگەیشتنی بەهەمان شێوە زانیارییەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە. بەڵام بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی کە سەرچاوەکان ئاماژەیان پێداوە مێژووی لەدایکبوونی کەوتۆتە بەر لەمێژووی دەست بەکاربوونی وەکو ئەمیر ئاخورباشی لە دەرباری شای سەفەویدا لە ساڵی ١٦٣٨ دا، پاشان لە ساڵی ١٦٤٠دا لەدوای مردنی شارۆخ سوڵتانی برا گەورەی دەبێت بە میری هۆزی زەنگەنە. (حسینی استرابادی، بی تا، ص ٢٦٤؛ اصفهانی، ١٣٦٨ش، ص ٢٨٦).

شێخ عەلی خان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شا عەباسی دووەمی سەفەوی (١٦٤٢ – ١٦٦٦)، لە ساڵی ١٦٥٣دا کرایە فەرمانڕەوای شاری کرماشان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. (قزوینی، ١٣٦٩ش، ص ١٨٢). ناوبراو لەو ماوەیەی کە فەرمانڕەوایی شاری کرماشانی دەکرد توانا و لێهاتوویی خۆی بۆ دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی سەفەوی دەرخست و ببوو بە جێگای سەرنجی کاربەدەستەکان، بەجۆرێک هەوڵێکی زۆری دا لە بواری ئاوەدانکردنەوەی شاری کرماشان و ناوچەکانی دەوروبەری، هەروەها ڕۆڵی بینی لە ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیی نێوان فەرمانڕەوای هەرێمی لوڕستان لەگەڵ شای سەفەوی، بەتایبەتی لەدوای ئەوەی پەیوەندیی نێوانیان تێک چووبوو. (قزوینی، ١٣٦٩ش، ص ١٨٢).

بەهۆی ئەو توانا و لێهاتووییەی کە لە بواری حکومەتدارییەوە پێشکەشی کردبوو، فەرمانڕەوایی ناوچەکانی سەنقوڕ و دەینەوەری پێدرا لەساڵی ١٦٥٥دا. (قزوینی، ١٣٦٩ش، ص ٢٢٧)، پاشان لە ساڵی ١٦٦٦ لەلایەن دەرباری سەفەوییەوە بانگهێشتی شاری ئەسفەهانی پایتەخت دەکرێت و دەکرێتە فەرماندەی هێزێکی سەربازی و ڕەوانەی ناوچەکانی باکووری خوراسان دەکرێت لە ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی

سەفەوی و ئەرکی سەرکوتکردنەوەی ئۆزبەکەکانی لەو سنوورە دا پێدەسپێردرێت کە لەو ماوەیەدا هێرشیان کردبووە سەر سنوورەکانی دەوڵەتی سەفەوی.(Mathee, 1994, p80).

لە ڕاستیدا بەپشت بەستن بەزانیارییەکانی نێو سەرچاوە مێژووییەکاندا بۆمان دەردەکەوێت کەوا شێخ عەلی خانی زەنگەنە کەسێکی بەتوانا بووە لەڕووی سیاسی و سەربازی و کارگێڕیشەوە. لەم بارەوە مێژوو نووس (جان شاردن ١٦٤٣ - ١٧١٣) دانی ناوە بەتوانا و لێهاتوویی شێخ عەلی خان بەهۆی هەبوونی ئەزموونێکی درێژ کە خۆی لە ٣٠ ساڵ خزمەتکردنی سیاسی و سەربازی داوە لە دەوڵەتی سەفەویدا. (شاردن، ١٣٤٥ش، ج ٨، ص ١٥٨).

ژیانی سیاسی شێخ عەلی خانی زەنگەنە لەدوای مردنی شا عەباسی دووەمی سەفەوی و هاتنە سەر تەختی پادشایەتی شا سەفی ناسراو بە (شا سلێمان)(١٦٦٦ – ١٦٩٤)، زیاتر بەرەوپێش چوونی بەخۆوە دیت، بەجۆرێک تا بەر لەهاتنە سەر دەسەڵاتی شای ناوبراو شێخ عەلی خان فەرمانڕەوای هەرێمی کرماشانی دەکرد، بەڵام لەگەڵ دەست بەکاربوونی شای نوێی سەفەوییەکان پشێوی و ئاڵۆزی لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران سەری هەڵدا، بۆ ناوبراو لەلایەن شای نوێوە ڕاسپێردرا بۆ ئەوەی بارودۆخی ئاڵۆز و پشێویی سنووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکەی لەڕووی سەربازییەوە کپ بکاتەوە، بەمەش ئەرکی بەرقەرارکردنی ئاسایشی ناوچەی خوراسان و دەرکردنی ئۆزبەکەکانی خرایە ئەستۆ. (شاردن، ١٣٤٥ش، ج ٩، ص ١٨١).

دوای ئەوەی ناوبراو توانی لێهاتوویی و توانای سەربازی و سیاسیی خۆی بۆ دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی سەفەوی بەگشتی و شا سەفەوی بەتایبەتی بسەلمێنێت، لە ساڵی ١٦٦٩دا لەلایەن شاوە بڕیاردرا کەوا شێخ عەلی خانی زەنگەنە بکرێت بەسەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی سەفەوی. (شاردن، ١٣٤٥ش، ج ٩، ص ٢٠٩).

ئەو کاتەی شێخ عەلی خانی زەنگەنە وەکو سەرۆک وەزیران دەست بەکار بوو جگە لەوەی ئۆزبەکەکان لەناوچەی خوراسان لە سنوورەکانی رۆژهەڵاتی ئێران پەلاماری دەوڵەتی سەفەوییان دابوو، هاوکات هۆزە کوردەکانی ناو دەوڵەتی سەفەوی لە ناوچەی رۆژئاوای ئەو وڵاتە لەدژی دەوڵەتی سەفەوی راپەڕیبوون. (Foran, 1994, p 296).
بۆ ئەو مەبەستە شا عەباسی دووەم بەهۆی گرنگیی ناوچە کوردنشینەکان کە کەوتبووە ناوچە سنوورییەکانی نێوان وڵاتەکەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە هەوڵیدەدا بەرێگای ئاشتی و گفتوگۆ لەگەڵ کوردەکاندا کۆتایی بەراپەڕینەکانیان بێنن، بەڵام لەم هەنگاوەیدا سەرکەوتوو نابێت بۆیە شێخ عەلی خانی زەنگەنە دەکات بە سەرۆک وەزیران و فەرماندەی بەشێک لە هێزەکانی سەفەوی و رەوانەی ناوچەی خوراسانی دەکات، بۆ ئەوەی کۆتایی بە هەڵگەڕانەوەی ئۆزبەکەکانیش بێنێ و تەمبێیان بکات. (فسایی، ١٣١٣ش، ص ١٥٣).

لێرەدا دەتوانین بڵێین کەوا هۆکاری ئەوەی شا عەباسی دووەم شێخ عەلی خانی زەنگەنەی کرد بەسەرۆک وەزیران، بەهۆی ئەوەی ناوبراو ئەزموونی پێشینەی لەڕووی سەربازییەوە چەندین جار پێشتر لەشەڕی لەگەڵ ئۆزبەکەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو، لە هەمان کاتدا زەنگەنەکان هۆزێکی بەهێز و توانابوون لەڕووی سەربازییەوە، ئەمەش دەبوو بەپاڵپشت و پشتیوانییەکی بەهێز لە ڕووبەڕوو بوونەوەی گرفتەکاندا، جگە لەوەی ناوبراو کورد بوو و رێزی زۆری هەبوو لەناو کوردەکاندا، بۆیە سەرکەوتوو بووە لە نەهێشتنی راپەڕینی کوردەکان لە ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران.( Mathee,1991:80).

شێخ عەلی خان دوای بوونی بە سەرۆک وەزیران، هەوڵ و توانایەکی زۆری خستەگەڕ بۆ ئەوەی کاروباری وڵاتەکەی بەشێوازێکی رێکوپێک و سەرکەوتووانە بەڕێوە ببات، بۆ ئەو مەبەستە هەوڵی دا سەرلەنوێ ئاسایش بگەڕێنێتەوە بۆ وڵات و کاروباری سیاسی و کارگێڕی رێک بخاتەوە و کەسانی شارەزا و لێهاتوو لە پلە و

پۆستەکان دابنێت، سەرەڕای ئەوەی هەوڵێکی زۆری دا بۆ ڕێکخستنەوەی کاروباری وڵاتەکەی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوبراو لەدوای دوو ساڵ خزمەتکردن بە وڵاتەکەی لەلایەن شا سلێمانی سەفەوی لە پۆستەکەی دوور دەخرێتەوە. (مشیزی، ١٣٦٧ش، ص ٣٨٨).

سەبارەت بە هۆکاری دوورخستنەوەی شێخ عەلی خان لەلایەن شا سلێمانی سەفەوییەوە لەساڵی ١٦٧١دا، زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا شای ناوبراو بەهۆی هۆگری بە خواردنەوەی مەی و سەرقاڵبوونی بە کات بەسەربردن و بێ ئاگایی لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا، بەردەوام لەلایەن شێخ عەلی خانەوە ڕەخنەی لێ گیراوە و داوای لێکردووە واز لە خواردنەوەی مەی بێنێت و کاتەکانی خۆی تەرخان بکات بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری وڵاتەکەی، بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی بێزاربوونی شا سلێمان لە ناوبراو و بۆیە بڕیاری دوورخستنەوەی دەدات لە پۆستەکەی. (شاردن، ١٣٤٥ش، ج ٣، ص٩، ١٠٨).

ژمارەیەک لە مێژوو نووسان ئاماژەیان بە کەسایەتی شێخ عەلی خانی زەنگەنە داوە و باسیان لەوە کردووە، کەوا ناوبراو جگە لەوەی سەرکردەیەکی سەربازی، سیاسییەکی بەتوانا بوو، هاوکات موسڵمانێکی بڕوادار بووە و لەسەر مەزهەبی شیعە بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دژی سوننەکان نەبووە. (کمپفر، ١٣٦٣ش، ص٨٤). لەڕاستیدا سەرچاوەکان لەبارەی مەزهەبی شێخ عەلی خان ڕای جیاوازیان هەیە، بەجۆرێک سەرچاوە ئێرانییەکان پێیان وایە کەوا ناوبراو کەسێکی شیعە مەزهەب بووە، بۆ ئەو مەبەستەش پشتیان بەو بەڵگەیە بەستووە کەوا ئەو بەشەی هۆزی زەنگەنەی کە کەوتوونە ناو سنووری وڵاتی ئێران لەسەر مەزهەبی شیعەن و لە سەردەمی شا ئیسماعیلی یەکەمی سەفەوی (١٥٠١ – ١٥٢٤) مەزهەبی خۆیان گۆڕیوە و بوون بە شیعە. (خاتون ابادی، ١٣٥٢ش، ص٥٣٤؛ سلطانی، ج٢، ١٣٧٢ش، ص٦٥٠) سەرچاوە بیانییەکانیش بەپێچەوانەوە پێیان وایە کەوا ناوبراو کەسێکی سوننە مەزهەب بووە، بۆ ئەو مەبەستەش پشتیان بەوە بەستووە کەوا بەهۆی

ئەوەی شـێخ عەلـی خـان کـورد بـووە، زۆربەی کوردەکـانیش لەسـەر مەزهەبی سوننەن بۆیە ناوبراویان بەکەسێکی سوننە مەزهەب داناوە. (کمپفر، ١٣٦٣ش، ص٨٤؛ Newman, 2006, p94).

جـگە لەوەی نـاوبراو کەسـێک بـوو بە دوور بـوو لە کـات بەسەربردن و ڕابواردن کە لەو کاتدا زۆرێک لە کەسایەتییە پلە باڵاکانی دەوڵەت پێـوەی سـەرقاڵ بـوونە، هەروەهـا دژی ئەوە بـووە کەوا شـا سـلێمان مەی بخـواتەوە و هەوڵـی زۆری داوە تـاکو شـا دەسـت لەم خووەی هەڵبگرێت و سـەرقاڵی بەڕێوەبردنی کاروبـاری وڵاتەکەی بێت، بەڵام بەپـێچەوانەوە شـای نـاوبراو کە ڕۆژێکیـان سـەرخۆش دەبێـت فەرمـانی بە شـێخ عەلـی دەکـات کە مەی بخـواتەوە، بـۆیە دوای ئەوەی بەزۆر کارەکەی پێدەکات ناوبراو لەهۆش خـۆی دەچێت و دەبێتـە جێی گاڵتەجـاڕی شـا و دەربـارەکـانی، بـۆیە دوای بە ئاگـا هـاتنەوەی بڕیـار دەدات واز لە پۆستەکەی بێنێت بەهـۆی ئەو سـووکایەتییەی پێـی کـراوە لەلایەن شـاوە. (شـاردن، ١٣٤٥ش، ج ٣، ص٩، ١٠٨؛ ملکـم، ١٣٨٠ ش، ج ١،ص ٣٩٩ – ٤٠٠).

هەروەهـا ڕایەکـی دیـکە پێـی وایە کەوا هۆکـاری دوورخـرانەوەی شێخ عەلی خان لەلایەن شا سلێمانەوە دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆکی کوێر[٧] کردنـی برایەکـی شـا سـلێمان، بەتـایبەتی دوای ئەوەی شـای نـاوبراو فەرمان دەکات بە کوێرکردنی یەکێک لە برایەکانی بەهۆی ئەوەی دایکی شا هەوڵدەات ڕێگری لەم کارەی بکات بۆیە شا سلێمان تووڕە دەبێت و خۆی سەرپەرشتی کارەکە دەکات، هەروەها فەرمان بە خزمەتکارەکانی دەربار دەکات نابێت تیماری برینەکەی بکەن، بۆیە ئەویش لەباڵاخـانەی کۆشـکی شـا خـۆی هەڵـدەداتە خـوارەوە و خـۆی دەکوژێـت، ئەم ڕووداوەیە سـەرۆک وەزیـران نیـگەران دەکـات و ڕەخنە لەو ڕەفتـارەی شـا دەگرێت، ئەمەش وادەکـات شـا سـلێمان لێـی بڕەنجێت و فەرمـانی دوورخستنەوەی دەربکات. (Rudi, 1994, p84).

لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین بەگوێرەی ئاماژەی زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان کە لەبارەی کەسایەتی شا سلێمان نووسیویانە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا شا سلێمان کەسێکی توندڕەو و بەردەوام مەست و خەریکی ڕابواردن بووە، هاوکات کەسێکی بێ توانا و بێ ئاگا بووە لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەی، بەهۆی ئەوەی کەوا شێخ عەلی خان هەوڵیداوە بۆ ئەوەی تواناکانی خۆی بخاتە خزمەتی حوکمڕانییەکەی. بەهۆی ئەوەی لەماوەی فەرمانڕەوایی ناوبراودا وڵاتی ئێران لە ناوچەکانی باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای وڵاتەکەی لەلایەن هێزە نەیارەکانیەوە پەلامار دەدرێت و خاکی داگیر دەکرێت. (شاکر، ١٩٩٥، ص١٣).

شا سلێمان دوای ئەوەی هەستی بە هەڵەی خۆی کردبوو بەرامبەر بە وەزیرەکەی، بۆیە جگە لەوەی ئامادە نەبوو کەسێکی دیکە بکات بە سەرۆک وەزیران، هاوکات هەوڵی دا شێخ عەلی خان بگەڕێنێتەوە بۆ سەر پۆستەکەی، بۆیە دوای چوار مانگ لە دوورکەوتنەوەی لە پۆستەکەیدا جارێکی دیکە شێخ عەلی خان لەسەر داوای شا سلێمان لە ساڵی ١٦٧١ دا گەڕایەوە بۆ سەر پۆستەکەی پێشووی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات. (ملکم، ١٣٨٠ ش، ج ١،ص ٤٠٠).

لەڕاستیدا دەکرێت بڵێین، کەوا شا سلێمان هەرچەندە شێخ عەلی خانی لە پۆستەکەی دوور خستۆتەوە، بەڵام مەبەستی دوورخستنەوەی یەکجاری نەبووە، لەبەر دوو هۆکار. یەکەم لەدوای دوورخستنەوەی کەسی لە شوێنی ئەو دانەناوەتەوە. دووەم: شا سەردانیکردنی دەرباری شای لە شێخ عەلی خان قەدەغە نەکردبوو، بۆیە ناوبراو لەو ماوەیەی کە لە پۆستەکەی دوورخرابۆوە ماوە ماوە سەردانی دەرباری شای دەکرد و شا سلێمان لە کارەکانیدا پرس و ڕاوێژی پێدەکرد. (مشیزی، ١٣٦٧ش، ص٣٨٨).

دوای ئەوەی شێخ عەلی خانی زەنگەنە بەڕێزەوە گەڕایەوە سەر کارەکەی پێشووی لە ساڵی ١٦٧٣دا، ئیتر جارێکی دیکە لەلایەن شاوە

ناچار نەکرا بۆ ئەوەی مەی بنۆشێت. (شاردن، ١٣٤٥ش، ج ٣،ص ١٠٨؛ مشیزی، ١٣٦٧ش، ص٤٠٦). بەمەش لەو مێژووە بەدواوە ماوەی دووەمی سەرۆک وەزیرانی شێخ عەلی خانی زەنگەنە دەست پێدەکات و بەیەکێک لە درێژترین ماوەی سەرۆک وەزیرانی دادەنرێت لەمێژووی ئێران کە تا ساڵی ١٦٨٩ بەردەوام بوو لە کارەکەیدا، ناوبراو لەو ماوەیەدا هەوڵێکی زۆری دا لە دووبارە ڕێکخستنەوەی دەزگاکانی کارگێڕی و سەربازی و سیاسی و ئەنجامدانی چاکسازی و بەهێزکردنەوەی ئەو دەزگایانە. (خاتون ابادی، ١٣٥٢ش، ص٥٣٤).

**٣- کارەکانی شێخ عەلی خان لەماوەی سەرۆک وەزیرانیدا (١٦٦٩ - ١٦٨٩):**

زۆربەی ئەو سەرچاوانەی لەبارەی مێژووی ئێرانیان نووسیوە ئاماژەیان بەتوانا و لێهاتوویی کەسایەتی شێخ عەلی خانی زەنگەنە کردووە، وەکو کەسێکی خاوەن پێگەیەکی بەهێز لەناو دەزگای دەوڵەتی سەفەویدا بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ بەدڵسۆزی کارەکانی ڕاپەڕاندووە و چارەسەری ئەو گرفت و ئاستەنگانەی لەماوەی کارکردنیدا ڕوو بە ڕووی بوونەتەوە کردووە و بەسەریاندا زاڵ بووە.

شێخ عەلی خان جگە لەوەی هەوڵیداوە کارەکانی وڵاتەکەی بەڕێکی بەڕێوە ببات، هاوکات دژی کاری بەرتیل خۆری بووە لەناو دام و دەزگاکانی دەوڵەتەکەیدا و بەهیچ جۆرێک ڕێگای بە بەرتیل خۆری نەداوە و وەری نەگرتووە لەماوەی کارکردنیدا. (شاردن، ١٣٤٥ش، ج٣، ص١٠٤). چونکە بەر لەوەی شێخ عەلی خان ببێت بە سەرۆک وەزیران کاری بەرتیل خۆری لەناو دام و دەزگاکانی دەوڵەتی سەفەوی بەجۆرێک پەرەی سەندبوو کەسێک لە ناوچەکەی خۆیدا نەدەکرا بە کاربەدەست ئەگەر هاتبا بڕێکی زۆر بەرتیلی بە کاربەدەستەکانی حکومەتی ناوەندی نەدابایە، بێگومان بۆ ئەو مەبەستەش کاربەدەستانی هەرێمەکان فشاری زیاتریان دەخستە سەر شانی هاوڵاتیانی ناوچەکەیان و باج و سەرانەی زیاتریان بەسەردا دەسەپاندن، ئەمەش

ببوو بەدیاردە و بارێکی قورسی خستبووە سەر هاوڵاتیان و لە هەمان کاتیشدا خەڵکی دووچاری هەژاری و نەدارییەکی زۆر کردبۆوە. (باستانی پاریزی، ١٣٦٢ش، ص٢٥٦ – ٢٦٢). جگە لەوەی بەوردی کاری لەسەر کۆکردنەوە و خەرجکردنی داهاتەکان کردووە و ڕێگری لە دەست بڵاوییەکانی شا سلێمان کردووە، بۆیە لەمێژووی ئێراندا بەوە ناسراوە "شا دەبەخشێت بەڵام شێخ عەلی خان نابەخشێت"[٩]. (کمپفر، ١٣٦٣ش، ص٨٣– ٨٤).

هەروەها ناوبراو بەپێچەوانەی سەرۆک وەزیرانەکانی پێش خۆی توانیبووی تا ڕادەیەکی باش هاوسەنگی لەنێوان حکومەت و دەرباری شا و سەربازییەکان دروست بکات، چونکە ئەمە یەکێک بوو لەو ئاستەنگانەی سەرۆک وەزیرانەکانی بەر لەخۆی بەدەستیەوە دەیانناڵاند، بەڵام شێخ عەلی بە لێزانی و زیرەکیی خۆی توانیبووی ئەو کێشەیە چارەسەر بکات و لەماوەی سەرۆک وەزیرانییەکەیدا دووچاری گرفتی لەم شێوەیە نەبێتەوە و لەو بڕیارانەی دەریاندەکات دژایەتی نەکەن، بۆ ئەو مەبەستەش توانیبووی خەڵکانێک لەنێو دەربار و شوێنە جیاجیاکانی سەربازی و کارگێڕیدا بچێنێت بۆ ئەوەی لەهەر هەنگاوێکی نەیارەکانیدا ئاگاداری بکەنەوە. (کمپفر، ١٣٦٣ش، ص٥٥، ٧٨ – ٧٩).

شێخ عەلی خان لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا زیاتر پشتی بە کەسە نزیکەکانی خۆی دەبەست، واتە کوردەکانی لەو پلەو پایە سەربازی و یەکە کارگێڕییەکانی هەرێمەکانی دادەنا، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانێت زاڵ بێت بەسەر گرفتەکاندا لەهەمان کاتیشدا ڕێگری بکات لە هەڵگەڕانەوە و یاخیبوونی نەیارەکانی لە ناوچە جیاجیاکانی وڵاتدا .(Newman, 2006, p94) بەو مانایەی زۆربەی پلە و پایە سەربازی و کارگێڕییەکانی دەوڵەت لەسەر داوا و چاودێریی ڕاستەوخۆی ئەو دادەنران. (سانسون، ١٣٤٦ش، ص٤٤).

لە ڕاستیدا دەتوانین بڵێین کەوا شێخ عەلی خان بەئەندازەیەک دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، بەجۆرێک سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە

بەوە دەکەن زۆرجار وا ڕێک کەوتووە ناوبراو فەرمانەکانی شا سلێمانی ڕەت کردۆتەوە، بەتایبەتی لەو فەرمانانەی کە هەستی دەکرد لە بەرژەوەندیی وڵاتدا نییە، ئەویش دوای ئەوەی ڕاوێژی لەگەڵ شادا دەکرد و بڕوای پێدەهێنا کەوا ئەو فەرمان و بڕیارەی داویەتی سوود بەوڵاتەکەی ناگەیەنێت و باشتر وایە هەڵیوەشێنێتەوە. (مشیزی، ١٣٦٧ش، ص٤٥٤ – ٤٥٧). بێگومان ئەمەش دەرخەری توانا و لێهاتوویی شێخ عەلی خانی زەنگەنەیە لە بواری کارگێڕی و دەوڵەتداریدا، لەپاڵ بەرزی توانای قسە زانی و ڕاوێژکاری و بڕوا پێهێنان بووە کە توانیویەتی شا لەو فەرمانە پەشیمان بکاتەوە کە لە بەرژەوەندیی وڵاتەکەی و دەسەڵاتەکەیدا نەبووە.

لە بواری داراییدا شێخ عەلی هەوڵێکی زۆری خستەگەڕ بۆ ئەوەی داهاتی خەزێنەی وڵاتەکەی زیاد بکات، لەبارەی کۆکردنەوەی داهاتەکانی وڵات زۆر توند بوو، خۆی بەوردی چاودێری کۆکردنەوەی داهاتی هەرێم و ناوچە جیاوازەکانی وڵاتی دەکرد. (کمپفر، ١٣٦٣ش، ص٨٣). بۆ ئەو مەبەستە شاردن ئاماژە بەوە دەکات کەوا شێخ عەلی خان چەندین جار لەماوەی حوکمڕانیی خۆیدا هەوڵیداوە کەوا سەرلەنوێ زەویوزاری هەرێمەکان ڕێک بخاتەوە، بەڵام ئەو کارەی بۆ ناچێتە سەر، بەهۆی بەهێزیی فەرمانڕەوای هەرێمەکان بیری لەوە کردبۆوە ئەگەر بێت و هەنگاوێکی لەم شێوەیە بنێت ڕەنگە ئەو ناوچانە لەدژی فەرمانەکانی حکومەتی ناوەندی یاخی بن و هەڵگەڕێنەوە، بەمەش لەبری چاکسازی لە بواری کارگێڕیدا وڵات سەر بۆ ئاژاوە و پشێوی دەکێشێت. (شاردن، ١٣٤٥ش، ج٣، ص١٠٤). بۆیە دەکرێت بڵێین سەرباری هەوڵە بێ وچانەکانی شێخی زەنگەنە بۆ بووژاندنەوەی خەزێنەی وڵات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر سەرکەوتوو نابێت، بەهۆی ئەو ئاستەنگانەی کە لەو بوارەدا دەهاتنە بەردەمی. (باستانی پاریزی، ١٣٦٢ش، ص٢٦٥).

لە بواری پەیوەندیی نێودەوڵەتیدا، شێخ عەلی خان بڕوای وابوو کەوا پێویستە هیچ جۆرە کێشە و گرفتێکی لەگەڵ وڵاتانی بیانی بەگشتی

و هاوسێیەکانی بەتایبەتی نەبێت، هەربۆیە لە سەردەمی وەزارەتەکەیدا پەیوەندییەکانی وڵاتی ئێران لەگەڵ وڵاتانی بیانی دەچێتە قۆناغێکی نوێوە، ژمارەیەکی زۆری نوێنەری وڵاتانی بیانی ڕوو دەکەنە دەرباری سەفەوی بە مەبەستی دروستکردنی پەیوەندیی سیاسی و بازرگانی لەگەڵ ئەو وڵاتەدا، بەتایبەتی لەگەڵ ڕووسەکان، پێی وابوو بەهۆی هاوسنوورییان لەگەڵ ئەو وڵاتەدا پێویستە پەیوەندییەکی دۆستانەی بەهێزی لەگەڵیاندا هەبێت. (باستانی پاریزی، ١٣٦٢ش، ص٢٦٦).

بۆ ئەو مەبەستە شێخ عەلی خانی زەنگەنە، سەرۆک وەزیرانە کوردەکەی دەوڵەتی سەفەوی ڕێوشوێنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی بیانی ڕێکخستبوو، تەنانەت ماوە و ڕێکەوتی سەردانیکردنی دەرباری شای سەفەوی بۆیان دیاری کردبوو، بەجۆرێک ڕووسەکان بەر لە وڵاتانی تر دەیانتوانی داخوازییەکانیان بگەیەننە شا و سەرۆک وەزیرانە کوردەکەی دەوڵەتی سەفەوی. (سانسون، ١٣٤٦ش، ص٩؛ کمپفر، ١٣٦٣ش، ص٤٢). لە ڕاستیدا لە ئەنجامی خوێندنەوەی زانیارییە مێژووییەکاندا دەتوانین پەی بە ئاستی توانا و لێهاتوویی شێخ عەلی خانی زەنگەنە و هۆشیاری و دووربینی ناوبراو ببەین لە شێوازی حوکمڕانی کردنی و مامەڵەی سیاسی و بازرگانی و ئابووریدا لەگەڵ وڵاتانی بیانی.

سەبارەت بەپەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا، دەکرێت بڵێین لەو سەردەم پەیوەندیی نێوان ئەو دوو وڵاتە پەیوەندییەکی ئاشتییانە بوو، بەهۆی ئەوەی لەساڵی ١٦٣٩ پەیماننامەی زەهاو[١٠] لەنێوانیاندا مۆرکرا، ئەم پەیماننامەیەش ڕێگاخۆشکەر بوو بۆ هەردوو وڵات زیاتر گرنگی بە کێشە ناوخۆییەکانی وڵاتەکەیان بدەن و سەرنجەکانیان بخەنە سەر سنوورەکانیان لە بەرەی ڕۆژهەڵات و بەتایبەتی سەرقاڵی سەرکوتکردنەوەی پەلاماری ئۆزبەکەکان بن لەو سنوورانەدا، عوسمانییەکانیش بەهەمان شێوە قورسایی خۆیان خستە سەر شەڕ و ململانێکانیان لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپی لە بەرەی ڕۆژئاوای وڵاتەکەیاندا. (الدجیلی، ١٩٩٩، ص٦٨ – ٧٦).

شێخ عەلی خان کەسێک بوو گرنگیی زۆری دەدا بە بواری ئەدەب و هونەر بەگشتی و شیعر بەتایبەتی، بۆیە هەمیشە دیوەخانی پڕ بووە لە شاعیرە ناودار و بەتواناکانی سەردەمی خۆی، ڕێزی زۆری لێیان گرتووە. (نصرابادی، ١٣٦١ش، ص٣٥٠). جگەلەوەی ناوبراو بەدرێژایی ٢٠ساڵی ماوەی سەرۆک وەزیرانیەکەی لە بواری ئاوەدانکردنەوە و نوێسازیدا، ژمارەیەکی زۆر خانوو و کۆشک و مزگەوت و ڕێگای هاتوچۆو پرد و تەکیە و کاروان سەرای لە ناوچە جیاوازەکانی ئێران بەگشتی و شاری ئەسفەهانی پایتەخت بەتایبەتی دروست کرد، کە تا ئێستاش شوێنەواریان لەو وڵاتەدا ماوە و بەناوی شێخ عەلی خانی زەنگەنە ناسراون. (گلزاری، چ١، ١٣٥٧ش، ص٥٤ – ٥٦، ٧٥١).

بەمەش دەبینین شێخ عەلی خان لەو ماوەیەی کەوا سەرۆک وەزیرانی ئێران بووە، جگە لە بواری کارگێڕی و سیاسی و سەربازیدا، بەڵکو لە بوارەکانی ئاوەدانی و ڕۆشنبیری ڕۆڵی کارای گێڕاوە لە ئێران، یەکێک بوو لە بەهێزترین کەسایەتییەکانی سەردەمی خۆی لەدوای شای سەفەوی، تا ئەوکاتەی کۆچی دوایی دەکات لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا لە پۆستەکەی بەردەوام بوو، هیچ ڕکابەرێک و نەیارێکی نەیانتوانی کاری لەسەر بکەن و لە پۆستەکەی دووری بخەنەوە، تا ئەوەی لە ساڵی ١٦٨٩ لە تەمەنی ٨٠ ساڵی کۆچی دوایی دەکات. (خاتون ابادی، ١٣٥٢ش، ص٥٣٠).

بەم شێوەیە ماوەی سەرۆک وەزیرانی یەکێک لە گەورە پیاوەکانی هۆزی زەنگەنەی کوردی لە مێژووی ئێران دوای ٢٠ ساڵ کارکردنی لە لووتکەی دەسەڵاتی ئەو وڵاتە کۆتایی پێدێت، بۆیە زۆرێک لە سەرچاوەکانی لەبارەی مێژووی ئێران نووسیویانە، پێیان وایە کار و خزمەتەکانی شێخ عەلی خانی زەنگەنەی کوردی کە بە دەوڵەتی ئێرانی کردووە لەماوەی وەزارەتەکەیدا هیچی کەمتر نەبووە لەو خزمەتانەی کە ئەمیر کەبیری فەراهانی[11] بە ئێرانی کردووە، بگرە زۆر زیاتریش بووە.

**ئەنجام**

١- گەیشتنی سەرانی کورد بەگشتی و هۆزی زەنگەنە بەتایبەتی بە دەربـاری سـەفەوی و وەرگرتنـی پـلەی سیاسـی و سـەربازی و کـارگێڕیی بەرز لەو وڵاتەدا، گرنگیـی پـێگە و توانـای هۆزەکـانی کـورد بەگشـتی لە وڵاتـی ئێـران دەردەخـان، کەوا چـۆن کـورد بەدرێژایـی مێـژووی خـۆی کـاریگەری لەسـەر ڕەوتـی ڕووداوە مێژووییەکـان هەبووە و هەمیشە بەچاوێکی گرنگ سەیری پێگەی هۆزە کوردییەکان لە هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی کراوە.

٢- وەرگرتنـی پۆسـتی بـاڵا لە دەوڵەتـی سـەفەوی لەلایەن هـۆزی زەنـگەنەی کـوردی، بەتـایبەتی پۆسـتی ئەمیـر ئـاخور باشـی لەلایەن گەورەکانی ئەو هۆزەیەوە بەشێوەیەکی پشتاوپشت بەر لەوەی پۆستی سەرۆک وەزیرانی ئێران بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ لەلایەن شێخ عەلی خانی زەنگەنەی کوردی وەربگیرێت، بێگومان ئەمەش گرنگیی پێگە و توانا و نزیکـی ئەو هـۆزە کـوردییە دەردەخـات لە بنەمـاڵە و دەربـاری سەفەوییەکانەوە.

٣- بەرقەراربـوونی ئاسـایش لە نـاوچە جیاوازەکـانی دەوڵەتـی سـەفەوی بەدرێژایـی مـاوەی سـەرۆک وەزیرانـی شـێخ عەلـی خـان، سەرکوتکردنی هێرش و پەلامارەکانی هۆزەکانی ئۆزبەک لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتـی ئێـران، کـاردانەوەی هەبـوو لەسـەر بـووژانەوەی ئەو وڵاتە لەڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە.

٤- ڕێکخسـتنەوەی بـاج و سـەرانەکان و زیـادکردنی لەسـەر کاربەدەسـت و دەسـەڵاتدارەکان و سـووککردنی بـاری سـەر شـانی هاوڵاتیان، لەڕێگای کەمکردنەوەی باج و سەرانەی ساڵانەی سەریان.

٥- کەمکـردنەوەی کـاری بەرتیـل خـۆری لەنـاو دام و دەزگاکـانی دەوڵەت و چاودێریکردنی کاربەدەستەکان و ڕێگری کردن لەفرۆشتنی پـلەو پایەکـان و کـارکردن لەسـەر دانـانی کەسـانی شـیاو و بەتوانـا و

جێگای متمانە لە پێگە و پۆستە سیاسی و سەربازی و کارگێڕییەکانی حکومەتی ناوەندی و هەرێمە جیاوازەکانی ئێراندا.

٦- دابینکردنی دادوەری و یەکسانی لەنێوان هاوڵاتیانی ئێران بەبێ لەبەرچاوگرتنی جیاوازیی ئاینی و ڕەگەزی و نەتەوەیی بەشێوەیەکی یەکسان.

**پەراوێزەکان:**

(١) لەم بارەیەوە مەردۆخی کوردستانی پێی وایە کەوا زەنگەنەکان بەشێکن لە عەشیرەتی "لوڕ". هاوکات مێژوونووسی گەورەی کورد شەرەفخانی بەدلیسی هۆزە کوردەکانی لەڕووی زمانەوە دابەشی سەر چوار دەستەی وەکو (لوڕ و کەلهوڕ و کرمانج و گۆران) کردووە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە هەریەک لە: (بدلیسی، ١٣٦٤ش، ص٤، ٤٢٣؛ مردوخی، ١٣٧٩ش، ص ١٠٦).

(٢) بۆ زانیاری لەبارەی تیرەکانی سەر بەهۆزی زەنگەنە و شوێنی بڵاوبوونەوەیان لە هەردوو بەشی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان بڕوانە هەریەک لە: (سلطاني،ج٢، ١٣٧٢ش، ص٤٦٨)، (عباس العزاوي المحامي، موسوعة عشائر العراق، المجلد الرابع، دار العربية للموسوعات، بيروت – لبنان، ٢٠٠٥، ص ص ٢٠١ – ٢٠٢).

(٣) مەبەست لێی وڵاتی ئێرانە، کە بەو ناوە ناسرابوو، سنووری دەوڵەتەکەش لەوەی ئێستا هەیە زۆر بەرفراوانتر بوو، لە هەمان کاتدا وڵاتی فارسیشی پێوتراوە تا ساڵی ١٩٣٥ ناوی ئەو وڵاتە گۆڕدرا بۆ ئێران. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (دونالد ولبر، ايران ماضيها وحاضرها، ترجمة: عبدالمنعم محمد حسنين، القاهرة، ١٩٥٨، ص١).

(٤) قزلباش: دەستەواژەیەکی تورکییە بەمانای کڵاو سوور دێت، ئەو زاراوەیەش بە حەوت هۆزی تورکمانی دەگوترا کە بریتی بوون لە: (تەکەلو، شاملو، قاجار، ئەفشار، ئوستاجلو، زولقەدر، ڕۆملو)، کە موریدی تەکیەی سەفەوییەکان بوون و ڕۆڵی سەرەکییان بینی لە دامەزراندنی دەوڵەتی لە ساڵی ١٥٠١دا و پشتیوانی کردنی شا ئیسماعیلی یەکەمی سەفەوی (١٥٠١ – ١٥٢٤) بۆ بوونی بە شای ئێران. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە (خنجی، بی تا، ٦٤ – ٦٦؛ پناهی سمنانی، ١٣٧١ش، ص٩٩ – ١١٢).

(٥) ئۆزبەکەکان هۆزێکی بە ڕەگەز تورک بوون زێدی ڕەسەنیان ناوچەکانی پشت دوو ڕووبارەکان و تورکستان بوو لە ئاسیای ناوەڕاست، ئەو هۆزانە دوای گەیشتنی ئاینی ئیسلام بەناوچەکانیان، بوونە موسڵمانی سوننی مەزهەب، بۆیە لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی کێشە و شەڕی بەردەوامیان لەگەڵ ئەو دەوڵەتەدا هەبوو. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە. (بوریبوی احمدوف و زاهدالله منوروف، العرب والاسلام في اوزبكستان، الطبعة الثانية، بيروت – لبنان، ١٩٩٩، ص٨ – ١١، ٣٠٧ – ٣١٦).

(٦) یوزباشی پلەیەکی سەربازییە و بەزمانی تورکی بەمانای فەرماندەی هێزێکی سەد کەسی دێت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (مینورسکی، تذكره الملوك يا سازمان حكومت صفوى، به كوشش: سيد محمد دبير سياقى، ترجمه: مسعود رجب نيا، چاپ سوم، انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٧٨ش، ص١٨ – ١٩؛ يلماز اوزتونا، تاريخ الدولة العثمانية، ت: عدنان محمود سلمان، المجلد الثاني، شركة هلال المساهمة، استانبول – تركيا، ١٩٩٠، ص ٣٥ – ٣٧٩).

(٧) ئەمیر ئاخورباشی وشەیەکی لە بنەڕەتدا فارسییە و بەمانای بەرپرسی ئاخوڕ و ئەسپەکانی شای دێت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە هەریەک لە: (مینورسکی ، ١٣٧٨ش، ص١٤؛ صلاح احمد الهريدى، الصعيد في العصر العثماني، ٩٢٣-١٢١٣ هـ/١٥١٧-١٧٩٨، الناشر: العين للدراسات والبحوث الانسانية، مصر، ٢٠٠٦، ص٦٥).

(٨) مێژووی کوێرکردنی چاوی برا و برازا و کەسە نزیکەکانی بنەماڵەی شایەکانی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ دوای هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ ئەو وڵاتە بەگشتی و سەردەمی سەفەوییەکان بەتایبەتی، بەجۆرێک شا هەڵدەستا بە دەرهێنانی چاوی سەرجەم برایەکانی بۆ ئەوەی مەترسی هەڵگەڕانەوەی ناوخۆیی لەسەر دەسەڵاتیاندا نەمێنێت. چونکە یەکێک لە مەرجەکانی بوون بە شا پێویست بوو هیچ کەم و کوڕیەکی جەستەیی نەبێت. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (والتر هينتس، شاه اسماعيل دوم صفوى، ترجمه كيكاووس جهاندارى، تهران، علمى و فرهنگى، ١٣٧١ش، ص١٤٥؛ محمد باقر كرمى، مقدمەای به نقام كيفرى ايران باستان به انچام، قانون نامه حمورابى و بخشهايى از ماتيكان هزار داتستان (قانون مدنى دوره ساسانيان)، تهران، چاپ سوم، ١٣٨٠ش، ص٥٥، ١٠١).

(٩) هۆکاری بڵاو بوونەوەی ئەم چیرۆکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شا سلێمان شەوانە کە سەرقاڵی ڕابواردن و کات بەسەربردن بوو، دوای ئەوەی مەست دەبوو پارەیەکی زۆری دەبەخشییەوە بەسەر گۆرانی بێژ و شاعیران و ئەوانەی

لەدەربار بوون لەوكاتدا، بۆیە كاتێك بەیانی دەچوونە لای شێخ عەلی خان بۆ ئەوەی پاداشتەكەیان وەربگرن كە شا لە شەوەكەیدا پێیانی بەخشیبوو، شێخی ناوبراو بەبیانووی بەتاڵی خەزێنەی وڵات و نەبوونی پارە پاداشتەكەی پێیان نەدەدا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:- (كمپفر، ١٣٦٣ش، ص٨٣ – ٨٤).

(١٠) پەیماننامەی زەهاو یان قەسری شیرینیشی پێدەڵێن، لە ساڵی ١٦٣٩ لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویدا بەسترا دوای ئەوەی سەفەوییەكان شاری بەغدایان لەدەست دا لە ساڵی ١٦٣٨، بۆیە لەساڵی ١٦٣٩ ئەو ڕێكەوتنامەیان بەست كە بەڕێكەوتنامەی دیاریكردنی سنووری نێوان هەردوولاش ناسراوە، هەر بەگوێرەی ئەو ڕێكەوتنامەیە كۆتایی بەشەڕەكانی نێوان ئەو دوو وڵاتە هات بۆ ماوەی ٨٠ ساڵ. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:- (حسن مجيد الدجيلي، ايران والعراق خلال خمسه قرون، بيروت – لبنان، ١٩٩٩، ص ٦٨ – ٧٦).

(١١) ناوی میرزا محەمەد تەقی خان ناسراو بە ئەمیر كەبیری فەراهانی لەماوەی نێوان ساڵانی (١٨٤٨ – ١٨٥١) سەرۆك وەزیرانی ئێران بووە، سەرەڕای كورتی ماوەی وەزارەتەكەی بەڵام خزمەتی زۆری پێشكەش بەو وڵاتە كردووە، كەسێك بووە لە بەشداری لە ڕێكەوتنامە و دانوستانەكانی نێوان ئێران و عوسمانی و ئێران و ڕووسیا كردووە، مێژوونووسان پێیان وایە ئەگەر ئەو نەبووایە ئێران ناوچەیەكی فراوانی لەدەست دەدا بۆ ئەو وڵاتانە لەكاتی ڕێكەوتنامەكانی نێوانیان لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (رفسنجانی، امير كبير يا قهرمان مبارز با استعمار، دفتر انتشارات اسلامی، قم، ١٣٦٤ش، ص١١ – ٢٤).

**سەرچاوەكان:**

**فارسی:**


- اصفهانی، محمد معصوم بن خواجگی خلاصه السير، انتشارات علمی، تهران، ١٣٦٨ش.
- باستانی پاريزی محمد ابراهيم ، سياست واقتصاد عصر صفوی، چاپ سوم، انتشارات صفی عليشاه، تهران، ١٣٦٢ش.
- بدليسی امير شرف خان، شرفنامه، (تصحيح) محمد عباسی، مؤسسه مطبوعاتی علمی، ١٣٦٤،
- پناهی سمناني محمد احمد ، شاه اسماعيل صفوي مرشد سرخ كلاهان، انتشارات كتاب نمونة، تهران، ١٣٧١ش.

- توحدی کلیم الله ، حرکت تاریخی کرد به خراسان، ج۲، چاپخانه دانشکده مشهد، ۱۳٦٤.
- حسینی استرابادی سید حسن بن مرتضی ، از شیخ صفی تا شاه صفی، تصحیح: احسان اشراقی، جلد اول، بی تا، بی جا.
- خنجي امير حسين، قزلباشان در ايران، نشر الكترونيك، وبگاه ايران تاريخ، بي جا، بي تا.
- سلطانی محمد علی ، ایلاتطوایف کرمانشاهان، جلد دوم، ناشر مؤلف، تهران، ۱۳۷۲ هـ.ش.
- عبدالحسین خاتون آبادی، وقایع السنین والاعوام، تصحیح: محمد باقر بهبودی، نشر اسلامی، تهران، ۱۳۵۲هـ.ش.
- فسایی میرزا حسن ، فارسنامه ناصری، انتشارات سید مرتضی، تهران، ۱۳۱۳ش.
- قدیانی عباس ، پارسوا فرهنگ چهرههای تاریخی ایران، جلد دوم، نشر ارون، تهران، ۱۳۹۲هـ.ش.
- کرمی محمدباقر ، مقدمهای به نظام کیفری ایران باستان به انچام، قانون نامه حمورابی و بخشهایی از ماتیکان هزار داتستان (قانون مدنی دوره ساسانیان)، تهران، خط سوم، ۱۳۸۰ش.
- گلزاری مسعود ، کرمانشاهان وکردستان، جلد اول، انتشارات انجمن آثار ملی، شماره ۱٤۷، تهران، ۱۳۵۷ش.
- مشیزی میرزا محمد سعید ، تذکره صفویه کرمان، تصحیح: باستان پاریزی، انتشارات مطالعات و تحقیقات فرهنگی، تهران، ۱۳٦۷ ش.
- منجم یزدی ملا جلال، تاریخ عباسی، بەکوشش: سیف الله وحیدنیا، انتشارات وحید، تهران، ۱۳٦٦ش.
- مهدوی عبدالرضا هوشنگ، تاریخ روابط خارجی ایران، انتشارات امیر کبیر، تهران، ۲۵۳٦ شاهنشاهی.
- نصرآبادی محمد طاهر ،تذکره نصرآبادی، به اهتمام: وحید دستگردی، انتشارات فروغی، تهران، ۱۳٦۱ش.
- نطنزی معین الدین، منتخب التواریخ معینی، تصحیح: اوژن اوبن، انتشارات خیام، تهران، ۱۳۳٦ش.

- هاشمی رفسنجانی علي اكبر، امير كبير يا قهرمان مبارز با استعمار، دفتر انتشارات اسلامی، قم، ١٣٦٤ش
- وحيد قزوينى محمد طاهر ، عباسنامه، تصحيح: ابراهيم دهگان، كتابفروشى اراک، اراک، ١٣٦٩هـ.ش.

**عەرەبی:**

- احمدوف بوريبوى و منوروف زاهدالله ، العرب والاسلام في اوزبكستان، الطبعة الثانية، بيروت – لبنان، ١٩٩٩.
- اوزتونا يلماز ، تاريخ الدولة العثمانية، ت: عدنان محمود سلمان، المجلد الثاني، شركة هلال المساهمة، استانبول – تركيا، ١٩٩٠.
- الدجيلي حسن مجيد ، ايران والعراق خلال خمسه قرون، بيروت – لبنان، ١٩٩٩.
- شاكر محمود ، تاريخ المعاصر ايران وافغانستان، المكتب الاسلامى، بيروت، لبنان، ١٩٩٥.
- المحامي عباس العزاوي، موسوعة عشائر العراق، المجلد الرابع، دار العربية للموسوعات، بيروت – لبنان، ٢٠٠٥
- الهريدى صلاح احمد ، الصعيد في العصر العثماني، ٩٢٣-١٢١٣ هـ/١٥١٧-١٧٩٨، الناشر: العين للدراسات والبحوث الانسانية، مصر، ٢٠٠٦.
- ولبر دونالد ، ايران ماضيها وحاضرها، ترجمة: عبدالمنعم محمد حسنين، القاهرة، ١٩٥٨.

**ئینگلیزی**

-Newman Andrew J. Safavid Iran Rebirth of a Persian Empire, Martins Press, New York, 2006.
-Foran John, The Long Fall of the Safavid Dynasty: Moving beyond the Standard Views. Published by: Cambridge University Press. 1994.
-Mathee Rudee, Administrative stability and change in late 17th Century Iran: Int. J. Middle east studies, 1994.

- **سێیەم: کتێب و توێژینەوە وەرگێڕدراوەکان بۆ فارسی:**
- برن رهر ، نظام ايالات در دوره صفويه، كيكاوس جهاندارى (ترجمه) بنگاه ترجمه و نشر كتاب، تهران، ١٣٧٥هـ.ش.

- سانسون مارتین ، سفرنامه سانسون، ترجمه: تقی تفظلی، انتشارات ابن سینا، تهران، ١٣٤٦ش.
- شاردن ژان ، سیاحتنامه، ترجمه: محمد عباسی، انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٤٥هـ.ش.
- کردستانی شیخ محمد مردوخ ، تاریخ مردوخ، نشر کار رنگ، تهران، ١٣٧٩هـ.ش.
- کمپفر انگلبرت، سفرنامه کمپفر، ترجمه: کیکاوس جهانداری، انتشارات خوارزمی، تهران، ١٣٦٣ش.
- ملکم سر جان ، تاریخ کامل ایران، ترجمه: میرزا اسماعیل حیرت، انتشارات افسون، تهران، ١٣٨٠ش.
- مینورسکی، تذکره الملوک یا سازمان حکومت صفوی، به کوشش: سید محمد دبیر سیاقی، ترجمه: مسعود رجب نیا، چاپ سوم، انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٧٨ش.
- هینتس والتر، شاه اسماعیل دوم صفوی، ترجمه کیکاووس جهانداری، تهران، علمی و فرهنگی، ١٣٧١ش.

## ملخص البحث

**الشيخ علي خان زنكنة ودوره في تطوير ايران (١٦٦٩— ١٦٨٩)**

**المدرس المساعد. دلزار صالح صادق د. موسى محمد خضر**

قسم التاريخ – كلية الآداب – جامعة صلاح الدين – اربيل

اتصف الشيخ علي خان زنكنة بشخصية قوية وقيادية مكنته وجعلت منه الوزير الذي ترك اثرا كبيرا في داخل البلاد، فضلا عن ذلك كان ذو دراية فاقت الوزراء الذين سبقوه في تصريف امور الدولة، وقد اثمرت الجهود التي بذلها محاولة منه للنهوض بواقع البلاد وانقاذ ما يمكن من انقاذه فشملت اصلاحاته الميادين المختلفة، فقد اهتم بالجيش واعتمد على العناصر المحلية، اما في المجال الاقتصادي فأبدى اهتماما واسعا بهذا القطاع في فروعه جميعا. وعمل على اصدار العديد من العملات المحلية فقد تدهورت في عهده العملة وانتابها الغش والتزوير فعمل جاهدا على محاولة لاستقرار المالي، واولى الجانب الاداري اهتماما خاصا، لاسيما بعد التخلص من الموظفين المفسدين، كما اثبت نجاحه في بسط الامن عندما دخلت البلاد في موجة من التمردات الداخلية، ولهذا يعد الشيخ علي خان زنكنة من طراز الوزراء المهمين في تاريخ الدولة الصفوية، فلم يكن اختياره وزيرا اعظم صدفة محضة من الشاه سليمان.

## Abstract

### Sheikh Ali Khan Zangana and his role in the development of Iran (1669 - 1689)

Assistant Lecturer **Delzar Salih Sadiq**/ Dr. Musa Mohammad
Dept. of History/ College of Arts/ Salahaddin University-Erbil

Shakh Ali Khan Zangna was a minister of a big state in terms of its wide lands and its multiple tribes. At the beginning of his occupation, the general conditions were not stable, but his unusual ability enabled him to override the difficulties and manage the affairs of the state. His success was a result of his strong personality on the one hand and his capacities to run any tasks.

Many administrative, economic and military reforms were the landmarks of his period. For instance, he gave special attention, by increasing the number of its individuals and its weapons, to army as the backbone of the state. In addition, he developed industry, agriculture and trade. All these reforms improved the outcome of state treasury. Moreover, the administration received a considerable care by fighting corruption in the different sectors of the state. Hence, Ali's personality came to adopt inferior and interior policies that have a positive tendency to protect the state fromearlier collapse.

# مێژووی دەرەبەگایەتی
# لە باشووری کوردستان

**(توێژینەوەیەکە لەبارەی سەرهەڵدان و گەشەکردن و پووکانەوەی)**

**م.ی. نەشمیل سابیر عەبدوڵڵا**
بەشی مێژوو/ کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر

دەرەبەگایەتی یەکێکە لەو ڕژێمە ئابوورییانەی کە ماوەیەکی زۆر لە کوردستاندا باڵا دەست بووە، کە خاوەنی چەند بنەمایەکی تایبەتە بە خۆی و کاریگەری لە سەر ژیانی ئابووری باشووری کوردستان تا ماوەیەکی زۆر ماوەتەوە. لەم توێژینەوەدا هەوڵدراوە چەمکی ئەم ڕژێمە ئابوورییە و چۆنیەتی سەرهەڵدان و گەشە کردنی و بنەماکانی بخرێتە ڕوو، هەروەها ئەو قۆناغانەی کە پێیدا تێپەڕیوە و کاریگەری هەر قۆناغێک لە سەر ژیانی ئابووریی باشووری کوردستان، خستنەڕووی جیاوازی نێوان دەرەبەگایەتیی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و لە کۆتایی توێژینەوەکەدا فاکتەرە سەرەکییەکانی پووکانەوەی ئەم ڕژێمە ئابوورییە لە باشووری کوردستان خراوەتە ڕوو، بە دەرئەنجامەکان کۆتایی دێت.

- کلیلە وشەکان: دەرەبەگایەتی، زەوی، ئابووری، جووتیار، موڵکانە.

**پێشەکی**

دەرەبەگایەتی یەکێکە لە رژێمە ئابوورییەکان کە ماوەیەکی زۆر لە کوردستاندا باڵا دەست بووە و کاریگەری لە سەر بەرەوپێش بردنی ئابووری بە گشتی و ژیانی ئابووری هەموو تاکێکی کورد بە تایبەتیش جووتیاران هەبووە و سروشتی پەیوەندییەکانیش لێکەوتەی

جۆراوجۆری هەبووە و لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتیش شوێن و کاریگەری داناوە.

هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ توێژینەوەیەکی لەم جۆرە لەوەدایە کە رژێمی دەرەبەگایەتی کاریگەرییەکی زۆری لە سەر ژیانی تاکی کورد بە گشتی و جووتیاران کردووە و لە ژێر سایەی ئەم رژێمە چەوسانەوەیەکی زۆر بەرامبەر خەڵکی باشووری کوردستان لە لایەن دەرەبەگەکان کراوە، کاریگەری پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان تا ئەمڕۆش پاشماوەکانی لە ناوچەکانی کوردستاندا بەدی ئەکرێت، توێژینەوە دەربارەی ئەو رژێمە ئابوورییە سەرەڕای چەند گرفت و کۆسپ بە تایبەتی لە گەیشتن بە راستیی رووداوەکان و کاریگەریەکانی رژێمی دەرەبەگایەتی بەپێی بەڵگەنامە و سەرچاوەی رەسەن پێویستییەکی مێژووییە.

توێژینەوەکە لە پێشەکییەک و پێنج تەوەر پێک هاتووە، تەوەری یەکەم تایبەت کراوە بە چەمک و سەرهەڵدان و گەشەکردنی دەرەبەگایەتی لە کوردستان. تەوەری دووەم بنەما و تایبەتمەندییەکانی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا خراونەتەڕوو، تەوەری سێیەم قۆناغەکانی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا و تەوەری چوارەم: جۆرەکانی موڵکانە و پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا دەخاتە روو، تەوەری پێنجەمیش تایبەتە بە پاشەکشەکردنی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا.

لە کۆتاییدا ئەگەرچی گەیشتن بە هەموو ڕاستییەکان ئاسان نییە و ناشێ هیچ توێژینەوەیەک بێ کەمایەسی بێ بەڵام هیوادارم لە میانەی ئەوەندەی کراوە توانرابێت تاڕادەیەک چەمک و تایبەتمەندییەکان و سەرهەڵدان و پەیوەندییەکانی ئەو رژێمە ئابوورییە و کاریگەرییەکانی لە نێو هەردوو چینی جووتیار و دەرەبەگ لە کوردستاندا و چۆنیەتی پووکانەوەی خرابێتەڕوو. و لە ئاستی لانی کەمی گەیشتن بەو مەبەسەدا بێت کە بۆی تەرخان کراوە و بشبێتە سەرەتایەکی تر و رێگا خۆشکەر بێت بۆ لێکۆڵینەوەی وردتر و فراوانتر لە داهاتوودا.

## تەوەری یەکەم
## چەمک و سەرهەڵدان و گەشەکردنی دەرەبەگایەتی لە کوردستان

**ـ چەمکی دەرەبەگایەتی:**

دەرەبەگـایەتی زاراوەیەکـی بـڵاوە و لە رووی واتـاییەوە چەنـد مەبەسـتێک لە خـۆی دەگرێـت، یەکێـک لەو مەبەسـتانەش بـریتییە لە وەسـفکردنی رژێمـی وەرگرتنـی زەوی و سـوود لێـوەرگرتنیەتی لە بەرامـبەر ئەنجامـدانی خزمەتـی سـەربازی (عزیـز، ١٩٨٥، ل٨٤) بـۆ نمـوونە وەک ئەوەی لە کاتی هێرشی موسڵمانەکان بۆ سەر ناوچە جیاجیاکان و پرۆسـەی بە ئیسـلامکردندا روویانـداوە (قاسملو، ١٩٧٣، ل١١٧)، هەروەهـا لە کـاتی هێرشـی هـۆزە جەرمانییەکـان بـۆ سـەر ئیمپراتـۆریەتی رۆمـانی و دەسـت بەسـەر داگرتنـی زەوییەکـان دواتـر دابەشـکردنی وەک خەڵات لە بـری مـووچە لە سـەر سـەرکردە سـوپاییەکاندا (کـیە،١٩٧٠، ص٣٩١). گومانیشی تێدا نییە کە لەسـەردەمی ئیسـلامیدا گەلێک جار ئەم کارەی دابەشکردنی زەوی کێشـە و لێکەوتەی نەرێنی لـێ بە ئەنجام هـاتووە و، بۆ نموونە لەوکاتەی (عـومەری کـوڕی خەتـاب) داوا لە (سـەعدی کـوڕی ئەبـی وەقـاص) دەکـات کە زەویـیە دەسـت بەسـەرداگیراوەکان دابەش نەکـات (الجـواهري، ١٩٨٥، ص١٤٠) بەڵـگە و بەرەنجـامی یەک لەو کێشـانە بووبێ کە بە هۆی زەوی دابەشکردنەوە سەری هەڵداوە کە دەتوانین بۆ سەلماندنی ئەو راستییەی سەرەوەش بە دروست دابندرێت.

هەمان زاراوە لە هەندێ کاتدا بۆ وەسفکردنی ڕژێمی رەنێوهێنانی زەوی لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی کۆیلە یان کارپێکردنی زۆرەملێی خەڵـک بـۆ بەرژەوەنـدیی خـاوەن زەوی بەکـار دەهێنـدرێت (عزیـز، ١٩٨٥، ل٨٤)، ئەم شێوە کارپێکردنەش تەنها تایبەت نەبوو بە پرۆسەی هەڵسانی جووتیار بە کێڵان و چاندن و کارکردن لە زەوی، بەڵکو هەموو ئەرک و کـارێکی دەگـرتەوە کە دەرەبەگەکە بڕیـاری لـێ دەدا و، جووتیـاریش بە ناچاری و زۆرەملێ دەبوو ئەنجامی بدات. (قاسملو، ١٩٧٣، ل ١٨٢ ـ ١٨٣)

لە لایەکی تر ناوبردنی دەرەبەگایەتی هەندێک بە کاری دێنن بۆ رژێمی خاوەنداریێتی زەوی و هەندێ بە رژێمێکی رامیاری دادەنێن کە خاوەن موڵکە گەورەکان دەستیان بەسەردا کێشاوە، تەنانەت هەندێک پێیان وایە کە بیری دەرەبەگایەتی هەر لە دروست بوونیەوە تەنها بیرێکی تیۆری بووە مەبەستیش لە وەسفکردنی گشتی دامەزراوەکان و دەسەڵات بووە، و بەچاوپۆشیش لە نەبوونی تەنیا وەسفێک بۆ مەرج سیفەتەکانی دەرەبەگایەتی لە جێبەجێکردنی بە شێوەیەکی پڕ بە پڕ بەسەر هەموو راستییەکانی مێژوودا، بەڵام دەکرێ بە دەستنیشان کردنی سیفەتە گشتی و سەرەکی و هاوبەشەکانی دەرەبەگ و دەرەبەگایەتی بە شێوەیەکی ورد بوترێت کە واتای دەرەبەگایەتی لە بارەی زەوی بریتییە لە دابەشکردنی زەوییە کشتوکاڵییەکان کە بریتییە لە سیستەمێکی ئابووریی جیاواز لەگەڵ هەر سیستەمێکی پێش خۆی کە لە خۆی دواکەوتووتر بێت و لەگەڵ هەر سیستەمێکی دوای خۆی کە لە خۆشی پێشکەوتووتر بێت (عزیز، ١٩٨٥، ل٨٤)، هەندێکی تریش پێیان وایە ئەم پەیوەندییە ئابوورییە بریتییە لە یەکەیەکی ئابووریی کۆمەڵایەتی و مەبەست لە بەرهەم هێنان تەنها پڕ بوونەوەی پێداویستییەکانە و زەوییەکانی بریتییە لە زەوییە چێنراوەکان و لەوەڕگا و دارستانەکان (دویدار، ١٩٩٨، ص ١٩).

**– سەرهەڵدان و پەرەسەندنی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا:**

دوا بەدوای ئەوەی پەیوەندییە کۆیلایەتییەکان لە زۆربەی وڵاتان بە تایبەتیش ئەوروپا توانای پێشکەوتنیان نەما، و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان کە لە سەر بنەڕەتی کاری کۆیلە دەوەستا، بوون بە بەربەست لەبەردەم هێزەکانی بەرهەمهێنان، بە جۆرێک پێویستی کرد کە کۆیلەکان جۆرێک لە سەربەستییان هەبێت (عزیز، ١٩٨٥، ل٨٦)، بەم جۆرە هێزێکی تری بەرهەمهێنان دەرکەوت کە بە هۆیەوە توانرا شێوازی بەرهەمهێنان بگۆڕن واتە توانرا شێوازی گوزەران بگۆڕدرێت

لە ئەنجامــدا شــێوازێکی تــازە لە پەیوەنــدییەکان ســەری هەڵــدا کە پێیدەوترێت دەرەبەگایەتی (ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل١٤).

ســەبارەت بە باشــووری کوردســتان بە بۆچــوونی نووســەرێک شێوەی کلاسیکی کۆیلایەتی نەبینیوە بەڵکو وەک زۆربەی وڵاتەکانی رۆژهەڵات شــێوەی دەوڵەتــی کــۆیلەداری هەبــووە، لەگەڵ موڵکــداری دەوڵەتی و موڵکداری تێکڕایی و کشتوکاڵیش بە ئاودێرییەوە بەند بووە کە پەیوەندیی زۆری بەو دوو چەشنە موڵکدارییەوە هەبووە و خەرج و دامەزرانــدنی رایەڵەی ئــاودێریش لە توانــای دەوڵەت یــان دەســتەو کۆمەڵێکی تایبەتدا بووە (قاسملو، ١٩٧٣،ل٤٢). کۆیلەداری نەبۆتە شێوەی زاڵی بەرهەمهێنان و، بە بڕوای زانا رووسەکانیش لە رۆژهەڵاتدا ـ کە کوردســتانیش بەشــێکیەتی ــ لەبەر یەک هەڵوەشــانەوەی سیســتەمی کۆمۆنەی سەرەتایی، کە زادەی گۆڕانی کتوپڕی هێزە بەرهەمهێنەکان بــوو، بــوو بە هــۆی ڕاســتەوخۆی ســەرهەڵدانی دەرەبەگــایەتی و، بە پێچەوانەی ئەوروپا بۆ کۆیلایەتی نەگوازراوەتەوە (ئەسەسەد، ١٩٩٨، ل٣٥). دەتوانین بڵێین سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی پێویستییەکی مێژوویی بووە، چــونکە هێزەکــانی بەرهەمهێنــان لە ئەنجــامی گەنــدەڵی و خراپــی مامەڵەکردنی خاوەندارێتی کۆیلەکان بەرامبەر بە کۆیلەکانیان گەیشتە ئاستێک کە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان بوون بە ڕێگرێک لە بەردەم هێزەکــانی بەرهەمهێنانــدا بــۆیە بە هەر شــێوەیەک بێــت دەبــوایە پەیوەندییەکی نوێ لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی سەرهەڵبدات.

رژێمی دەرەبەگایەتی دوای سەرهەڵدانی بە قۆناغی گەشەکردندا رۆیشــتووە و ئەم قۆنــاغەش لە شــوێنێک بــۆ شــوێنێکی تــر لە کاتــدا جیاوازییان هەیە، لە قۆناغی گەشەکردنی دەرەبەگایەتیدا جیابوونەوەی دووەم ڕوویدا لە نێوان پیشەی دەستکرد و کشتوکاڵ لەگەڵ دەرکەوتنی شــاری گەورە کە بــوونە مەڵبەنــدی بازرگــانی و پیشەســازییەکانی دەستکرد و ئەم قۆناغەش لە وڵاتانی ئاسیا (کوردستانیش وەک بەشێک لە کیشوەری ئاسیا) لە سەدەی دوازدە تا سەدەی پازدەی خایاندووە.

(زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٧٨). جیابوونەوەی نێوان پیشەگەری و کشتوکاڵ هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی کە جووتیار تەنها پشتی بە زەوی کشتوکاڵی نەبەستێت، بەم جۆرە پیشەگەریش گرنگیی خۆی بینیوە و پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوە، تەنانەت هەندێ لە خێزانە جووتیارەکان تایبەتمەندییان لە کاری پیشەگەریی دەست پەیدا کرد کە لە رێگای بازاڕەوە سوودیان لێ بینی، بەم جۆرە لەم قۆناغەدا پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتی باڵا دەست بوون (زوبرتسکی، ١٩٨١، ص١٠٤؛ دویدار، ١٩٩٨، ص٢٨).

رژێمی دەرەبەگایەتی هەڵگری چەند تایبەتمەندییەکە کە لەگەڵ قۆناغ و پەیوەندییەکانی تر جیای دەکاتەوە، کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی لە دوو چین پێکدێت، یەکەمیان، چینی دەرەبەگ و دووەمیان، چینی جووتیار. موڵکیەی تایبەت کە خاوەنەکەی دەرەبەگە و باڵا دەستبوونی ئابووریی سروشتی لە گوند و ئابووریی شمەک لە شاردا و جیابوونەوەی کەرتی پیشەسازی دەستکرد و کشتوکاڵ و بەدەستهێنانی سوود لە لایەن دەرەبەگەوە ئەمە سەرەڕای بوونی چەندین کاری بێگاری لە لایەن جووتیار بۆ دەرەبەگەکە لە تایبەتمەندییەکانی دەرەبەگایەتین. (کیە، ١٩٧٠، ص٢٩١؛ عزیز، ١٩٨٥،ل٨٥).

گەشەکردنی دەرەبەگایەتی لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا سەردەمێکی درێژی خایاندووە و دوای ئەوەی رژێمی دەرەبەگایەتی دووچاری تێک هەڵوەشانەوەی پلە بە پلەی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەبێتەوە و پەیوەندییە سەرمایەدارییەکان دەست دەکەن بە نەشونماکردن کە لە ئەوروپا دەگەڕێتەوە سەدەی پازدە تا سەدەی حەڤدەی زایینی خایاندووە، لە ئاسیا و ئەفریقیا لە ئەنجامی فراوانبوونی رژێمی ئیستعماری ئەوروپی لە ناوچەکاندا دەبێتە هۆی مانەوەی ئەم پەیوەندییە بۆ ماوەیەکی درێژ (زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٧٨)، بۆ نموونە لە سەر ئاستی وڵاتانی عەرەبی لە وڵاتی میسر تا ساڵی ١٩٥٢ کۆتایی دێت و لە عێراقدا لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ بە دەرچوونی یاسای چاککردنی کشتوکاڵی کۆتایی دێت (عزیز، ١٩٨٥، ل٨٦؛ سین. ز، ١٩٩٢، ص٥٧).

سەبارەت بە باشووری کوردستان، سەرکردەی هۆزەکان بەهەڵسانیان بەگۆڕینی ئەو زەوییانەی لەلایەن سەرکردەی دەوڵەتانی دەسەڵاتدار بەسەر ناوچەکەدا پێیان بەخشرابوو، بە موڵکایەتی تایبەت و پشتاوپشت و، بەو پێگە و هێزەش کە پێیان درابوو، بوون بەفەرمانرەوای هۆزەکانیان و، بەپێی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەش، کە بۆ مەبەستی ڕەنیوهێنانی ئەو زەوییانە لەگەڵ جووتیار و خزمەتکارەکان دروستیان کردبوو، بەرە بەرە گۆڕان بۆ دەرەبەگ. (عبدالرضا، ١٩٧٠، ص٢٣، بۆ زانینی سروشتی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دەرەبەگایەتیەش بڕوانە. الحسن و العطية، ١٩٨١، ص١٨٨ــ١٩١) ئەم کارەش بەشێوەیەکی کتوپڕ ڕووی نەداوە بەڵکو چەند فاکتەرێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕۆڵی تێدا بینیوە (رسول، ١٩٨٠، ل٤). پرۆسەی سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی و گەشەکردنی لە رۆژهەڵات و لە نێویشدا کوردستان، نزیکەی دە سەدەی خایاندووە کە بە بەراوردکردنی لەگەڵ سەرهەڵدانی پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان لە ئەورووپای رۆژئاوا کە ماوەیەکی یەکجار زۆری خایاندووە (شاملوف، ١٩٨٤، ص٩).

دوای سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی کۆمەڵگای کوردەواری دابەش بوو بۆ دوو چینی سەرەکی، یەکەمیان، چینی دەرەبەگ و دووەمیان، چینی جووتیار، چینی دەرەبەگ لە کۆمەڵی کوردەواریدا لە سێ جۆری سەرەکی پێکدێت :

١ـ میری دەرەبەگەکان : خاوەنی ژمارەیەکی هێزی چەکدارە و خۆیان بەجێنشینی خەلیفەکانی ئیسلام دەزانن بەم جۆرە دەبوونە خاوەن دەسەڵاتی ئاینیش جۆرەها باجیان لە جووتیارەکان وەردەگرت (شاملوف، ١٩٨٤، ل ٦٤)

٢ــ بەگ: ئەمەش سەرکردایەتی جۆرێک دەکات کە لە چەند تیرەیەک پێکدێت بەڵام هیچ جۆرە پلەیەکی ئاینی نییە تەنها باجی دەرەبەگایەتی لە جووتیاران وەردەگرێت و بە هەر ڕێگایەک بۆیان بکرێت جووتیار دەچەوسێننەوە (شاملوف، ١٩٨٤،ل٦٥).

٣ ـ ئاغا : سەرکردایەتی تیرەیەک ئەکات و هیچ پلە و پایەکی ئاینی نییە (شاملوف، ١٩٨٤، ل٦٥).

دەکرێت بوترێت سەرهەڵدانی دەرەبەگایەتی لە کوردستاندا بە پێویستییەکی مێژوویی دادەندرێت، چونکە ئەگەرچی پەیوەندییەکانی کۆیلایەتی تەواو جێگیر نەبووو بەلام گەندەڵی و چەوسانەوەی بەدیهاتوو لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی باو بوونە کۆسپ لەبەردەم هێزەکانی بەرهەمهێنان و پێویستی دەکرد شێوازێکی بەرهەمهێنانی نوێی پێشکەوتووتر لەوەی هەیە سەری هەڵبدات، ئەمەش دەرفەتی دایە دەرەبەگایەتی تا وەک سیستەمێکی ئابووری و کۆمەڵایەتیی باڵادەست لە سەرتاسەری کوردستان خۆی بسەپێنێ.

## تەوەری دووەم
## بنەما و تایبەتمەندییەکانی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا

**ـ بنەماکانی دەرەبەگایەتی:**

دەرەبەگایەتی وەک رژێمێکی باڵا دەست بەسەر کایە جۆراوجۆرەکاندا سەردەمێکی درێژ لە ئەورووپا و ئاسیا و ئەفریقیا و هەندێ شوێنی تر ئامادەیی هەبووە، بەپێی خاسیەتەکان لە هەر شوێنێک ڕەوایی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا سەپاندووە. ( عزیز، ١٩٨٥، ل ٨٤).

لەبەر ئەوەش کە هەموو رژێمێکی ئابووری بەپێی پێویستییەکی مێژوویی سەرهەڵدەدات، لەگەڵ پەیدابوونیدا ڕۆڵ دەگێرن و لە پشت دەرکەوتنی رژێمی دەرەبەگایەتیش چەندین هۆکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەن، و ئەوانەی ڕۆڵی گرنگی لە دەرکەوتنیدا بینیوە ئەمانەن :

١ ـ گوند : دیارترین و لە پێشترین مەڵبەندە و کێڵگەکانی موڵکی تایبەتن (برونەسن، ١٩٩٩، ل ٧٥). ئەم شوێنەیە کە جووتیار تێیدا دەژیت کە یەکێ لە پاشماوەکانی شوێنەواری سەردەمە کۆنەکانە کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕیوە و لە سەرەتادا دانیشتوانەکەی لەسەر

پارچەپەکی زەوی دیاریکراو لە سەر بنەمای هاوبەش و هاوکاری لە نێوان تاکەکاندا خەریکی کشتوکاڵ بووینە (کوپلاند، ١٩٨٥، ص٦). پێکهاتەی کۆمەڵایەتیش بەپێی هەلومەرج کەمینەیەک لە دانیشتوانی بوونەتە خاوەن زەوی و هۆیەکانی بەرهەمهێنان و بەشێکیش کەم دەست و بێ بەش و، بەڵام بەهرەمەند لە هێزی کارکردن - پێکهاتەی کۆمەڵایەتی گۆڕاوە بۆ دوو چین، یەکیان دەسەڵاتدار (دەرەبەگ) و ئەویتر رەعیەت، کە وەک جووتیار و هەندێک جاریش وەک کۆیلەی زەوی پرۆسەی رەنێوهێنانی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییان لە ئەستۆ گرتووە (مینورسکی، ١٩٨٤،ل٧٣).

٢ ـ دومین : لە وشەی لاتینی (Dominuis) وەرگیراوە و بە مانای گەورە خاوەندار (السید المالک) دێت و، لە ئەوروپا هەندێک ناو و نازناوی تری وەک گەورە (السید) بە تەنها و بارۆنیشی پێگوتراوە، هەروەها بە مانای هەموو موڵکەکانی دەرەبەگیش دێت، بەپێی بنەمای سیستەمی دومین دابەشکردنی زەوی بۆ دوو بەش دەبێت، خاوەن زەوی سوود لە یەکێکیان وەردەگرێت و بەشەکەی تریش لە هەمبەر خزمەت بە دەرەبەگەکان بەسەر جووتیاران دابەش دەکرێت. بە تێپەڕبوونی کاتیش دەسەڵاتی دەرەبەگەکان زیاد دەکات و دەبنە بەربەست و جووتیارانی دومین و حکومەت لە یەکتر دادەبڕێن (کوپلاند، ١٩٨٥، ل ١٠؛ عجمیە، ١٩٨٣، ص ١٧).

٣ ـ گەشەکردنی دەرەبەگایەتی: بریتییە لە گەشەکردنی قۆناغی سەرهەڵدان و باڵادەست بوون و تایبەتمەندییەکان و هەلومەرجی دەرکەوتن لە هەموو شوێندا (عجمیە، ١٩٨٣، ص١٥).

**ـ تایبەتمەندییەکانی دەرەبەگایەتی:**

دەرەبەگایەتی هەر چەندە لە هەموو ناوچەکاندا لە سەر چەندین بنەمای هاوبەش پێکهاتووە، بەڵام هەر ناوچەیەک لەگەڵ ناوچەیەکی تر لە تایبەتمەندییەکاندا جیاوازی هەیە، سەبارەت بە باشووری کوردستان ئەم رژێمە هەڵگری چەندین تایبەتمەندی بووە کە جیاواز بووە لەگەڵ

تایبەتمەندیی هەمان رژێم لە ناوچەکانی تردا (ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل١٦)، چونکە لە تایبەتمەندی دەرەبەگایەتی کوردی پەیوەست بەژیانی کۆچەریی خەڵکدا، هێندە پارێزگاری کردن لە مانەوەی پەیوەندییە خێڵەکییەکان شێوەیەکی ئاڵۆزی هەیە، کە هاوشێوەی لەنێو گەلانی ڕۆژهەڵاتدا بەدی ناکرێت (شاملوف، ١٩٨٤،ل ١٦٧)، ئەوەش لە چەوسانەوەی چینایەتیدا ڕۆڵی گێڕاوە چونکە دەرەبەگەکان توانیویانە هەست و نەریتی ژیانی کۆمەڵایەتی ناو خێڵەکانی بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکار بهێنن، بۆیە پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانیش سەبارەت بە نیشتەجێیەکان (دێنشین) و خێڵە کۆچەرەکان جیاوازییان هەبووە، لەبەر ئەوەش کە کۆمەڵگای کوردەواری لە عەشیرەت پێکدێت کە ئەمانیش لە ڕووی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانەوە دەبوونە دوو بەش، یەکەمیان، کۆچەر، دووەمیان، لادێ نیشین ( رسول، ١٩٨٠، ل٣). و لەژێر کاریگەریی ئەم سیستەمەدا جووتیار لەدەست خۆیدا نەبوو و نەیدەتوانی لە دێیەک بۆ دێیەکی تر بار بکات، بەڵکو نیشتەجێبوونی بە زەوییەکەیەوە دەبەسترایەوە (قاسملو، ١٩٧٣، ل ١٨٧). هەندێک لەهۆزەکان پارێزگارییان لە سیستەمی تیرەگەرێتی خۆیان کردبوو و هەر تیرەیەکیش گەورەیەکی هەبووە و ئەندامەکانی داخراو بوون و تێکەڵاوی خەڵکی تر نەدەبوون، ڕێگەشیان پێ نەدەدرا ببنە ئەندامی تیرەیەکی تر و، لەنێو ئەو ئەندامانەشدا هەموویان لە یەک ئاستی کۆمەڵایەتیدا نەبوون و، هەژارەکانیان حاڵیان وەک هی باقی جووتیاران بوو و، سەرقاڵی هەمان کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بوون، تایفەکانیش سەرکردەی خۆیان هەبوو و، نازناوەکانی وەک پیر و شێخ و ئاغا...هتد، کە هەڵیاندەگرت پشتاو پشت بۆ نەوەکانیان دەمایەوە و، هەموو ئەندامە پێکهێنەرەکانی تایفەکەش بە بەخشینی باج و سەرانە بەسەرۆکی تایفە پەیوەست بوون (شاملوف، ١٩٨٤، ل٦٨).

هەندێک جار لەناو کورددا پیاوانی ئاینیش بوونەتە گەورە دەرەبەگ و لەو ڕووەشەوە نموونەی زۆر هەیە و، گەلێکیان خاوەنی

ژمارەیەکی زۆر گوند بوون و دانیشتوانەکانیان تەواو گوێرایەڵییان کردوون، (شاملوف، ١٩٨٤، ل٦٨) و گوندنشینانیان لەژێر سایەی ئەم سیستەمە دەرەبەگایەتییەدا سەرەڕای دانی باج و زەکاتیش، کە بەناوی ئاینەوە وەردەگیرا بدەن، بەماڵی شێخ و هەڵسن بەخزمەتکردن لە شوێنەکانی تری وەک تەکیە و مزگەوت و پێدانی دیاریی ساڵانە و ئەنجامدانی قوربانی و بەخێوکردنی فەقێ و مجێوری مزگەوت (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٨٦).

سەرۆک خێڵەکان ژمارەیەک چەکداریان لە خۆیان کۆدەکردەوە کە ئەمەش لە ئەنجامی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیدا هەموو سەرۆک خێڵەکان ناچار بوون هێزی تایبەت پێکەوە بنێن بۆ ئەوەی بتوانن بەو هۆیە قازانجی تایبەتی خۆیان بەدەست بهێنن و ئەوەش کە هەیانبوو بیپارێزن، و ئەو هێزەش بریتی بوو لە ئامرازی دەست سەرۆک خێڵە دەرەبەگەکان بۆ سەپاندنی دیکتاتۆریەتی چینایەتی و، بەکارهێنانی لە سەرکوتکردنی جووتیاران، کاتێک بەشدارییان نەکردبا لە پرۆسەی بەرهەمهێنان بۆ بەرژەوەندیی ئەوان (ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل١٩).

فشار و ستەمی چینایەتی لە ناوچە کوردییەکان کە دەرەبەگایەتی تیادا باڵا دەستە بەتەواوی رەنگی داوەتەوە چونکە جووتیار بۆی نەبوو بە بێ رەزامەندی خاوەن موڵکەکەی کچی خۆی بەشوو بدات بە تایبەتی ئەگەر بیدات بەیەکێک کە خەڵکی دێیەکی تر بێت یان لە هۆزێکی تر بێت، بۆ خاوەن موڵک هەبوو کە رێگای جێبەجێکردنی ئەم کارە بگرێت، و داوای دراوێکی زۆری ئەکرد کە خاوەن کچەکە پێی نەدرێت و ناچار دەبوو کە کارەکەی ئەنجام نەدات (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٨٩؛ زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٩٤).

## تەوەری سێیەم

## قۆناغەکانی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا

رژێمـــی دەرەبەگـــایەتی لە باشـــووری کوردســـتاندا لە قۆنـــاغی سەرهەڵدان تا ماوەی باڵا دەستی و زاڵبوونی بە سەر هەموو ناوچەکان و دواتـــر پووکـــانەوەی بە ســـێ قۆناغـــدا تێپەڕیـــوە کە هەر قۆناغێـــک تایبەتمەندیی خۆی وەرگرتووە کە ئەمانەن :

١- قۆناغی سەرهەڵدان

ئەم قۆنـاغە لە کوردسـتان مـاوەیەکی زۆری خایانـدووە کە تیایـدا پەیوەنـــدییەکانی کـــۆیلایەتی بەرەو نەمـــان چـــوون و پەیوەنـــدییە دەرەبەگایەتیەکـان سـەریان هەڵـدا لە سـەدەی سـێیەمی زاینـی دەسـت پێـدەکات (قاسـملو، ١٩٧٣، ل١١٦)، شـێوازی دەرەبەگـایەتی سـەربازی لەم قۆناغەدا سەری هەڵدا بە تایبەتی لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانی کە هەر ســەرکردەیەکی سـوپایی لە پاداشـتی کارێکـدا کە بـۆ پادشـا ئەنجـامی ئەدا پـارچەیەکی زەوی پـێ دەبەخشـرا ئەم پەیوەنـدییە لەم سەردەمەدا لە هەموو شوێنێک بڵاو نەببۆوە بەڵام لە ناو ئیمپراتۆریەتی ساسـانی ئەم جـۆرە پەیوەنـدییە بەشـێوەیەکی روون و ئاشـکرا دیـار دەکەوت وەک لە (بەڵگەنـــامەی باجەکـــان ) دا هـــاتووە: "ســـەرکردە ســـوپاییەکانی ساســـانی خـــاوەنی زەوی و زارێکـــی زۆر بـــوونە لە ناوچەکانی کوردستانیش بە تایبەتی لە هەولێر" (الجواهري، ١٩٨٥، ص١٤١).

دوای هێرشـــی موســـڵمانەکانیش لە ســـەدەی حەوتەمـــدا بەرەو ناوچەکـانی کوردسـتان، کە دەتـوانین بە هێرشـی هـۆزە جەرمانییەکـانی بچـوێنین بـۆ سـەر ئیمپراتـۆریەتی رۆمـانی، کە هەردوو هێـرش بـوونە هـۆی لەنـاوچوونی دوو ئیمپراتۆریەت، سـەرەڕای چەسـپاندنی شـێوازی دەرەبەگـایەتی هەنـدێ بـاج و پیتـاکی تـر هـاتە گـۆڕێ لە سـەردەمی خەلیفەکـانی راشـدی وەردەگیـران، لەوانەش (خەراج و جزیە و عشـور) ئەمەش زیـاتر بـاری جووتیـارانی گرانتـر کـرد (الجواهري، ١٩٨٥، ص١٤٢). لە سەردەمی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی ئەمەویدا چەند گۆڕانکارییەک بەسـەر

چۆنیەتی باج وەرگرتن لە جووتیاراندا هات و هەندێ باجیان هێنا کایەوە کە لە سەردەمی ساسانییەکان فەرز ئەکرا، هەروەها لە سەردەمی عەباسییەکاندا لە سەدەی (٨-١٠) جووتیار موڵکانەی بە خەلیفە ئەدا کە لەم ماوەیەدا هەموو موڵکی پاشا و بنەماڵەی ساسانی و ئەو ئاغایانەی کە شەڕی موسڵمانەکانیان کردبوو ببوو بەموڵکی خەلیفە و زەوییەکانی پیاوانی ئاینی و ئاورگەکانی زەردەشتیش ببوون بە هی (بیت المال)ی ئیسلام. (قاسملو، ١٩٧٣،ل١١٩).

٢ ـ قۆناغی گەشەکردن:

پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان لە سەدەی (١٠ـ ١١)ی زایینیدا لە کوردستان ریشەی داکوتا و باڵا دەست بوون و گەشەی کرد (شمزینی، ١٩٩٨،ل٣٩)، لە سەردەمی ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی لە سەدەی شازدەمدا بە تایبەتی لە شەڕی چاڵدێران لەساڵی ١٥١٤ز دەوڵەتی عوسمانی هەوڵیدا کە دەرەبەگە کوردەکان بە لای خۆیدا رابکێشێت دژی دەوڵەتی سەفەوی لە رێگای چەند بەڵێنێکەوە کە بە سەرکردە کوردەکان درا (ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل٢٠) بۆ سوود وەرگرتن لە توانا سەربازییەکانیان و لەم پێناوەش دەستیان کرد بە بەخشینی چەندین پارچە زەوی بەسەر گەورە دەرەبەگ و میر و سەرکردە سوپاییەکان (شەمزینی، ١٩٩٨،ل٣٨).

سیستەمی کشتوکاڵی لە کۆمەڵگای عوسمانی نیشانەیەکی نەگۆڕی هەبوو، کە تیایدا سوڵتان خاوەنی دەسەڵاتی زەویوزاری میری بوو و، مافی ئەوەی هەبوو کە موڵکانەی زەوی بۆ خۆی بگێڕێتەوە بەڵام سوڵتان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی پێویستی بە پیاوانی سوپایی و ئاینی بوو، بۆیە چەندین زەوی بە سەریان دابەش کرد، گەشەکردنی پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتی لە کۆتایی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم لە کوردستاندا گەیشتە دوا قۆناغی گەشەکردن و باڵادەست بوون (ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل٢٠).

٣ ـ قۆناغی پاشەکشە و لەناوچوون:

پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان لە کوردستاندا بە ئەندازەیەکی فراوان پەرەیان سەند، بەڵام لە رووێکی ترەوە هەر ئەو گەشەکردنە تێکڕای سیستەمی دەربەگایەتی لە فەوتان و پووکانەوە نزیک کردەوە، چونکە رژێمی دەرەبەگایەتی لە رەوتی گەشەکردنیدا گەیشتە قۆناغێک کە ئیتر نەتوانێت زیاتر گەشە بکات و تەگەرەی خستە بەردەم رێگای گەشەکردنی کۆمەڵگا (ئەسەسەرد، ١٩٨٦،ل٢٥). ئەمە لەکاتێکدا کە کوردستان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم بووە شوێنی بەهێزبوونی هەژموونی سیاسی و ئابووری وڵاتە گەورەکانی بیانی و، پەیوەندیی کوردستان بە بازاڕی جیهانییەوە کاریگەری کردە سەر هەموو لایەنێکی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کوردستان. (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٢٧)، سەرمایەی بێگانە بە هەمەچەشنی لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە کوردستانیشدا پەیدا بوو و بەرهەمی لادێ (شمزینی، ١٩٩٨،ل٤٢) لە جۆری خوری و پیستە و ئاژەڵ و هێلکە رەوانەی دەرەوە دەکرا (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٢٨). هەروەها سەرمایەی بێگانە نەک تەنها بە شێوەی بازرگانی بەڵکو بەشێوەی تر گەیشتە کوردستان وەکو دامەزراندنی کۆمپانیا و کێڵگەی جیاواز لە لایەن وڵاتانی ئەوروپا بەم جۆرە کارگە و بانک و دام و دەزگای بێگانە لە کوردستان دامەزرا. (شەمزینی، ١٩٩٨،ل٤٣)

دەرئەنجامی گەشەی رژێمی دەرەبەگایەتی لە کارکەوتنی هێزەکانی بەرهەمهێنان لە سەدەکانی (١٩-٢٠) دا بووە هۆی سەرهەڵدانی چەندین راپەرینی جووتیاری دژی دەرەبەگەکان وەکو راپەرینی تالور لە ناوچەکانی باکوری کوردستان (شاملوف، ١٩٨٤،ل٧٢)، هەروەها گوندەکانی خوارووی کوردستانیش راپەرینی جووتیارانی بەخۆوە بینی لە ناوچەکانی مووسڵ و بارزان بە تایبەتی دوای بڕیاری فرۆشتنی زەوییەکان لە لایەن دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٣ـ ١٩١٤ بە بێگانە. (سین. ز، ١٩٩٢، ل ٥٦)، و ڕاپەڕینی جووتیاران لە دەشتی هەولێر. (قادر، ٢٠٠٥، ل٢٤٣).

## تەوەری چوارەم

## جۆرەکانی موڵکانە و پەیوەندییەکانی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا

### ـ جۆرەکانی موڵکانە لە رژێمی دەرەبەگایەتیدا:

جووتیار کارەکەی لە سیستەمی دەرەبەگایەتیدا تەنها بەدەستهێنانی بەرهەم دەگەیەنێت ئەم بەرهەمەش ناودەنرێ بە بەرهەمی پێویست، بەڵام جووتیار لە سایەی ئەم رژێمەدا لە پاڵ کارکردنی پێویست کاری زیادەش ئەنجام ئەدات کە پێیدەڵێن موڵکانە (عزیز، ١٩٨٥،ل٨٥)، بەشی زۆری خاوەن موڵکە گەورەکان کە زەوی بە موڵکانە دەدەن بە جووتیار هیچ پارەیەک لە زەوییەکانیان خەرج ناکەن بەڵکو سەرجەم ئەرکەکانی دەکەوێتە ئەستۆی جووتیارەکە زۆربەی زەوییەکان بەم جۆرە بەرهەم دەهێنرێت. بە شێوەیەکی گشتی لە رژێمی دەرەبەگایەتیدا موڵکانە سێ جۆری هەیە کە ئەمانەن:

١ ـ موڵکانەی کارکردن:

مەبەست لە موڵکانەی کارکردن ئەوەیە کە جووتیار پارچە زەوییەک وەردەگرێت لە خاوەنەکەی بەمەبەستی چاندن، لەبەرامبەر ئامادەیی کارکردنی سوغرە بۆ خاوەنەکەی (عزیز، ١٩٨٥،ل٨٥)، لە وەها رێکەوتنێکدا خاوەن زەوی دەتوانێت بۆماوەیەکی دیاریکراو و بێ پێدانی هیچ کرێیەک، کار بەجووتیارەکە بکات، (ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل١٦)، ماوە و ژمارەی رۆژەکان و کاتی ئەم کاری سوغرە و بێگارەش لەشوێنێک بۆ شوێنێکی تر جیاوازە و، (قاسملو، ١٩٧٣،ل١٨٠) بەپێی رێککەوتنی نێوان جووتیار و دەرەبەگەکە دیاری دەکرێت، (عزیز، ١٩٨٥،ل٨٥).

٢ ـ موڵکانەی بە شتومەک:

مەبەست لەم جۆرەش بەکرێگرتنی پارچە زەوییەکە لە خاوەنەکەی بە مەبەستی بەرهەمهێنان بەرامبەر بە بەشێک لە بەرهەم بۆ خاوەن زەوییەکە (عزیز، ١٩٨٥، ل٨٥) و ئەوەش چەند شێوازێکی وەک شەریکەبەشی و نیوەکاری و سێیەک بەری و سێ کوت و دەودووی هەیە، (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: قاسملو، ١٩٧٣،ل١٦٦ ـ ١٦٩).

٣ ـ موڵکانەی بەپارە:

مەبەسـت لەم جۆرەشـیان بەکرێگرتنـی پـارچە زەویـیەکە لە خاوەنەکەی بەرامبەر بە بڕێک پارە کە لە سەری رێک دەکەون (عزیز، ١٩٨٥،ل٨٥)، ئەم جـۆرە موڵکـانەیە دوای فرۆشـتنی بەرهەمەکە پـارە دەدرێت بە خاوەن موڵکەکە. دەکرێت ئەو پەیوەندییە بەم جۆرە پێناسە بکرێـت: " موڵکـانەی بەدراو ئەو پێوەنـدییە لە مێژینـانە کە لەنێـوان رەعیەت و خاوەن موڵکدا هەبوون و مافەکانیان دیاری دەکرد، دەگۆڕێ و دەبن بە پێوەندییەکی دراویی تەواو کە بەگوێرەی قانوون لە سەری رێـک دەکەون و ئەو دەم جووتیـار تەنیـا ئیمتیـازداری زەویـیەکەیە" (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٧٧).

سەرەڕای ئەم جۆرە موڵکانە، جووتیار هەر وەک کۆیلە دەبوایە پیتـاکی زیـاد بەشـتومەک یـان بە دراو بـدەن بە خـاوەن موڵـک وەکـو مەڕانە، هێلکانە، میوانانە، جەژنانە، ئەمە سەرەڕای چەندین بەخشیش لە لایەن جووتیارەکان بۆ پیاوانی ئاینی و پیاوانی دەوڵەت (هەمان سەرچاوە، ل١٨٤ ـ ١٨٧).

**ـ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە ڕژێمی دەرەبەگایەتی:**

بنچینەی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا خاوەنـداریێتی دەرەبەگەکـانە، سـەبارەت بە زەوی و دەسـت بەسـەرداگرتنی تەواویـان بەسـەر بەرهەمهێـنەرە جووتیارەکـان و چەوسـانەوەیان بە مەبەسـتی بەدەسـتهێنانی بەرهەمێکـی زیـادە بـۆ پڕکـردنەوەی پێداویسـتییەکانیان و جێبەجێکردنـی مەرامەکانیـان (عزیـز، ١٩٨٥، ل٧٨)، پڕکـردنەوەی ئەو پێداویسـتییانەش پێیـدەوترا قـازانجی دەرەبەگ کە جێگیر نەبوو جووتیار ناچار دەکرا کە زۆربەی کاتەکەی ئیش بکات بۆ دەرەبەگ و کارکردنەکەش پێیدەوترا (سوغرە) کە تەنها لە کارەکانی کشتوکاڵیدا چڕ نەبووبۆوە بەڵکو کاری خانوو دروستکردن و گواستنەوەی بەرهەم و هەموو کارێکی تایبەتی دەرەبەگی دەگرتەوە (زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٩٢) هەرچی کاری پیشەگەریش بوو ئەوە بە مەبەستی

پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی دەرەبەگ و جووتیارەکە ئەنجام دەدرا (دویدار، ١٩٩٨،ص٢١).

دەتوانین بڵێین سوغرە و موڵکانە سیمای سەرەکی بوون لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا دیارە بە شێوەیەکی زۆر کەم بەکار دەهات، بەڵام دوای ئەوەی کەرستەکانی بەرهەمهێنان لە ڕێگای دراو دەست ئەکەوت باری جووتیار سەختتر بوو و باجی زیاتری وەک باجەکانی دادگایی و کارگێڕی خرایە سەر. (دویدار، ١٩٩٨، ص٢٠؛ زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٩٣). ئابووری لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا ئابوورییەکی سروشتی بوو، کە کشتوکاڵ وەک چالاکییەکی سەرەکی لەم ئابوورییەدا شوێنی گرتووە، هەرچی ئاڵوگۆڕی بازرگانیشە بەشێوەیەکی داخراو و بەرتەسک و بەشێوەیەکی هێندە کەم ئەنجام دراوە، کە دەچێتە چوارچێوەی نەبوونەوە (عزیز، ١٩٨٥، ل٨٨؛ زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٩٢).

ڕەنگدانەوەی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیش کاریگەری هەبووە جووتیار لە کاتێک کە هەڵسابوایە بە گواستنەوەی بووک لە پای زاوایەتی شەوی یەکەمیدا دەبوایە باج بدات ئەگەر چی ئەم شێوەیە دواتر رەتکرایەوە (زوبرتیسکی، ١٩٨١، ص٩٢)، یان ئەگەر - وەک پێشتریش وترا - جووتیار کچەکەی بە شوو بدابا دەبوایە دەرەبەگەکە رازی بێت بەو کەسەی پێی ئەدات ئەگەر رازیش نەبوایە ئەوا باجی لە خاوەن کچەکە وەردەگرت (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٨٩) و دەرەبەگ مافی ئەوەی هەبوو کە دوای مردنی خێزانی جووتیار مارە بکاتەوە (زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٩٣).

لەم پەیوەندی بەرهەمهێنانەدا رق و قینی دەرەبەگ بەرامبەر چینەکەی تر دیاردەیەکی بڵاو بووە و، جووتیاران لەحاڵەتی وادا ناچار بوون بۆ خۆپاراستن لە شەڕەنگێزی دەرەبەگەکان، پەنا ببەنە بەر کەسانی دەربار و داوای لێخۆشبوونیان کردووە و، ئەوانیش بۆیان پاڕاونەتەوە و زۆر جار بەهۆی ئەوەوە لەئازاردان رزگاریان بووە و، ئەم جۆرە لە بارسووک کردنە ناونراوە شەفاعەت(زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٩٥).

دەتــوانین بڵێــین پەیوەنــدییەکانی بەرهەمهێنــان لە سیســتەمی دەرەبەگایەتیــدا پەیوەنــدییەکی نــاجێگیر و نــاڕەوا بــووە، چــونکە دەرەبەگەکان هەموو مافێکیان بەدەست هێناوە بەرامبەر بە چەوسانەوە و باج و کاری سوغرەیی جووتیارەکان، تەنانەت ئەم شێوە پەیوەندییە کاریگەری ڕاستەوخۆی کردۆتە سەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی خێزانە جووتیارەکانیش، چونکە جووتیار لە ناو ماڵی خۆشیدا خاوەنی هیچ بڕیارێک نەبووە بە بێ ڕەزامەندی دەرەبەگەکەی تەنانەت نیشتەجێبوون و جێگیربوونیشی پەیوەست بووە بە زەوییەکەوە.

**- جیاوازیی نێوان دەرەبەگایەتی لە (ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا):**

لەگەڵ ســەرهەڵدانی سیســتەمی دەرەبەگــایەتی، بەچاوپۆشــین لەجیــاوازیی ســەرەتاکانی کە لە ڕۆژهەڵات بــۆ ســەدەی ســێیەم و لە ڕۆژئاوا بۆ سەدەی پێنجەمی زایینی دەگەڕێتەوە (زوبرتسکی، ١٩٨١، ص٨٧) چەند بنەمایەکی سەرەکی وەک (زەوی و خاوەن زەوی و جووتیار) دەرکەوتن، (کوبلاند، ١٩٨٥، ص٦) و بەپێی سروشتی کۆمەڵگاکانی ئەو دوو ناوچەیەش لەناو سیستەمەکەدا، لێکچوون و جیاوازی هەبووە و، لەبەر ئەوەش کە خودی دەرەبەگایەتی سیستەمێکی چینایەتییە و لەسەر بنەمای دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ دوو چینی (دەرەبەگ و جووتیار) هاتۆتە ئارا، مافی تاکەکەسیش بەپێی ئەو چینەی تیایدا ئەندام بوو جیاواز بوو، بەڵام لەگەڵ هی هاوچینەکەی و لە چوارچێوەی سیستەمی دەرەبەگایەتیدا و، لە هەرکات و شوێنێکدا هەر هەمان مافە بووە. (گرخان، ١٩٦٨، ص٢٩٩).

سەبارەت بە دەرەبەگایەتی لە ڕۆژهەڵاتدا، دەوڵەت خاوەنی زەوییە تەنانەت بە مەبەستی بەرهەمهێنان و سوود لێ وەرگرتنی دابەشی سەر دانیشــتوان و جووتیــاران ئەکــات و هەر کــاتێ ویســتی ئەم زەوییــانە بگەڕێنێتەوە ئەوا دەوڵەت ئەم مافەی هەیە و دەتوانێت ئەنجامی بدات، بەڵام لە کۆمەڵگــای ڕۆژئــاوادا لە زۆربەی کاتــدا خاوەنــدارێتی زەوی دەگەڕێتەوە بۆ میر و سەرکردەکان و خوا پێداوەکان و لە کاتێ کە

ویستیان زەوییەکان بسێننەوە ئەوا دەبێ لە ڕێگای ناکۆکی و شەڕەوە زەوییەکان بگەڕێننەوە (عزیز، ١٩٨٥، ل٩٠). لە لایەکی تر جووتیار لە سیستەمی دەرەبەگایەتی لە ڕۆژهەڵاتدا جووتیارێکە ناچارە کەوا کاری سوغرەیی بکات و هەموو کاروبارێکی کشتوکاڵ و کاری تری پێویست بۆ خاوەن موڵک بکات و ماوەکەی لە حەوت ڕۆژ تا دوو مانگ دەبێت (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٨٠)، بەڵام جووتیار لە ڕۆژئاوادا بەندێکی زەوییە کە جیاوازی لەگەڵ سوغرەدا لەوەدایە کە بەندێتی کارێکی داواکراوە بە شێوەیەکی بەردەوام بەڵام سوغرە کارێکی کاتییە ئەگەر دووبارەش ببێتەوە، لە هەمان کاتدا جووتیاری سوغرە مرۆڤێکی سەربەستترە لە جووتیاری بەندێتی چونکە هەردەم بە دوای گەورەکەیەوە نابێت و جاری وایە مووچە لە دەوڵەت وەردەگرێت و دەوڵەتیش ڕێگا نادات خەڵکی بچەوسێنرێتەوە لە کاتێ کە دەوڵەتەکە بەهێز و توانا بێت (عزیز، ١٩٨٥، ل٩٠).

لە ڕوویێکی ترەوە دەرەبەگایەتی لە ڕۆژهەڵات لە کارەکانی بەڕێوەبردن و هەڵسووڕاندنی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی پشت بە فەرمانبەران و مووچە خۆران دەبەستێت زیاتر لەوەی پشت بە خاوەن موڵکە سەربەخۆکان ببەستێت بەڵام لە دەرەبەگایەتی ڕۆژئاوادا دەسەڵات لەسەر خاوەندارێتییەکی پڕ بە پڕی ڕەها وەستاوە، بەڵام لە هەمان کاتدا شار و هەرێمە سەربەخۆ دەرەبەگییەکان خاوەنی دەسەڵاتێکی ڕەها و فراوان بوون و لە ڕووی یاسایانەوە دەرەبەگەکان لە هەرێمەکانیاندا دادپەروەری سەربەخۆیی تایبەت بەخۆیان هەبوو (عزیز، ١٩٨٥، ل٩١).

زیادەی بەها لە سیستەمی دەرەبەگایەتی لە ڕۆژهەڵاتدا بە دەست دەهێنرێت لە شێوەی باجانە و زۆرەها دەستکەوت کە دەوڵەت دەستگیری دەبێت بەڵام لە سیستەمی دەرەبەگی لە رۆژئاوادا بەشێوەی زەبر و جەورێکی نا ئابوورییانە دێتە دی ( کیە،١٩٧٠، ص٣٧٩؛ زوبرتسکی، ١٩٨١، ص١١٤).

لەڕووی ئاینییەوە لە ڕۆژئاوا کەنیسە ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی هەبووە و خاوەنی زەویوزارێکی فراوان بووە تەنانەت (پاپا) گەورەترین دەرەبەگ بووە و کەنیسە خاوەنی زۆرترین زەوی بە پیت بووە. (الجواهري، ١٩٨٥، ص١٤٥؛ قاسملو، ١٩٧٣، ل ١١٩)، بە هەمان شێوە ڕۆڵی ئاینی لە ڕۆژهەڵاتدا کەمتر نەبووە لە ڕۆڵی کەنیسە چونکە دەسەڵاتی خەلیفەکان لە ڕۆژهەڵات بەتایبەتی خەلیفەکانی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی خاوەنی گەورەترین زەویوزار بووینە ئەمە سەرەڕای چەندین باجی تر کە بە ناوی ئاینییەوە لە خەڵک وەرگیراون (قاسملو، ١٩٧٣، ل١١٩؛ الجواهري، ١٩٨٥، ص١٤٥).

دەتوانین بڵێین کەوا رژێمی دەرەبەگایەتی هەر چەندە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا لەسەر هەمان بنەما دامەزراوە بەڵام خاسیەتی جیاوازیان هەبووە بەپێی بارودۆخی ناوچەیی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و یاساکانی ئەم رژێمە، بەڵام لە سەردەمی باڵادەستیی ئەم پەیوەندییە جووتیار هەر چەوساوە بووە و رەنجی بۆ خاوەن زەوییەکە بووە (بیشکچی، ١٩٩٨، ص ١٣٧- ١٣٨).

## تەوەری پێنجەم

## پاشەکشەکردنی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستاندا

پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەم بە شێوەیەکی گشتی لە کوردستاندا باڵا دەست بوون، (عبدالرضا، ١٩٧٠، ص٢٦). شوێنی کوردستانیش لە لێواری پڕ ئەستەمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەڵکەوتنی لەنێوان وڵاتانی تورکیا و سوریا و عێراق و ئێران و ئەرمەنستان و، بوونی بە پردەبازێک بۆ بەستنەوەی هەرسێ کیشوەری ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقا و، درێژبوونەوەی خاکەکەی تا نزیک دەریای خەزەر و دەریای رەش و کەنداوی فارسی (عەرەبی) و بەندەری ئەسکەندەرۆنە (حسێن مەدەنی، کوردستان و ستراتیژی نێو دەوڵەتان، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٩،

ل١٠) و هەڵکەوتنی لەنزیک هێڵەکانی پەیوەندیی هاتوچۆی نێوان ئاسیا و ئەوروپـــا، (عبدالرضـــا، ١٩٧٠، ص٢٦) لە ئەنجـــامی ئەو شـــێوازی دەستبەسەرداگرتنەی زەوییەکانیش لەلایەن دەرەبەگەکانەوە جووتیاران ناچـاربوون بە کـرێ کـاربکەن (ئەسەســەرد، ١٩٨٦، ل٢٦). ئەوەش دوای بەهێزبـوونی هەژمـوونی سیاسـی و ئـابووریی وڵاتە گەورەکـان، بەتـایبەتیش بەریتانیـا و رووسـیا لە نـاوچەکە و کوردسـتان لە نیـوەی دووەمـی سـەدەی نـۆزدە و کاریگەرییـان لەسـەر پەیوەنـدییەکانی وەرزێری گەشەکردنی وڵات، (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٢٦) رۆڵـی گرنگی بینیوە و هۆکارێک بووە بۆ پەرەسەندنی بازرگانی و کوردستان بوو بە بەشێک لە بازاڕی جیهانی و لە ئەنجامی ئەوەشدا ئەو پیشەگەریەی کە شێوەی سـادەی وەرگرتبـوو، گـۆڕانی بەسـەردا هـات و تەنـانەت کشتوکاڵیشـی گرتەوە(ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل٢٦)، ئەمەش هـانی دەرەبەگەکانی دا تـا هەڵـەکە بقۆزنەوە و هەوڵی قۆرخکردنی زەویەکان بدەن و لەدەست جووتیاران دەری بهێـنن و، لەبەرئەوەش کە مەرجـی بنەڕەتـی کـڕین و فرۆشـتنی زەوی، موڵکداری جووتیار بوو و، لە زمـانی (ئەنگلز)یشـەوە وتراوە کە (خـاوەن مـوڵکیەتی تەواو هەر ئەوە نیـیە کە زەوییەکـی لەدەسـتدابێ، بەڵکو ئەوەیە کە بتوانێ بەرهەمەکەی بفرۆشێ)، ئەمەش زیاتر لە توانای خۆڕەپێشـکەرە دەستڕۆیشـتووەکانە نەک خەڵکـی رەش و رووت، بـۆیە هەنـدێک لە زەوییەکـان بەکـڕین و فرۆشـتن لەدەسـت جووتیـاران دەردەهێنران و زۆربەشیان لەلایەن خاوەن دەرەبەگەکان و بازرگان و پیاوانی ئاینی دەستڕۆیشتوو داگیرکران (قاسملو، ١٩٧٣، ل١٢٦) لە ئەنجـامی ئەو شـێوازی دەسـت بە سـەر داگـرتنەی زەوییەکـانیش لە لایەن دەرەبەگەکـانەوە جووتیـاران ناچـاربوون بە کـرێ کـاربکەن (ئەسەسـەرد، ١٩٨٦، ل٢٦).

شارەکانیش فراوان بوون بەشێوەیەکی زۆر خێرا لەسـەر حسـابی گوندەکانـدا (شاملوف، ١٩٨٤، ص ٧٢؛ عبدالرضـا، ١٩٧٠، ص٢٩) و ئەم فراوانبـوونە لە ئەنجامی فراوانبوونی دەسەڵاتی ئەوروپییەکان سەری هەڵدا و بە هۆی

ئابووریی بەرهەمهاتوو لە سەر کایەی کشتوکاڵ بەرەو هەرەسهێنان هات و ئابووریی بازرگانی شوێنی گرتەوە. (عبدالرضا، ١٩٧٠، ص ٢٦؛ بیشکچی، ١٩٩٨، ص٢٦٢). لەگەڵیشیدا ستەم و زۆرداری دەرەبەگەکان گەیشتە ئاستێک کە جووتیارەکان بیر لە وەستانەوە و شۆڕش بکەنەوە و، دەکرێ سەرهەڵدانی چەند ڕاپەڕینێک لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان لەو قۆناغەدا (سین. ز. ١٩٩٢، ص٥٧)، وەک ڕەنگدانەوەی بەکرداری ئەو ڕەوشە بەدیهاتووە بێتە هەژمار.

دەست بەسەرداگرتنی سەرمایەدارییەکان بۆ بازاڕەکانی ناوەخۆ بە شێوەیەکی سەرەکی بە سەر بازرگانی و کانزاکان بووە هۆیەک کەوا ڕابەرایەتی ئابووریی کوردستان بە دەست سەرمایەدارەکاندا بێت و چینی جووتیار لە ئەنجامی دەست بەسەرداگرتنی سەرمایەدارەکان بۆ سەر زەوی و ڕێگا و کانزاکان و دانانی چەندین کۆمپانیا و دامودەزگای تایبەتی و هێڵی شەمەندەفەر گۆڕان بۆ کرێکار (عبدالرضا، ١٩٧٠، ص٢٨) بەم جۆرە کوردستان بووە بازاڕی ناردنە دەرەوەی کەلوپەلی سەرەتایی و ساغکردنەوەی شمەکی نێردراوی وڵاتانی ئەورووپی (ئەسەسەرد، ١٩٨٦، ل ٢٩).

لەلایەکی ترەوە لە ئەنجامی گۆڕانکارییە سیاسییەکان سەرخانی کۆمەڵگا بەرەو گۆڕانکاری چوو بە تایبەتی هەر لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی و هەتا شۆڕشی ١٩٥٨ لە عێراق کە تیایدا یاسای چاککردنی کشتوکاڵ دەرچوو ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی کردە سەر هەرەسهێنانی پەیوەندیی دەرەبەگایەتی (الحمیري، ٢٠١٧، ص٢٥٥؛ قاسملو، ١٩٧٣، ل ٣٢٤). لێرەدا دەتوانرێت بوترێت رژێمی دەرەبەگایەتی هەرچەندە ماوەیەکی زۆر توانی باڵادەست بێت بەڵام لە ئەنجامی سەرهەڵدانی بازرگانی و فراوانبوونی دەسەڵاتی ئەورووپی لە کوردستاندا توانی شۆڕشێک دژ بە دەربەگایەتی ئەنجام بدات و بنەماکانی ئەم رژێمە هەڵتەکێنێت و شێوەیەکی نوێ لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان سەر هەڵبدات ئەویش سەرمایەدارییە.

**ئەنجام:**

لە کۆتایی ئەو توێژینەوەیە بە ناونیشانی (مێژووی دەرەبەگایەتی لە باشووری کوردستان/ توێژینەوەیەکی مێژووییە لە بارەی سەرهەڵدان و گەشەکردن و هەرەسهێنان) توێژەر دەگاتە چەند دەرئەنجامێک کە ئەمانەن:

١ ــ رژێمی دەرەبەگایەتی وەک گشت رژێمە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان کە کۆمەڵگایان پێدا تێپەڕیوە هۆکار و بنەما و زەمینەی سەرهەڵدان و سروشتی تایبەت بەخۆی هەیە، تا ئەو کاتەش بەردەوام بووە کە توانیویەتی وەڵامی پێداویستییەکانی سەردەم بداتەوە.

٢ ـ لەبەرئەوەی دەرەبەگایەتی لە کوردستاندا جیاواز لە وڵاتانی تر، لە سەرینی هەرەسهێنانی سیستەمی کۆیلایەتی سەری هەڵنەداوە و، شێوەی کلاسیکی کۆیلایەتی نەبینیوە، و وەک زۆربەی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵات شێوەی دەوڵەتی کۆیلەداری هەبوو و، لە رەوتی مێژوو و سروشتی هەڵکەوتنی جوگرافیشدا تایبەتمەندیی خۆی هەبووە، رەوشی ژیانیش لە چوارچێوەی ئەو سیستەمی دەرەبەگایەتیەدا لەگەڵ هی دانیشتوانی وڵاتانی تر جیاواز بووە.

٣ ـ جووتیاری کورد هەرچەندە ژێر دەستەی خاوەن زەوییەکان بووە و تەنانەت زۆر لە مافەکانی پێشێل کراوە بەڵام لەکاتی باڵادەستی ئەم رژێمە هەوڵی گۆڕانکاری لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانی داوە تەنانەت چەندین ڕاپەڕین و ڕووبەڕوو بوونەوە لە ناوچە کوردییەکان دژی دەرەبەگەکان روویان داوە.

٤ ـ کاریگەریی ئایینی یەکێک بووە لەو هۆکارانەی کەوا بۆتە هۆی فەرزکردنی چەندین جۆرە باج بەسەر جووتیارەکان. دڵسۆزی کورد بۆ ئایینی ئیسلام بۆتە هۆکارێک کەوا دژی ئەم باجانەش نەوەستن بەڵام لە لایەن دەرەبەگان بەشێوازێکی تر مامەڵەی لەگەڵ کراوە.

٥ ـ لە کاتی دروست بوونی سەرمایە و فراوان بوونی دەسەڵاتە ئیستعمارییەکان و فراوان بوونی هەژموونی سیاسییان لە کوردستان

ڕاستەوخۆ بەم گۆڕانکارییە بەستراپەوە بە تایبەت کوردستان بە بازاڕی جیهان بەسترایەوە و بووە شوێنی ناردنی کەرەستە سەرەتاییەکان و ساغکردنەوەی کەرەستە هێنراوەکان لە شێوەی شمەک و کەلوپەل و هتد. بە شێوەیەکی خێرا گۆڕانکارییەکان لە کوردستان دەرکەوت و پووکانەوەی ئەو ڕژێمەکە دەستی پێکرد.

## لیستی سەرچاوەکان:


**ـ بە زمانی کوردی:**

ـ برونەسن. مارتین. فان، ئاغا و شێخ و دەوڵەت، وەرگێڕانی: کوردۆ، چ (٣)، بەرگ (١)، سلێمانی، ١٩٩٩.

ـ حسێن مەدەنی، کوردستان و ستراتیژی نێو دەوڵەتان، ب(١)، هەولێر، ٢٠٠٩.

ـ عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی: عبداللە حسن زادە، ١٩٧٣.

ـ عزیز شەمزینی، جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان، وەرگێڕانی: فەرید ئەسەسەرد، چ (٣)، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان، سلێمانی، ١٩٩٨.

ـ فەرید ئەسەسەرد، گەشەکردنی سەرمایەداری لە کوردستاندا و زەمینەی ئابوورییانەی بزووتنەوەی نەتەوایەتی، چ (١)، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ناوەندی رۆشنبیری، تەمموزی ١٩٨٦.

ـ محمد فاضل محمد عزیز، رژێمە ئابوورییەکان و کۆمەڵگای تەکنۆلۆژی نوێ، ب(١)، چاپخانەی ئۆفسیتی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٥.

ـ مەهدی محەمەد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥ ـ ١٩٥٨، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

ـ مینورسکی، کورد، وەرگێڕانی: حەمە سەعید حەمە کەریم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٤.

**ـ بە زمانی عەرەبی**

ـ ابراهيم علي طرخان، النظم الاقطاعية في الشرق الاوسط في القرون الوسطى، دار الكتاب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٨.

- أ. شاملوف. حول مسالة الاقطاع بين الكرد، ترجمة: د. كمال مظهر أحمد، ط (٢)، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٤.
- اسماعيل بيشكجي، كردستان مستعمرة دولية، ترجمة: زهير عبدالملك، السويد، ١٩٩٨.
- احسان محمد الحسن و فوزية العطية، الطبقة الإجتماعية، مطبعة جامعة الموصل، الموصل، ١٩٨٣.
- ابراهيم كبة، دراسات في تاريخ الاقتصاد والفكر الأقتصادي، الجزء الاول، ط (١)، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٧٠.
- ج. و. كوپلاند. و ب. فينوجرادوف، الإقطاع والعصور الوسطى في غرب اوروبا، ترجمة: محمد مصطفى زيادة، ط (٣)، القاهرة، ١٩٥٨.
- زوبرتسكي و آخرون، المشاعة والرق، الاقطاع، التشكيلات الاجتماعية والاقتصادية ما قبل الرأسمالية، ترجمة: جورج طرابيش، ط (٢)، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت - لبنان، ١٩٨١.
- سين. ز، نشوء الاقطاع ونضال الفلاحين في العراق، مجلة (الثقافة الجديدة)، العدد (٢٥١)، أربيل، كانون الاول ١٩٩٢.
- عبدالرضا الحميري، نظام الإقطاع في العراق بين مؤيديه ومعارضيه، ط (١)، بغداد، ٢٠١٧.
- ماجد عبدالرضا، المسألة الكردية في العراق الى ١٩٦١، منشورات مكتبة بغداد، مطبعة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٠.
- محمد دويدار، تاريخ الفكر الاقتصادي، منشورات دار الجامعات المصرية، الاسكندرية، ١٩٩٨.
- محمد عبدالعزيز عجمية، فصول في : التطور الاقتصادي في اوروبا والعالم العربي، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٦.

**- گۆڤارەکان**

**- بە زمانی کوردی:**

- اسماعیل رسول، گەشەکردنی ئابووری لە کوردستانی عێراق، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژمارە (٨٢)، تشرینی دووەمی ١٩٨٠.
- فەرید ئەسەسەرد، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، گۆڤاری سیاسەتی دەولی، ژ (٢٢)، ١٩٩٨.

**- بە زمانی عەرەبی:**

- عماد احمد الجواهري، ملاحظات عن الاقطاع و حيازة الاراضي في كردستان في العصور الاسلامية المتأخرة، مجلة (كاروان)، العدد (٣٤)، أربيل، حزيران ١٩٨٥.

## ملخص البحث

# تأريخ الاقطاع في كوردستان الجنوبية

نشميل صابر عبدالله
قسم التاريخ – كلية الاداب
جامعة صلاح الدين – اربيل

هذه دراسة خاصة بتأريخ الاقطاع في جنوب كوردستان، كنظام أقتصادي لـه مميزاته ، وتأثيراته وانعكاساته على الكورد وتاريخهم الحديث، الدراسة تلقي الضوء على مفاهيم النظام، وكيفية نشوئه وتطـوره واسـباب ضـعفه وانحلالـه، كمـا قارنـت الدراسة بين النظام الاقطاعي الكوردي ومايماثلـه في الشـرق والغـرب. وبينـت وقـوف الفلاحين ضد هـذا النظـام وتمثـل ذلـك بانتفاضـاتهم ضـد ضـرائب الاقطـاعيين غـير الشرعية التي كان للدين اثره في فرض العديد منهـا. المهـم في الامـر ان بقايـا النظـام الاقطـاعي مازالـت اثارهـا ماثلـة للعيـان في عمـوم كوردسـتان، الا انـه في طريقـه الى الانحـلال ثـم الـزوال بسـبب التطـورات السياسـية وانتشـار الـوعي والمسـتجدات المعاصرة.

## Abstract

### The history of feudalism in southern Kurdistan

Feudalism system is one of the economic system which was very common in Kurdistan.it has many principles and characteristics with many effects on the economy of Kurdish people for so long.in this study, feudalism as the term, its origin and development are presented. This is in addition to the highlight of all the phases that this system went through and the impact of the Kurdistan. Moreover, the differences between feudalism in the east and west are also presented. The study is concluded by presenting the factors that make the system vanish in Kurdistan.

# زوبێر بیلال ئیسماعیلی مێژوونووس و رۆڵی لە نووسینی مێژووی رۆشنبیریی هەولێر

**م. ی. بارزان محەمەد عەلی**
بەشی مێژوو - کۆلێژی ئەدەبیات
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشـەکی**

زوبێـر بـیلال لــە مەیـدانی مێژوونووسـیدا، یەکێکـە لەوانـەی بـە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە هاتنە گۆڕەپانی مێژوونووسی کوردییەوە، مێژوو لە هەموو زانستێک زیاتر سەرنجی زوبێر بیلالی راکێشاوە و هـەر زوو بووە هۆگری دەستنووسە کۆنەکان و خامـەی لـە مەیدانی لێکۆڵینـەوەی زانستی لە بارەی مێژووی کورد بەگشتی و مێژووی هەولێر بە تایبەتی خستەکار، ئەویش لە سۆنگەی درککردن بەوەی کە چ کـەلێنێکی گـەورە لە کتێبخانەی مێژوویی کوردیدا هەیە، ئەمـەش وای لێکرد هێندەی دی لەسـەر لێکۆڵینـەوەی مێـژووی کـورد سـوور بـێ و بـەو نیـازەی ئـەرکی زانسـتی سـەرشـانی بەرامبـەر نەتەوەکـەی رابپـەڕێنی. دەبـێ ئـەوەش بگوترێـت کـە زادە و فیکـر و بەرهـەمی بیـر و دڵسـۆزیی ئـەو پیـاوە بەڕاستی تا رادەیەکی زۆر ئەرکی سەرشـانی دەسـتەی مێژوونووسـانی کورد بە تایبەتی و رووناکبیرانی دوای خۆی بەگشتی ئاسان کردووە.

بایەخ و گرنگیی ئەم توێژینـەوە لـەوەدایە کە هەوڵدراوە هـەوڵ و کۆششـەکانی زوبێـر بیلالــی مێژوونــووس لــە نووسـینی مێــژووی رۆشـنبیریی هـەولێر بـەدیاربخرێت، کە تا ئێستا لـە لایـەنی زانسـتییەوە کـاری لەسـەر نـەکراوە. ئـەوەی پەیوەسـتیش بێـت بـە کۆسـپ و ئاستەنگەکانی بەردەم ئەم توێژینەوەیە زیاتر خۆی لـە پـەرش و بڵاویی سەرچاوەکان بینییەوە، بێگومان ئەمەش ماندووبوونێکی زۆری بـەدوای خۆیدا هێنا تاوەکو زانیاریی تایبەت بەو بوارە بەدەست بکەوێت.

توێژینەوەکە لە سێ تەوەر پێکهاتووە، لە تەوەری یەکەمدا وەکو دەروازەیەک تیشک خراوەتە سەر رەچەڵەک و ژیاننامەی زانستی زوبێر بیلال ئیسماعیلی مێژوونووس، هەر لەو بەشەدا سیما و تایبەتمەندییە دیارەکانی کەسایەتی زوبێر بیلال خراوەتەڕوو. لە تەوەری دووەمی توێژینەوەکەدا، بۆ(لایەنی رۆشنبیریی شاری هەولێر لە نووسینەکانی مێژوونووس زوبێر بیلال ئیسماعیل) تەرخانکراوە، ئەویش لای خۆیەوە دابەشکراوە بۆ سەر باسەکانی : (ژیاننامەی ناودارانی هەولێر، قوتابخانەکان، مەقامبێژ و مەولوودخوێنەکانی شاری هەولێر).

تەوەری سێیەم تایبەتکراوە بۆ قسەکردن لە بارەی (ڕێبازی ناوبراو لە نووسینی مێژوودا)، لەم بەشەدا رۆشنایی خراوەتە سەر هەریەک لە باسەکانی (چەمکی مێژوو لای زوبێر بیلال) و (ڕێبازی لە نووسینی مێژوودا).

سەبارەت بەو سەرچاوانەی لە نووسینی ئەم کتێبە سوودیان لێوەرگیراوە، بە پلەی یەکەم کتێب و توێژینەوە و وتارەکانی زوبێر بیلال خودی خۆیەتی و وەکو سەرچاوەی سەرەکی پانتاییەکی فراوانیان لە نووسینی ئەم توێژینەوەیە داگیرکردووە، لەدیارترینیان (أربيل في أدوارها التأريخية) و (علماء ومدارس في اربيل) و (تأريخ أربيل/ دراسة تأريخية عامة لاربيل وانحائها منذ اقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى)، لە پاڵ ئەوانیشدا چەند توێژینەوەی دیکەی ناوبراو سوودی باشیان لێوەرگیراوە، لەوانە (النقد الحديث و النقد في الادب الكردي) کە لە گۆڤاری "الثقافة" ژمارە (٧)ی ساڵی ١٩٨٠ بڵاوکراوەتەوە . جگە لەوەی ژمارەیەک لە گۆڤار و رۆژنامە پشتیان پێبەستراوە کە لە لیستی سەرچاوەکان ئاماژەیان پێدراوە .

**تەوەری یەکەم : سەربردەی ژیانی**

**١- رەچەڵەکی بنەماڵەکەی و لەدایکبوونی:**

بیلال ئیسماعیلی باوکی لە بنەماڵەی (قاوەچی) بووە و پیاوێکی ئاینپەروەر و زانایەکی هۆشیار بووە و لە مزگەوتی گەورەی قەڵای هەولێر خوێندوویەتی و لە دواییشدا خوێندنەکەی لە قوتابخانەی فەرمی عوسمانلی تەواوکردووە و بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووە. (ئیسماعیل، ٢٠١٨/٩/٧). بیلال ئیسماعیلی باوکی، خاوەن کتێبخانەیەکی گەورە بووە و پڕ لە کتێبی ئەدەبی و ئاینی و مێژوویی بە نرخ بووە، ئەو کتێب و سەرچاوانە بە میرات بۆ زوبێری کوڕی ماوەتەوە و بوونەتە سەرچاوەی گرنگ بۆ زانیارییە فراوانەکەی لە بواری مێژوو و زانستی ئاینی.

سەبارەت بە دایکیشی ئەوا لە بنەماڵەی (دۆغرەمەچی)ن. (ئیسماعیل، ٢٠١٨/٩/٧)، لەبنەڕەتدا لە خێزانێکی رووناکبیر بوونە و (مەلا مستەفا حوسێن خەفاف)، کە دەکاتە باوکی دایکی مێژوونووس زوبێر بیلال، زانایەکی ناسراوی ئاینی شاری هەولێر بووە و گۆشەیەکی تایبەتی لە مزگەوتی خانەقای هەولێر بۆ وانە گوتنەوە و فتوادان تەرخانکردبوو و گەلێک زانای بەوەج لەسەر دەستی دەرچوون و مۆڵەتی مەلایەتییان وەرگرتووە و لە دواییدا بە مزگەوتەکانی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە. (شارەزا، ٢٠٠٠/١٢/١٥)، ناوبراو لەساڵی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کردووە. (ئیسماعیل، ٢٠١٨/٩/٧).

بیلال ئیسماعیل لە ساڵی ١٩٣٣ (سەبریبە)ی کچی (مەلا مستەفا حوسێن خەفاف)ی هێناوە و لەو خێزانەی چوار کوڕی هەبووە بە ناوەکانی تەلعەت، زوبێر، جەودەت[١] فوئاد[٢] ، لەگەڵ چوار کچ. (ئیسماعیل، ٢٠١٨/٩/٧).

(زوبێر بیلال ئیسماعیل) خۆی لە ساڵی ١٩٣٨ لە قەڵای دێرینی شاری هەولێر لە دایک بووە، لە بنەماڵەیەکی ئاین و ئەدەبپەروەر پێگەیشتووە. (ئیسماعیل، ٢٠١٨/٩/٧). زوبێر بیلال لە ساڵی (١٩٤٥) دا

چووەتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی سەرەتایی و لە ساڵی (١٩٥١) دا خوێندنی ئەو قۆناغەی تەواوکردووە و چۆتە قوتابخانەی ناوەندی هەولێر و نموونەیەکی نایابی قوتابی بە ئەدەب و زیرەک و هۆشیار بووە. (هەریری، ٢٠٠٠). لە ساڵی (١٩٥٤) دا چووەتە ئامادەیی لقی ویژەیی و دوای دوو ساڵ کۆتایی بە خوێندنەکەی هێناوە [ئەو رۆژگارە ئامادەیی دوو ساڵ بووە]، بە پلەیەکی بەرز دەرچووە و لە پایزی (١٩٥٦)دا چووەتە زانکۆی بەغدا و لە کۆلێژی ئاداب – لە پسپۆری شوێنەوار و شارستانیەت وەرگیراوە. (اسماعیل، ١٩٨٦، ص ٢٤٥). لە ساڵی (١٩٦٠) بە پلەی (نایاب) دەرچووە و بەمەش یەکەمین قوتابی کورد بووە پسپۆڕی لە مێژووی کۆن و شوێنەواری دێرین و شارستانیەت وەربگرێ. (بابان، ٢٠١٧/١/٢٧).

زوبێر بیلال لە پایزی ساڵی (١٩٦٠) دا بە مامۆستای مێژوو لە قوتابخانەی دواناوەندی هەولێر دامەزراوە. (اسماعیل، ١٩٨٦، ص ٢٤٥). لەنێوان ساڵانی (١٩٧١– ١٩٧٢) ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ (فایزە عەزیز توتنچی) پێکهێناوە، لە ماوەی ژیانیاندا خاوەنی سێ منداڵ بوونە بە ناوەکانی (مستەفا، مێلاڤ، سۆلاڤ). (ئیسماعیل،٢٠١٨/٩/٧).

دوای ئەوەی زیاتر لە (٢٥) ساڵ خزمەتی پەروەردە و فێرکردنی نەوەی نوێی میللەتەکەی کردووە، لەسەر داوای خۆی لە ساڵی (١٩٨٥) دا خانەنشین کراوە. (ئیسماعیل،٢٠١٨/٩/٧)، بەمەش بواری بۆ نووسین و تەواوکردنی کتێبە مێژووییەکانی زیاتر بۆ رەخساوە، بە تایبەتی بەرهەمەکانی لەبواری مێژووی هەولێر لە دوای چاپکردنیان بوونەتە سەرچاوەی بە نرخی لێکۆڵینەوەی مێژوویی. (جلبي، ٢٠١٢/١/١٩).

مێژوونووس زوبێر بیلال لە رۆژی (١٩٩٨/١٢/١٥) لە تەمەنی شەست ساڵیدا پاش ململانێیەکی زۆر لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجە لە شاری هەولێر دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت و لە گۆڕستانی ناسراو بە گۆڕستانی (معمل قیر) نێژراوە. (بیلال،٢٠١٩/٩/٢٩). دوای کۆچی دوایی، ژمارەیەک وتار لە بارەی سەرگوزشتەی ژیان و بەرهەمە زانستییەکانی

بڵاوبۆوه. (زاگروس، ٢٧ کانوون الاول ١٩٩٨؛ خۆشناو، ١٩٩٨/١٢/١٧ ؛ حەمە کەریم، ١٩٩٩/١/١ ؛ هەریری، ٢٠٠٠)، هەروەها کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانیش رووماڵێکی بەرفراوانیان بۆ هەواڵی کۆچی دوایی و ستایش و یادکردنەوەی چلەی بەڕێوە بردووە. لە بەرامبەر ئەو خزمەتە زۆرەی کە مێژوونووسی ناوبراو بە مێژووی کوردی کردووە، حکومەتی هەرێمی کوردستان، گۆڕەپانێکی سەرەکی لە دەروازەی شاری هەولێر لەسەر شەقامی سەد مەتری بەناو کردووە.

**٢- کەسایەتی زوبێر بیلال ئیسماعیل :**

زۆرێک لە نووسەران و لێکۆڵەران گرنگییەکی زۆریان بە مێژوونووس زوبێر بیلال ئیسماعیل داوە و رۆڵی ئەویان بەرز نرخاندووە لە خزمەتکردنی مێژووی کورد و کوردستان و بە تایبەتیش شاری هەولێر. نووسینە بە پێز و جۆراوجۆر و دەستپێشخەرییەکانی ئەویان وەک مێژوو و ئەدەب و رۆشنبیری بەرز نرخاندووە کە دەرگای والا کردووە لەبەردەم زۆرێک لە مێژوونووسانی سەردەمی خۆی و ئەوانەی لە پاش خۆیشی هاتوون .

مەهدی خۆشناو[٣] لە نووسینێکدا باس لەوە دەکات کە ئەو یەکێک بووە لەو قوتابیانەی کە زوبێر بیلال وانەی مێژووی پێ گوتوونەتەوە لە قۆناغی ناوەندی و باس لە پێگە و پلەوپایە و رەوشتی جوان و خاکیبوونی ئەو دەکات. (خۆشناو، ١٩٩٨/١٢/١٧)، هەروەها ناوبراو لە ساڵی ٢٠٠١ دا داستانێکی شیعری لە ژێر ناونیشانی " هەولێرەکەم " لە رۆژنامەی خەبات بڵاوکردەوە کە تێدا باس لە دێرینیی شاری هەولێر و رۆڵی گەورەی ئەم شارە لە جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردیدا دەکات، لەم داستانە شیعرییەدا وێنەیەکی کاریگەری مێژوونووس زوبێر بیلالی کێشاوە و باسی نیشتمانپەروەرییە راستگۆیانەکەی کردووە و ئەو خزمەتانەی بەرز نرخاندووە، کە پێشکێشی شاری هەولێر و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و کوردستانی کردووە. (خۆشناو، ٢٠٠١).

یـەکێک لـە سـیماکانی دیکـەی کەسـایەتی زوبێـر بـیلال ئەوەیـە زۆرترین کاریگەریی هەبووە لەسەر دیاریکردنی شێوازی نووسینەوەی مێـژووی کـورد و کوردسـتان کـە پـڕ بـووە لـە رووداوگـەلی گـەورە، بەرهەمەکانی ئەو ئاسۆی نوێی کردووەتەوە بە رووی مێژوونووسانی سەردەمی خۆی و پاش خۆیشی (جلبي، ٢٠١٤).

جێگـەی ئامـاژە پێدانـە کـە زوبێـر بـیلال هـەر لـە قۆنـاغی دواناوەندییـەوە گزوفـت و حـەزێکی زۆری لـە مێـژوو کـردووە، دوای ئەوەی لە بەشی شوێنەواری و شارستانی کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغداش وەرگیراوە، ئەوا مێژوو بوو بە بەشێک لە ژیانی پیشـەیی و رۆشـنبیریی نـاوبراو، هـەر بۆیـەش رووی کردۆتـە مێـژووی کـۆن و ناوەڕاسـت و نوێوە، بە تایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بە مێژووی کورد و کوردستانەوە هەیە، چونکە لە تێڕوانینی ئەو، ئەو بوارە زەوییەکی بەیارە و کەم کەس کێڵاویەتی. (رامان، ٥ی حوزەیرانی ١٩٩٧، ل ٤٧).

زوبێـر بـیلال کەسـایەتییەکـی رۆشـنبیر و خوێنـەرێکی پـڕ بـوو، کتێبخانەیەکی تایبەت بەخۆی هەبووە، کە زیاتر کتێبی مێژوویی لـەخۆ گرتبـوو. (ئیسـماعیل، ٢٠١٨/٩/٧)، نـاوبراو تەمـەنی خـۆی وەقفـی مێـژووی گەلەکـەی کـردووە و زۆر دڵسـۆزانە و لێبڕاوانـە تێدەکۆشـا و مێـژووی گەلەکەی لـە ژێر تـەپ و تۆزی زەمانـە و لێڵـی و تـەماوی دەردەهێنـا و زانستییانە و هاوچەرخانەی نووسیوەتەوە و پۆلین کردووە. (حەمە کەریم، ١٩٩٩/١/١). مێژوونـووس زوبێـر بـیلال هەمیشـە ئامـادەیی هـەبووە لـە کـۆنفرانس و کۆڕبەنـدی زانسـتی و کـەلتووری، ئەوەتـە لـە کـۆنگرەی مامۆستایانی کورد، بەشداری کردووە و گەلێک پێشنیازی بە نرخـی بـۆ پێشخستنی رۆشنبیری کوردی پێشکەش بـە لێژنـەکانی مێژوو و زمـان کـردووە، کـە هـەموویان لـە دەوری مێـژووی کـورد و خوێنـدنی زمـان سووڕاونەتەوە. بـەرزیی ئاسـتی هۆشـیاری لـە رووی زمانـەوە یـەکێکی دیکە بووە لە تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی ناوبراو، بە شێوەیەک لە پاڵ زمانی دایک، زمانەکانی عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی بە باشـی زانیوە،

ئەمــەش یارمەتییــەکی زۆری ئــەوی داوە بــۆ شــەن و کــەوکردنی ئــەو سەرچاوانەی کە بەو زمانانە نووسراون و بەکارهێنانیان لە بەرهەمە مێژووییەکانیدا. (ئیسماعیل، ٢٠١٨/٩/٧) .

بـەپێی قسـەی ئەوانـەی لـە هـەولێر ژیـاون یـان لـەو سـەردەمەدا سەردانیان کردووە، ماڵەکەی ئەو بووەتە یانەی رۆشنبیری نووسەرانی کورد لەو شارەدا و تێیدا باسی مێژووی کورد و تێکۆشانی نەتەوەیی لێکراوە، هەروەها ئەوانەی (زوبێر بیلال)یان لە نزیکەوە ناسیوە و جا چ خزم و کەسوکاری یان هاوپۆلەکانی لە قوتابخانە یاخود ئەوانەی لە ژێر چاودێری ئەودا بوونە لە خوێندندا، لەسەر ئەوە کۆکن کە زوبێر بیلال مرۆڤێکی دڵپاک و راستگۆ و کراوە بووە و لە خۆبایی نەبووە، هــەروەها کەسـێکی بـە ئەمەکدار بـووە بەرامبـەر بـە دەوروبـەری و ئەوانەی یارمەتییان داوە. (باکووری، ١٩٩٨/١٢/٢٩). زوبێر بیلال جگە لەوەی حەز و خۆشەویستییەکی زۆری بۆ زانستی مێژوو هەبووە، لە هەمان کاتـدا ئـارەزووی لایـەنی ئەدەبیشـی هـەبووە، بۆیـە دەبینـین چەنـد نووسـینێکی لـەو بارەیـەوە لـە نێـو لاپـەڕەی رۆژنامـە و گۆڤارەکانـدا بڵاوکردۆتەوە. (ئیسماعیل، ٢٠٠٠، ل ١٨١-١٨٣) .

هاوکـات وەکـو مامۆسـتایەکی دڵسـۆز تەماشـای قوتابییـەکانی کردووە و ئامۆژگاری کردوون و یارمەتی داون چ لە بواری زانستی و فێرکردن چ لە بواری کۆمەڵایەتی سوود وەرگرتن لەو دەرفەتەی بۆیان رەخساوە. (باکووری، ١٩٩٨/١٢/٢٩).

زوبێر بیلال وەکو رۆژنامەنووسێک ئەندامی دەستەی نووسەرانی چەند گۆڤارێکی رۆشنبیری وەک (کاروان) و (القافلة) و (شانەدەر) بووە و بەشـدارییەکی کـارای هــەبووە لــە زۆربــەی بڵاوکراوەکـانی عێـراق بەگشـتی، وەکـو گۆڤـارو رۆژنامـەکانی (الثقافـة) و (التـراث الشـعبی) و (الاجیال) و (بین النهرین) و (العراق) و گۆڤار و رۆژنامە کوردییەکان بە تایبـەتی ((کـۆڕی زانیـاری کـورد)، (شـمس کوردسـتان)، (الحکـم الـذاتي)، (گـولان العربـی)، (کـاروان)، (رۆشـنبیری نـوێ)، (خـەبات)، (برایـەتی) و (الاتحاد).

لــە دوای کۆچکردنیشـــی، وەزارەتـــی رۆشـــنبیریی هـــەرێـــم رۆژی ١٩٩٩/٢/٢٥ کۆڕبەندێکی زانستی بەست بۆ نرخاندن و هەڵسەنگاندنی بەرهەمـەکانی و ڕێزلێنـانی یـادی کـۆچکردوو بـۆ زینـدووڕاگرتن و بـە بەڵگەنامـەکردن و بـەهێزکردنی مێـژووی کـورد و کوردسـتان، تـەواوی کۆڕبەندەکە لە ڕێگەی ئامرازەکان و دەزگاکانی راگەیاندن بڵاوکرایەوە، لـەو کۆڕبەنـدەدا (فەلەکـەدین کاکـەیی) وەزیـری رۆشـنبیری، باسـی لـە کتێبی (تأريخ اربيل) کردووە و بەوەی کە ئەم کتێبە یەکێکە لە گرنگترین کتێبەکان لەبارەی مێژووی هـەولێرەوە، داوای کرد وەربگێڕدرێتـە سـەر زمـانی ئینگلیـزی و زمانـەکانی دیکـە، لەبـەر گرنگـی ناسـاندنی کـورد و مێژووی دێرین و رەسەنەکەی بۆ گـەلانی ناوچەکە و جیهان، هـەروەها داوای کـردووە ئـەم کتێبـە لـە قوتابخانـەکان و پەیمانگـەکـان و بەشـی مێـژووی زانکۆکـانی هـەرێمی کوردسـتان بخوێنـدرێت (خـەبات، ١٩٩٩/٢/٥؛ الصـفار، ٢٠٠٥/٦/١١). لـەم کۆڕبەنـدەدا دیـارترین رۆشـنبیر و نووسـەرانی شاری هەولێر بەشداربوون بۆ قسەکردن و شرۆڤەکردنی بەرهەمەکانی مێژوونـووس زوبێـر بـیلال (حەیدەری، ٢٠١٨/١١/٨)[٤] ، کـە تیایـدا بەشـێکی زۆریـان داوایـانکرد لەبەرامبـەر خزمـەت و بەخششـەکانی لـە بـواری زانسـت، پەیکـەرێکی بـۆ دابنـدرێ و تـاوەکو نـاوی هـەر بـە زینـدوویی بمێنێ. (ابو دانا، ١٩٩٩/٣/٥ ؛ جلبي، ١٣ کانوون الثاني ٢٠١٦) .

**تەوەری دووەم : لایەنی رۆشنبیری شاری هەولێر**
**لە نووسینەکانی زوبێر بیلال ئیسماعیلی مێژوونووسدا**

**یەکەم : ژیاننامەی ناودارانی هەولێر :**

ئـەم مێژوونووسـە لێکۆڵینـەوەی وردی بـۆ ژمارەیـەکی زۆر لـە زانایان و مێژوونووسانی کورد کردووە، زیاتر لە (٢٥٠) توێژینەوەی بڵاوکراوەی هەیە، کە لەنێویاندا لایەنەکانی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ژیاننامەی دیارترین زانایانی هەولێر لە مێژووی نوێ و هاوچەرخدا خستوەتە روو. کە ناویان بە زۆر بەرزی دەهێنێ، هەوڵدەدەین لێرەدا بەشێکیان بخەینە ڕوو :

**١- ئیبن مستەوفی :**

ئیبن ئەلمستەوفی ناوی موبارەک کوڕی ئەحمەد شەڕەفەددینە، مێژوونـووس و وەزیـری هـەولێر بـووە، لـە سـەردەمـی سـوڵتان موزەفەرەدین لە ساڵی ١٢٣٩ (٦٣٧ ک) کۆچی دوایی کردووە. ئیبن ئەلمستەوفی لە بواری ئەدەب و مێژوو و زمان زۆر بەرهەمی نووسیوە، گرنگترینیان کتێبی (مێژووی هەولێرە)، کە لە چوار بەرگ بڵاوکراوەتەوە. (اسماعیل، الحکم الذاتي، ع(٢)، ١٩٨٥، ص ٢٤) ، ئیبن مستەوفی کتێبەکەی بۆ باسی گەورە پیاوانی هەولێر و ئەو ناودارانەی هاتوونەتە شاری هەولێر، تەرخان کردووە، ناوی تەواوی کتێبەکە " نباهة البلد الخامل و من ورد علیه من الاماثل"، لە هەمان کات یەکێک بووە لە شارەزایەکانی بواری ئەدەب و زمانیش. لە دە بەرگی سەربەخۆدا هۆنراوە قورسەکانی موتەنەبی و ئەبو تەمامی لێکداوەتەوە. (اسماعیل، الحکم الذاتي، ع(١-٢)، ١٩٨٢، ص٢١-٢٨) .

**٢- ئیبن خەلەکان :**

ناوی تەواوی عەباس ئەحمەد خەلەکانە و نازناوی شەمسەدینە، ئیبن خەلەکان لە ساڵی ١٢١٢ (٦٠٨ ک) لە هەولێر لە دایک بووە و لە ساڵی ١٢٨٢ (٦٨١ ک) کۆچی دوایی کردووە، ئیبن خەلەکان بە نەتەوە کورد و بە هۆز (خەلەکان)ی بووە، کە هۆزێکە لە هۆزە کوردییەکانی

شـاری هـەولێر لـە باشـووری کوردسـتان (اسماعیل، ١٩٧٩، ص ٢٩-٣١)، لـە گرنگتـرین بەرهەمـەکانی (وفیـات الاعیـان و انبـاء ابنـاء الزمـان)ە، کـە کتێبێکـی ژیاننامـەییـە، تیایـدا ژیـان و سـەربـوردەی بەشـێکی زۆر لـە کەسایەتییە ناسراو و فەرمانڕەوا و ئەدیبەکانی سەردەمی خۆی و پێش خۆیشی تێدا کۆکردۆتەوە. (اسماعیل، ١٩٧٩، ص ٩١ وما بعدها).

### ٣- عەلی ئەلحەریری :

مێژوونـووس زوبێـر بـیلال لـە بـارەی ئـەم کەسـایەتییەوە دەڵێت: عەلی حەریری (هەریری) ناوی ئەحمەدی کوڕی عـەلی حـەریرییـە و بـە نـاوی باوکییـەوە ناسـراوە. بـاوکی ئـەم شـاعیرە نـاودارە بـە ڕەچـەڵـەک خەڵکی ناوچەی حەریرە لە باشووری کوردستان و پاش ئـەوەی رووی کردۆتـە شـام و دواتـر لـە گونـدی عەسـال نیشـتەجێ بـووە، ئەحمـەدی شاعیر لەو گوندە لەدایک بووە هەر لەوێش خراوەتە بەر خوێندن. گەلێ شاران و وڵاتان گەڕاوە بۆ خوێندن، سـەرئەنجام لـە شـاری "عـەنتاب"ی بـاکووری کوردسـتان ئیجـازەی مەلایـەتی وەرگرتـووە. یـەکێک لـە مامۆستاکانی عەلی حـەریریی شـاعیر، مـەلای جزیرییـە، عـەلی حـەریری لەسـەردەمی خۆیـدا هێنـدە ناوبـانگی هـەبووە کـە مـەولانا جـامی لـە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسـی کـردووە (اسماعیل، الثقافة، ع(١١)، ١٩٧٥، ص ٨٦-٨٨). شـیعرە بـەرزەکانی عـەلی حـەریری هـەموو بوارەکـانی گرتۆتـەوە و لەبەر ئەوەی شارەزاییەکی زۆر باشی لە زمانـەکانی تـورکی و فارسـی و عـەرەبیـدا هـەبووە، هەرچەنـدە بەشـێکی زۆری شـیعرە نایابـەکانی فەوتاون، بەڵام ئەو چەند هەڵبەستە کەمـەی کـە مـاون نیشـانەی ئـەوەن عەلی حەریری رووناکبیرێکی گەورە و شاعیرێکی بەهرەمەندی زۆر بـە سـەلیقە بـووە. ئـەو توێژینـەوەی زوبێـر بـیلال لـە سـەردەمێکی زوو نووسیوە، وا دیارە گەورەیی ئەو شاعیرە و کەمی زانیاری لە بارەیەوە، وای کردووە ببێتە جێ سەرنجی زوبێر بیلال و لە بارەیەوە بنووسێت.

**٤- محەمەد ئیبن ئادەم باڵەکی :**

ئیبن ئادەم زانا و بلیمەتی ئایینی و گەردوونناسی کورد محەمەد کوڕی ئادەم کوڕی عەبدوڵڵا ناسراو بە " ئیبن ئادەم " لە ساڵی ١٧٤٧ (١١٦٠ ک) لە گوندی (ڕۆستێ)ی سەر بە ناوچەی باڵەکایەتی شاری هەولێر لە دایک بووە، لە سەردەمی منداڵیدا لە لای باوکی دەستی بە خوێندن کردووە، لە دواییدا لە لای زانای بەناوبانگ " مەلا عەبدوڵڵا" ی سوختەی زانای کورد " سیبغەتوڵڵای حەیدەری " درێژەی بە خوێندنەکەی داوە، ئینجا بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی لە ساڵی ١٧٧٨ چووەتە شاری مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆ فێربوونی زمانی فارسی. (اسماعیل، کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ص٤٥٠) .

ئیبن ئادەم لە ماوەی ژیانیدا زنجیرەیەک لە کتێب و نامیلکەی زانستی و فیقهی و زمانەوانی و ڕەوانبێژی و گەردوونناسی داناوە و هەموویان بە زمانی عەرەبین تاکو ئێستا (٢٧) کتێبی بە نرخی بۆ تۆمار کراون لە بوارەکانی زانست و فیقهی و ڕەوانبێژی و لۆژیک و زمانەوانی و جوگرافیا و گەردوونناسیدا. (اسماعیل، کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧، ص٤٥١) .

**٥- ئەبوبەکر ئەلئەربیلی :**

زوبێر بیلال لەبارەی ئەم کەسایەتییەوە دەڵێت: ئەم کەسایەتییە لە ساڵی ١٨٦٣ لە دایک بووە، ناوی تەواوی مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا عومەر ئەفەندی کوڕی مەلا ئەبوبەکری سێیەمە، لە تەمەنی حەوت ساڵیدا لە مزگەوتی گەورەی قەڵای هەولێر دەستی بە خوێندنی قورئان کردووە ، ئینجا کەوتۆتە سەر فێربوونی وانەی سەرف و نەحو و فیقە و ڕەوانبێژی و فەلسەفە و بیرکاری. لە تەمەنی بیست ساڵیدا خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە و مۆڵەتی زانستی لە حاجی مەلا عومەر ئەفەندی باوکییەوە وەرگرتووە . (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٣٢) .

لە توێژینەوەیەکدا زوبێر بیلال ئەوەشی دەرخستووە کە مەلا ئەفەندی هەر زانایەکی ئایینی نەبووە، بەڵکو لە پاڵ ئەم پایە بەرزەشی

کەســــایەتییەکی کۆمەڵایـــەتی و خـــاوەن هەســـتێکی نەتەوایـــەتی و هەڵوێستێکی چاکەخوازی بووە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بە فەرمانی سوڵتان کرا بە ناوبژیوان بۆ کوژانەوەی دووبەرەکی و شەڕی نێوان خێڵە کوردییەکانی ناوچەکە و توانی ئەو ناخۆشی و پشێوییە چارەسەر بکات و لە پاداشتی ئەو کارە، سوڵتان مەدالیای " حامی الحرمین الشریفین"ی پێدا، کە یەکێک بوو لە بەرزترین مەدالیای خەلافەتی عوسمانی. (اسماعیل، الرسالة الاسلامیة، ع(١٥-١٦)، سنة الحادیة عشرة، ص ٩٨- ١٠٠) .

**٦- ئیبن فەخر ئەربیلی :**

ناوی تەواوی (ئەبوحەسەن کوڕی بەهائەددین کوڕی عیسا فەخرەددین کوڕی ئەبی فەتح ئەربیلی هەکاری)، لە ساڵی (٦٢٠-٦٢٥ هـ/ ١٢٢٣-١٢٢٧م) لە خێزانێکی کوردی لە دایک بووە، یەکێکە لە کەسایەتییە رۆشنبیر و ئەدیبە بەرزەکان لە مێژووی رۆشنبیری شاری هەولێر، چەندین کەسایەتی ناودار لە لای ئەو قوتابی بوونە و خوێندوویانە، ئەو زانا ناودارە چەندین بەرهەمی بە پێزی لە دوای خۆیدا بە جێهێشتووە، کە بریتین لە (التذکرة الفخریة، جلوة العشاق و خلوة المشتاق، رسالة الطیف، کشف الغمة في معرفة الائمة). (اسماعیل، الحکم الذاتي، ع(٥٨)، ١٩٨٨، ص ٣١-٣٣).

**٧- ئیبراهیم حەیدەری:**

یەکێکی دیکەیە لەو کەسایەتییە کوردانەی شاری هەولێر کە مێژوونووس زوبێر بیلال لە توێژینەوەیەکی گرنگدا نووسیویەتی، ئیبراهیم حەیدەری لە ساڵی (١٨٦٥) لە هەولێر لەدایک بووە و دوای تەواوکردنی قۆناغەکانی خوێندنی ئاینی لە شاری هەولێر، ڕووی کردووەتە ئەستەنبۆڵ و لەوێ لەبەر زیرەکی و لێهاتوویی چەندین پایەی حکومی و زانستی وەرگرتووە، لەدیارترینیان ساڵی ١٩٠٦ دەبێتە شێخ ئەلئیسلام لە دەوڵەتی عوسمانی و قازی ویلایەتی دیاربکر، لە دوای گەڕانەوەشی بۆ عێراق لە ساڵی ١٩٢٤ کراوە بە وەزیری ئەوقاف،

لـه حکومـەتی یەکـەمی یاسـین هاشـمی (١٩٢٤/٨/٢- ١٩٢٥/٦/٢١)، لـە ڕێکەوتی ٢ی کانوونی دووەمی ١٩٣١ کۆچی دوایی کردووە (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٣٢)، نـاوبراو مێژوونـووس و شـاعیر بـووە چەنـدین بەرهـەمی فەلسـەفی و ئـاینی و مێژوویـی بـە زمانـەکانی کـوردی و عـەرەبی و تورکی هەیە. (اربیل بین الماضي والحاضر، د. س، ص ٤٩).

### ٨- ئیبن یونس ئەلئەربیلی:

ناوی تەواوی (موسا کوڕی یونس کوڕی محەمەد کوڕی منعە) لە سـاڵی (٥٥١ك – ١١٥٦ز) لـە دایـک بـووە، یەکێکـە لـە زانـا گـەورەکانی بـواری بیرکـاری. (اسماعیل، ١٩٨٧، ص٣٠) ، وێـڕای ئـەوەش شـارەزاییەکی زۆری لە زانستەکانی(فقە و سـەرف و تەفسـیر و پزیشـکی و ئەندازە و جەبـر)دا هـەبووە، لـە سـاڵی (٦٣٩ك – ١٢٤٢ ز) کـۆچی دوایـی کـردووە. (اربیل بین الماضي والحاضر ، د. س، ص ٤٧).

### ٩- ئەبوبەکر میررۆستەمی :

نـاوی ئەبوبــەکرە، کـوڕی محەمــەدە، خــەڵکی گونـدی (میـر ڕۆستەم)ە کە دەکەوێتە نێوان (شەقڵاوە) و (هـەریر). مـەلا ئەبوبـەکر بـە زانسـت و ئـەدەب نـاوی چـووە و پایەیـەکی زۆر بـەرزی هـەبووە لـە زانست، بۆیە محەمەد پاشای ڕواندز لە ناو مەلایان هەڵیبژاردووە و بە مەلای خۆی داناوە. مەلا محەمەدی (خەتێ) و مەلا ئەحمەدی (گەلاڵی) و مەلا ئیبراهیمی (ڕمکی) و مەلا عەبدوڵڵای (شێخ مەموندی) و مـەلا شـێخ نەبی ناسراو بە (پیری ماویلی) بەشێک لە فەقێیەکانی بوونە. زۆر کتێبی بە نرخی داناوە وەکو : (بیان البیان، رسـالة الاستعارة، رسـالة الوضـع). (اسماعیل، الحکم الذاتي، ع(١)، ١٩٨٣، ص ٤٣-٤٥) .

## دووەم / قوتابخانەکان :

قوتابخانە (المدرسة)، بە مانای شوێنی خوێندنی وانە و قورئان و کتێب دێت، قوتابخانـەکان ڕۆڵێکـی گرنگیـان گێـڕاوە لـە بووژانـەوەی ڕۆشنبیری و زانستی لە شاری هەولێردا، ئەم قوتابخانانە بە شێوەیەکی ڕێکخـراو دامـەزرابوون، بـە شـێوەیەک هـەر قوتابخانەیـەک لـە چەنـد

پێکهاتەیەکی گرنگ پێکهاتبوون، ئەوانیش بریتی بوون لە (مامۆستا و موستەعید و ئیمام و قورئانخوێن و بانگبێژ و چاودێر و خزمەتگوزار و فەرمانبەری کتێبخانە و قوتابی. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ١٤- ١٦). ئەم قوتابخانانە رۆڵێکی گەورەیان بینیوە لە بڵاوکردنەوەی هەر چوار مەزهەبە سوننییەکە و پێگەیاندنی سەدان زانا، لە زانستە شەرعییەکاندا[٥]، لە دیارترین ئەو قوتابخانانەی مێژوونووس زوبێر بیلال ئاماژەی پێکردوون کە لە شاری هەولێر هەبوون ئەمانەن :

**١- قوتابخانەی خدری کوڕی نەسری کوڕی عوقەیل:**

دروستکردنی قوتابخانەی ئایینی لە هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچی و سەرەتای سەدەی یازدەیەمی زایینی. مێژوونووس زوبێر بیلال وا ئاماژە پێدەدات کە (خدری کوڕی نەسری کوڕی عوقەیل / ٥٦٧ک- ١١٧٧ز) دوای ئەوەی لە شاری بەغدا خوێندنی ئایینی تەواو دەکات و دەگەڕێتەوە شاری هەولێر، مزگەوت و قوتابخانەیەک لە قەڵای هەولێر دروست دەکات تاوەکو وانەی تێدا بڵێتەوە، مزگەوتەکەش بە ناوی باپیری ئەو مەلایەوە ناودەنرێ بە مزگەوتی (عوقەیلی). قوتابخانەکەش ناودەنرێ (الربض)، ئەم مامۆستایە یەکەم کەس بووە کە وانەی ئەدەب و زمان و ئایینی لە قوتابخانەکە گوتۆتەوە. (اسماعیل، ١٩٨٦، ص ٩٣).

**٢- قوتابخانەی موجاهدی:**

ئەم قوتابخانەیە لە لایەن (موجاهددین قایمازی کوڕی عەبدوڵڵای زەینی)ی جێگری (زەینەدین عەلی کوجک)ی دادوەری هەولێر دروستکراوە، لە بنەڕەتدا خەڵکی (سجستان) بووە، دوای ئەوەی هاتۆتە هەولێر ئەو قوتابخانەی دروستکردووە و ئەو بابەتانەی تێدا خوێندراوە، زوبێر بیلال بەم شێوەیە نووسیویەتی (المجاهدیة وجاور الحرم الشریف)، ناوبراو لە ساڵی (٥٧١ ک) رووی کردۆتە مووسڵ و هەر لەوێش لە ساڵی (٥٩٥ ک) کۆچی دوایی کردووە. (اسماعیل، ١٩٨٦، ص ٩٤).

دوابەدوای ئەم سەردەمە مێژووییە و لە سەردەمی سەدەکانی نوێی ئەم شارە مامۆستا زوبێر بیلال ناوی ژمارەیەک ئەو قوتابخانانە (حوجرە)ی شاری هەولێر و دەوروبەری بۆ تۆمار کردووین کە ناوبانگییان لە شارەکەدا بڵاوبۆتەوە ئەوانیش بریتین لە :

**١- قوتابخانەی مزگەوتی گەورەی قەڵات :**

یەکێک بووە لە قوتابخانە کۆنەکان و بە درێژایی ماوەی سەد ساڵ رۆڵێکی زۆر دیاری لە مێژووی رۆشنبیریی شاری هەولێردا گێڕاوە، کە بنەماڵەی مەلا فەندی وانەیان تێدا گوتۆتەوە، کۆتا زانای ئەو بنەماڵەیە (ئەبوبەکر کوڕی مەلا عومەر ئەفەندی) بووە، کە تا کۆچی دواییکردنیشی لە ساڵی (١٣٠٩ ک) وانەی تێدا گوتۆتەوە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢١).

**٢- قوتابخانەی مەلا رەسول گراوی :**

ئەو قوتابخانەیەش هەر لەناو قەڵای هەولێر بووە، یەکێک لە مامۆستا بەناوبانگەکانی قوتابخانەکە (مەلا ئەحمەد گراوی) بووە، دیارە بەهۆی ئەو ئامۆژگاری و رۆڵەی کە لە شارەکە گێڕاویەتی وایکردووە بە قوتابخانەی (ئەحمەد)یە بناسرێت. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢١).

**٣- قوتابخانەی مزگەوتی ئەسعەد ئەفەندی :**

شوێنەکەی لە نزیک دەروازەی سەرەکی قەڵا بووە، کە ناسرابوو بە مزگەوتی (ناولەپ) و یەکێک بوو لە مزگەوتە کۆنەکانی شاری هەولێر، لە ساڵی ١٩٦١ز نۆژەنکراوەتەوە و مزگەوتەکە بۆ باب و باپیرانی دەگەڕێتەوە، لە تەنیشت مزگەوتەکەش قوتابخانەیەکی لێ بووە، بەڵام لە رۆژگاری ئەمڕۆدا شوێنەواری نەماوە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢١).

**٤- قوتابخانەی ئیبراهیم دۆغرەمەچی :**

ئەم قوتابخانەیە لە بنەڕەتدا مزگەوتێکی بچووک بووە لە نزیک دەروازەی سەرەکی قەڵا، تاکو ئەو سەردەمەش ئەو مزگەوتە ماوە و بە مزگەوتی (شێخان – ئیبراهیم دۆغرەمەچی) ناو دەبرێ، یەکێک لە مامۆستا دیار و بە ناوبانگەکانی ئەم قوتابخانەیە مامۆستا (ئیبراهیم)

بـووه، کـە یەکـەم مامۆسـتای سـەردەمی خـۆی بـووە لـەو مزگەوتـە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢١).

سەبارەت بەو قوتابخانە و حوجرانەی کە کەوتبوونەتە خوارەوەی قەڵات، مێژوونووس زوبێر بیلال بەم شێوەیە تۆماری کردوون :

**١- قوتابخانە و حوجرەی مزگەوتی خانەقا:**

ئـەو حوجرەیـە دەکەوێتـە بەشـی باشـووری دەرەوەی قـەڵات، لـە سـەرەتاکانی سـەدەی نـۆزدە زانایـانی نەقشـبەندی سەرپەرشـتییان کـردووە، لـە دیـارترین ئـەو کەسـایەتییە ناودارانـەی کـە وانـەیان تێـدا گوتووتـەوە (هدایـة اللـه الاربلـي) بـووە، کـە موریـدی مـەولانا خالیـدی نەقشبەندی (١٧٧٩_ ١٨٢٧) بووە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢١).

**٢- قوتابخانەی شێخ ئەبوبەکر ئەفەندی نەقشبەندی :**

ئـەم حوجرەیـە هـەر لـە نـاو مزگـەوتی خانـەقا بـووە، کـە زانایـانی نەقشـبەندیی وانـەیان تێـدا داوەتـەوە، ماوەیـەکی زۆر شـێخ ئەبوبـەکر نەقشـبەندیی خـۆی سەرپەرشـتی کـردووە، زانـای پایـەدار (عبـدالرحیم الزیاری) وانەی تێدا گوتووەتەوە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٢).

**٣- قوتابخانەی حەیدەری :**

ئــەم قوتابخانەیــە لــە بنــەڕەتــدا دەگــەڕێتــەوە بــۆ بنەماڵــەی حەیدەرییـەکـان، ئەوانـەی لـە بنـەڕەتدا لـە گونـدی مـاوەران نیشـتەجێن، توانیویانــە لــە شــاری هــەولێر لــە نزیـک مزگـەوتی (شـێخ اللـە) ئـەم قوتابخانەیە دابمەزرێنن، ئەم قوتابخانەیە بە (حـوجرەی حەیدەرییـەکان) ناسرابوو. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٢).

**٤- قوتابخانەی مەلا محەمەد ئەمین بێتواتی :**

ئەم حوجرەیە دەکەوێتە ناو مزگەوتی (حاجی عەبدولقادر دەباغ)، کەوتۆتە بەشی باشووری ڕۆژئاوای قەڵات، لەدیارترین لەوانەی وانەیان تێدا داوەتـەوە (مـەلا محەمـەد ئـەمین کـوڕی مـەلا شـێخ محەمـەد) کـە پێشـنوێژ و وتـارخوێنی مزگەوتەکـە بـووە، لـە دوای خۆشـی کوڕەکـەی بەناوی (مەلا عەبدوڵڵا) وانەی تێدا داوەتەوە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٢).

**٥- قوتابخانەی مزگەوتی دێرەبڕوشە :**

ئەم حوجرەیە سەر بە مزگەوتی ناوبراو بووە، کەوتۆتە گەڕەکی عارەبان و بەشی رۆژئاوای قەڵات، لە دیارترین ئەو زانایانەی کە وانەیان تێدا داوەتەوە بریتیین لە: (مەلا محەمەد، مەلا عەبدوڵڵا مەلا محەمەد، مەلا سلێمان مەلا عەبدوڵڵا). (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٢).

**٦- قوتابخانەی مزگەوتی شێخ نورەددین :**

ئەم مزگەوتە دەکەوێتە گەڕەکی تەعجیل، لەم مزگەوتە حوجرەیەک هەبوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا، لە زانا ناودار و لێهاتووەکانی ئەو حوجرەیە، مەلا (حاجی ساڵح کۆزەپانکەیی) بووە، کە هەڵگری بڕوانامەی زانستی ئایینی لای (مەلا ئەفەندی) هەولێر وەرگرتووە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٢-٢٣).

**٧- قوتابخانەی موفتی :**

ئەو قوتابخانەیە لە ناو مزگەوتی موفتی بووە لە گەڕەکی تەعجیل، لە زانا ناودارەکانی ئەو حوجرەیە کە وانەیان تێدا داوەتەوە ئەوانەن: (مەلا ئیسحاق، مەلا عەبدولڕەحمان کوڕی مەلا ئیسحاق کە بە (موفتی) ناوی دەرکردبوو، لەبەر ئەوەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا یەکێک بووە لە موفتییەکانی شاری هەولێر. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٣).

**٨- قوتابخانەی مزگەوتی مەحموود پاشا :**

ئەو مزگەوتەش حوجرەی تایبەت بەخۆی هەبووە، زۆر جار بە حوجرەی مزگەوتی مەحموود پاشا ناودەبرا، بەشێک لە زانایانی شاری هەولێر لەم حوجرەیە فەقێیاتییان کردووە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٣)، یەکێک لە دیارترین مامۆستاکانی ئەو حوجرەیە (مەلا ئەبو بەکر عەبدوڵڵای ئەحمەدی هورمزیار) بووە. (بەرزنجی، ٢٠٠٧، ل ١٠٠).

**٩- قوتابخانەی مزگەوتی شێخ محەمەد کوڕی مستەفای نەقشبەندی :**

ئەو مزگەوتە دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای شاری هەولێر، حوجرەیەکی تێدابوو بۆ فەقێ گرتن و فێرکردن، بە تایبەتی موریدانی

شـێخی چـۆلی. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٣)، ئـەم مزگەوتـە بـە شـێخی چـۆلی ناوی دەرکردووە. (بەرزنجی، ٢٠٠٧، ل ١٠١).

**١٠- قوتابخانەی مزگەوتی ناو بازاڕ :**

مەبەست لێی مزگەوتی خانەقای گەورەی نـاو بـازاڕە، بـە هـەمان شـێوە ئـەو مزگەوتـەش کـاتی خـۆی حوجرەیـەکی لـە خـۆ گرتبـوو، لـەو سـەردەمەی کـە (مـەولانا خالیـدی نەقشـبەندی) سـەردانی کـردووە، مزگەوتەکە ناوی خانەقای گرتەخۆ. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٣).

**١١- قوتابخانەی مزگەوتی حاجی فەقێ مراد:**

ئـەو حوجرەیـە سـەر بـە مزگـەوتی نـاوبراو بـووە، لـە گـەڕەکی سێتاقان، واتە بەشی ڕۆژهـەڵاتی شـاری هـەولێر، حوجرەیـەکی بچـووک بـووە و ژمارەیـەک قوتـابی وانـەیان لـە لایـەن پێشـنوێژ و وتـارخوێنی مزگەوتەکە (مەلا شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ محەمـەد ئـەمین زیخـانی) پێدراوە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٣).

**١٢- قوتابخانەی مزگەوتی حاجی عەبدولقادری شنۆیی :**

ئـەو مزگەوتـە دەکەوێتـە گـەڕەکی شـۆڕش، واتـە بەشـی بـاکووری شـاری هـەولێر، ئـەو مزگەوتـە بـە مزگـەوتی (سـپی)ش ناسـراوە، حوجرەیـەکی بچـووکی لـە خـۆ گرتـووە کـە لـە لایـەن پێشـنوێژ و وتـارخوێنی مزگەوتەکـە (مـەلا عەبـدوڵڵا کـوڕی مـەولوود) سەرپەرشـتی کراوە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٣).

**١٣- قوتابخانەی مزگەوتی سەید غەریب :**

ئـەو مزگەوتـە کەوتۆتـە گـەڕەکی سـێتاقان لـە بەشـی ڕۆژهـەڵاتی شـاری هـەولێر، (مـەلا بەهائـەدین خـەتێ) کـە پێشـنوێژ و وتـارخوێنی مزگەوتەکە بووە، وانەی تێدا داوەتەوە. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص٢٣).

وێـڕای هـەموو ئەوانـە، زوبێـر بیلالـی مێژوونـووس نـاوی ئـەو قوتابخانە و حوجرانەی کە کەوتوونەتە دەرەوەی شـاری هـەولێر، واتـە شـارۆچکە و گونـدەکانی دەوروبـەری هەولێریشـی بـۆ تۆمـارکردووین، لەوانـە قوتابخانـەی حـوجرە و مزگەوتـەکانی (شـەقڵاوە، خۆشـناوەتـی،

مـاوەران و روانـدز، باڵەکایـەتی، کۆیســەنجەق، مــەخموور، قــەراج و کەنـدێناوە، ئـەو شـوێنانەش لـە خوێنـدنی ئـایینی دانـەبڕاون و ڕۆڵێکـی باڵایان بینیوە لـە پێگەیاندنی زانـا و خوێندەوارانی کـورد. (بـۆ زانیـاریی زیاتر لە بارەی ئەو قوتابخانە و حوجرانە بڕوانـە: اسـماعیل، ١٩٨٤، ص ٢٤-٢٦) .

**سێیەم / مەقامبێژ و مەولوودخوێنەکانی شاری هەولێر :**

هەر لە ڕۆژگاری سوڵتان موزەفەرەدین گوگبوری هـەولێر بووەتـە مەڵبەندی مەقامبێژ و مەولوودخوێنی ناودار، سـاڵانە یـادی لـەدایکبوونی پێغەمبـەری موسـڵمانان محەمـەد (د. خ) زینـدوو کردووەتـەوە، تەنانـەت ئـەو یـادە سەرمەشـقی لـە هـەولێر بـووە، وا لێرەدا ئامـاژە بـە هەنـدێ لەوانەی زوبێر بیلال بەسەری کردوونەتەوە دەکەین :

**١-** یــەکێک لــە کــۆنترین ئــەو موزیکژەنانــەی کــە لــە ســەدەی نۆزدەیەمی زاینی ژیاوە، (**شێخۆ کەمانچەچی**) هەولێرییە، کە ناوی خۆی (شـێخ یـونس)ە . ئـەم هونەرمەنـدە ئـامێری کـەمانی دروسـت دەکـرد و ژەنیاریش بووە، کۆنترین ژەنیاری کەمان بووە لە هەولێر و پێش ساڵی (١٨٥٠) زاینی ژیاوە بە (کەمانچەچی شێخۆ یا شێخۆ کەمانچەچی) ناوی دەرکردووە. (ئیسماعیل ، ٢٠٠٠، ل ١٨١).

**٢- شــەهابەدین ئەحمــەد،** ناسـراو بـە (شــەهابە) ، لـە ســەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی گۆرانیبێژێکی ناسراو بوو، هەر بە منداڵی دایک و باوکی لە دەست داوە و خۆی بە تەنها دەمینێتـەوە و لـە هـەولێر هـیچ شوێنێک شـک نابات بـۆ ئـەوەی لێـی نیشـتەجێ بێت ، تـاوەکو (محەمـەد عوسـمان مـوفتی) لـە حوجرەیـەک لـە حوجرەکـانی مزگـەوتی گـەورەی قەڵات نیشتەجێی دەکات و خۆشی بەخێوی دەکات و ئاگای لێی دەبێ تا کـەمێک بـارودۆخی دارایـی بـاش دەبـێ، ئینجـا بـۆ خـۆی خانووێـک لـە گەڕەکی عارەبان بە کرێ دەگرێ . ئەو کات شـەهابە هاموشـۆی لەگـەڵ هونەرمەنـدە هەولێرییـە ڕەسـەنەکانی وەک:(ڕەئـووف ئیبـراهیم قـائلی و تاهیر حەلانی (پتۆ) و شەوکەت (مشکۆ) و (جەمیل کەبابچی) هەبووە، لە

شێوازی گوتنی مەقامەوە هەردوو مامۆستا (عەلی مەردان) و (مەلا محەمەد کۆر) مامۆستای بوونە . شەهابە مەقامی بە زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی دەگوت و قۆریاتیشی گوتووە، شەهابە ساڵی (١٩٣٨) لە رۆژی یەکەم یان سێیەمی جەژنی قوربانی پیرۆزدا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (مەلا ئەبوبەکر باپیری مەلا فەندی هەولێری) پشت گۆڕستانی شێخەڵلا نێژراوە. (ئیسماعیل ، ٢٠٠٠، ل ١٨٣) .

**٣- مەولوودخوێنانی هەولێر** : لە رۆژگاری شەهابە گەلێ تیپی تایبەتی سەبارەت بە خوێندنی مەولوود هەبوون لەوانەش دیارترینیان :

**تیپی عەلی کۆر:** خەڵکی هەولێر بووە، لەگەڵ حاجی عەبدوڵڵا دەروێش یونسی خوارزای قەسیدەکانی دەخوێندەوە و عەلی کۆر خاڵی حاجی عەبدوڵلای دەفژەن بووە، ئەدای مەقام و ستایشەکانی پێغەمبەری دەکرد، شیعری ئایینی و قۆریات و دیوانی (ئورفە)ی گوتووە و هەروەک شەهابەش دەیتوانی بە زمانەکانی (کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی) بخوێنێت. (ئیسماعیل، چلاوان، ژ(٣٢)، ٢٠٠٨، ل ٧)، ئەندامانی تیپەکەی عەلی کۆر ئەمانە بوون :

١- حاجی عەبدوڵڵا دەروێش یونس: دەفژەن بوو، وەک بە ناوبانگترین کەسایەتی سازدانی مەولوودی پێغەمبەر (د. خ) دەرکەوتبوو .

٢- مەجمەل خەبباز : دەفژەن .

٣- ئەحمەد دەروێش برای حاجی عەبدوڵڵا، ئەویش دەفژەن بووە .

٤- رەفیق نەدداف : دەفژەن .

٥- سەید فەتاح : دەف و تەپڵ ژەن .

٦- حاجی وەلی چایەچی : لە بن قەڵاتێ نزیک مزگەوتی حاجی عەبدولقادر دەباغ خاوەن چایخانە بوو، ئامادەبوونی ئەو لەگەڵ تیپی عەلی کۆر زۆر گرنگ بووە، چونکە قۆریات و بەستەی دیوانی بە تورکی دەگوت، کاتێ لە چایخانەکەی خەریکی کارکردن بووایە، ئەوە بە

دەنگە بە سۆزەکەی خۆی گۆرانی دەگوت بۆ ئەوەی خەڵکی بۆ لای خۆی رابکێشێت، گەلێ جاران هەندێ گۆرانیبێژ و موزیکژەنان بە تایبەتی ئەوانەی لە مووسڵ عوودژەن بوون، ئەدای هەندێ گۆرانییان بۆ دەکرد. دواجار حاجی وەلی لە دەوروبەری ساڵانی ١٩٣٢ کۆچی دوایی کرد. (ئیسماعیل ، چلاوان، ژ(٣٢)، ٢٠٠٨، ل ٧-٨) .

**٤- ئەو مەقامخوێنانەی هاتوونەتە هەولێر :**

**١- سەید مەردان:** خەڵکی کەرکووک بوو، کاتی خۆی مەلا ئەفەندی بۆ مەبەستی ئەوەی ببێتە قورئانخوێنی مزگەوتی قەڵات، بانگهێشتی کردبوو، سەید مەردان بە قورئانخوێنێکی باش ناسرابوو، بە تایبەتی لە شێوازی تەجوید زۆر شارەزا بووە، وێڕای ئەوەی شارەزای زۆری لەبارەی مەقامی عێراقی هەبووە، پێش جەنگی یەکەمی جیهانی هاتۆتە هەولێر، مەلا فەندی ژوورێکی لە مزگەوتی قەڵات بۆ دەستنیشان کردووە، وەک حوجرەیەک بووە بۆی، قورئانخوێن و مەولوودخوێن و مەقامبێژەکانی تێدا کۆ دەبۆوە، لەوانەش شەهابە، سەید مەردان دەستخەتی زۆر خۆش بووە، زۆربەی کتێبەکانی مەلا فەندی نووسیوەتەوە. مۆڵەتی خوێندنەوەی قەسیدەی بە گەلێ قوتابی بەخشیوە و لە ژێرەوەی مۆڵەتەکان واژووی دەکرد و دەینووسی (خادمی دەرگای مەردان- مەردان) . لە کۆتاییەکانی تەمەنی دەنگی کز ببوو، لەگەڵ ئەوەی جوانی و هەیبەت هەر لە دەنگی مابۆوە، وەک دەنگی شێخ محەمەد ڕەفعەت کە شێخی قورئانخوێنەکانی میسر بوو. دواجار سەید مەردان لە ساڵی (١٩٥١) کۆچی دوایی کرد و لە هەولێر نێژراوە. (ئیسماعیل ، چلاوان، ژ(٣٢)، ٢٠٠٨، ل٨) .

**٢- مەلا محەمەد مووسڵی :** لە مانگی ڕەمەزانان دەهاتە هەولێر لە مزگەوتی قەڵات نیشتەجێ دەبوو، بانگی دەدا و قورئانیشی دەخوێند و خەریکی مەولوود خوێندنیش بوو .

**٣- مەلا محەمەد کۆر** : بە ئەحمەد یا مەلا ئەحمەد کۆریش بانگ دەکرا، خەڵکی کەرکووک بوو، جاران لەسەر داوەتی محەمەد موفتی دەهاتە هەولێر، ئەو مەلا محەمەدە بە تەمەن بوو، بە تورکی قسەی دەکرد، ساڵی (١٩٣٠) هاتۆتە هەولێر و مەقامی (راست)ی لە مەجلیس و کۆڕی موفتی خوێندووە، کە شەهابەش تێدا ئامادە دەبوو، ئەویش مەقامی (راست)ی ئەدا دەکرد .

٤- مەقام خوێنەکانی هەولێر :

١- مەلا نادر سەعاتچی

٢- مەلا نادر بستانچی

٣- عەلی محەمەد مستەفا

٤- حاجی فایەق بەزاز (بازرگان)

٥- محەمەد محیەدین عەتار

٦- عەلی کەبابچی

٧- سەید ئیبراهیم سەید رەمەزان

٨- سەید ئیسماعیل سەید عەزیز

٩- نورەدین مەلا نادر سەعاتچی. (ئیسماعیل ، چلاوان، ژ(٣٢)، ٢٠٠٨، ل٨).

**تەوەری سێیەم : ڕێبازی زوبێر بیلال لە نووسینی مێژوودا :**

ڕێبازی توێژینەوەی مێژوویی مەبەست لێی پشکنین و لێکدانەوەی ورده بۆ تۆمارەکانی کۆن و شیکردنەوەی بەڵگەنامەکان، ئەم ڕێبازە گرنگی بە تۆمارکردن و وەسفکردنی ڕووداوەکانی ڕابردوو دەدا، لەسەر بنچینەیەکی زانستی و بابەتی شییان دەکاتەوە، ئامانج لەوەش تێگەیشتنە لە ئێستا و پێشبینی کردنە بۆ داهاتوو. (عومەر، ٢٠١٩، ل٢١).

**یەکەم : چەمکی مێژوو لای زوبێر بیلال :**

سەبارەت بە چەمکی مێژوو گەلێ بیر و بۆچوون و لێکدانەوەی جیاجیا هەیە، چەندان پێناسەی بۆ داندراوە. لە دیدی زوبێر بیلال ئامانجی چەمکی مێژوو بریتییە لە تەیارکردنی کۆمەڵانی خەڵک بۆ ئەوەی لە ڕابردوو بگەن و سروشەی پەند و عیبرەتی لێوەرگرن و ئەوەشیان لەبەر چاو بێ کە ڕۆژی ئەمڕۆیان بەردەوامبوونی ڕابردوویانە و ئاماژەش بۆ پاشە ڕۆژیان دەکات. (ڕامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧، ل ٤٧). بۆ مێژووی کوردیش، وەدەرخستنی دەوری مێژووی کورد یەکجار گرنگە، تا کەسایەتی سەربەڕی خۆیان بە دەرخەن، هەروەها ئەوەش دەڵێت کە ئێمە ناتوانین پێوانەی ڕابردوو لەسەر ئەمڕۆمان فەرز بکەین و بە پێچەوانەشەوە، چونکە ناکرێ بە پێوانەی ئەمڕۆ حوکم لەسەر ڕووداوەکانی ڕابردوو بدەین. زوبێر بیلال ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە دەڵێن (مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە)، پێی وایە ئەمە زۆر تەواو نییە، هەرچەندەش ئەنجام و هۆکارەکانیش لە یەک بچن، چونکە ئەو هۆکارانە و ئەنجامەکانیان، بەندی قۆناغێکی دیاریکراون و نیشانەی پاشەڕۆژ یا ئەنجامەکانیان، هەر بەتەواوی لەیەک جیاوازن، ژیانی مرۆڤیش بەردەوام لە پەرەسەندن و پێشکەوتندایە و ناکرێ ڕەوڕەوەی ئەو ژیانە بۆ پاشەوە وەرچەرخێ .(ڕامان، ژ(١٢)،١٩٩٧ ، ل ٤٧) .

زوبێر بیلال قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی نەتەوەی کوردی بەم شێوەیە دابەش کردووە :

١- قۆناغی چاخەکانی بەر لە مێژوو، کە بۆ چاخەکانی بەردینی کۆن و ناوەڕاست و هاوچەرخ دابەش دەکرێ .

٢- چاخەکانی مێژوویی، ئەمیش لەو ماوەیە دەستپێدەکات کە مرۆڤ، چ لەسەر قوڕ یا لەسەر کەڤر بە خەتی بزماری ڕووداوەکانی ڕۆژانەی خۆی لە سنووری (٣٥٠٠) ساڵەی پێش زایین بە زمانە کۆنەکان تۆمارکردووە، دەشکرێ بە مێژووی هۆزەکانی زاگرۆس وەک (لوولوو، گوتی، کاسی، هوری)دا بچینەوە و کورد بە ڕەچەڵەکی ئەوان دابنێین، سەرباری ئەو هۆزانەی کە زۆر زۆر لە کوردەوە نزیکن وەک (نایری، مەنایی، میدی، کاردۆخی). (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧، ل ٤٧) .

دیارە چاخەکانی مێژووش بۆ کورد بریتیین لە :

١- چاخی بەردین: بریتییە لە مێژووی دەوڵەتی میدیا و دارمانی ئەو دەوڵەتە لە ساڵی (٥٥٠)ی پ. ز، هەروەها قۆناغەکانی داگیرکردنی کوردستان لە لایەن بێگانەکانەوە، وەک سەردەمی (ئەخمینی) و (یۆنانی) و (پەرتی) و (ساسانی). ئەم چاخە دێرینەش لە ساڵی (٤٧٦ ز) کۆتایی دێ، یا بە لەدایکبوونی پێغەمبەر (د. خ) لە ساڵی (٥٧١ ز) لەم قۆناغانەدا کوردستان گەلێ ڕووداوی گرنگی بەخۆیەوە دیوە .

٢- چاخەکانی ناوەڕاست: ئەمە لە ساڵی (٥٧١) زایینییەوە دەستپێدەکات تا ڕووخانی قوستەنتینیە لە ساڵی (١٤٥٣ز) دا. لەم چاخانەشدا گەلێ حکومەت و میرنشینی کورد لە کوردستان دامەزراوە، وەک (حکومەتی هەزبانی و شەدادی و حەسنەوی و مەڕوانی و عەنازی و لوڕی و ئەیووبی) .

٣- چاخەکانی هاوچەرخ: ئەمەیان لە سنووری (١٥٠٠ ز)دا، یا دوای ئەو سەری هەڵداوە و گەلێ میرنشینی وەکو (سۆران، بابان، بادینان، بۆتانی) دامەزراون، مێژووی نوێی کوردستانیش گەلێ ڕاپەڕینی بە خۆیەوە گرتووە و ویستوویەتی خۆی لە بن دەستی دەوڵەتی عوسمانی ڕاپسکێنێ و سەربەخۆیی کورد جاڕبدا، وەک ڕاپەڕینی محەمەد پاشای ڕواندزی و ئەورەحمان پاشای بابان و

بەدرخان پاشا و شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی. لە سەرەتای سەدەی بیستیش راپەڕینەکەی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، هەروەها دەکرێ ڕووداوە مێژووییەکانی دوای کودەتای تورکی لە ساڵی ١٩٠٨ و دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بە مێژوویەکی هاوچەرخ ئەژمار بکرێ، جێگەی رامانیشە دابەشکردنی مێژوو بۆ سەر چەند قۆناغێک وەک دێرین و ناوەڕاست و هاوچەرخ، بۆ یەکەم جار لە چاخی راپەڕینی ئەورووپاوە سەری هەڵدا (اسماعيل، ١٩٧١، ص ٣٨ وما بعدها) ؛ (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧ ،ل ٤٧) .

لە تێڕوانینی زوبێر بیلالدا شێوازی ڕێبازی نووسینی مێژوو لە قۆناغی هاوچەرخدا بەندە بە شەن و کەوکردنی ڕووداوەکان و بە بەندیواریی هۆکارەکان بە دەرئەنجامەکانەوە، هەروا ئاوێزانیی ڕووداوەکان بەیەکترییەوە، لەگەڵ ئەوەش مێژوونووسی هاوچەرخ لە کاتی نووسینەوەی قۆناغێک لە مێژووەکەی خۆی، بۆی نالوێ تێڕوانینێکی سەربەخۆ و بابەتییانە بۆ خۆی دروست بکات، بەڵام بۆی دەلوێ ئەو مێژووە بکاتە ئاوێنەیەکی باڵانوما، کە تێیدا بیر و بۆچوون و هزر و هەستی کۆمەڵانی خەڵک بەرامبەر ڕووداوەکانی چاخەکەی خۆیان و پەیوەندییە جۆربەجۆرەکان بنوێنێ، مێژوونووسیش تەنها (گرۆندیک)ێک نییە بۆ تۆمارکردنی ئەو ڕووداوانە، بەڵکو شایەدی ئەو چاخەیە، واتە زیادکردنی شتێکی تازە یا نویشکێک بێ لێتوێژینەوە، یا وەرگرتنێکی کوێرانە لە ڕۆژهەڵاتناسە لایەندارەکان، ئەوا هەر هەموویان مەبەست ناپێکن و ڕوویێکی ڕاستەقینە و ڕاشکاو بۆ مێژووی کورد و کوردستان نادەن بە دەستەوە. (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧ ،ل ٤٦). لە لایەکی دیکەوە بە بۆچوونی مێژوونووس زوبێر بیلال ئەوەی مێژوونووسی کورد نەینووسیوە مێژووی کورد نانوێنێ، کوردیش ناتوانێ ڕەگ و ماکی خۆی تیایاندا بدۆزێتەوە و ناشتوانن بۆ حەقیقەت و بوون و شوێنی کورد لەم جیهانە جەنجاڵەدا ڕێنمایی بکەن، مەسەلەی گەڕانەوەش بۆ ڕەگ و ماکی مێژوویی، مانای وایە سەرلەنوێ و بە تێڕوانینێکی نوێوە ئەو ڕابردووە بخوێندرێتەوە و مێژوونووسیش ببێتە

شایەدی چاخەکەی خۆی، چونکە ئەویش پاژێکە لەو چاخە، ئا ئەوە تاکە ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە "روحی چاخ" و بە سروشت و لێکۆڵینەوەی ئەو روح و سروشتە، وەک ئامرازێک بۆ تێگەیشتنی لە رابردووەکەی خۆی، هاوکات زوبێر بیلال پێی وایە ئێمە تا ئێستا هیچ قوتابخانەیەکی مێژوویی کوردیمان نییە کە دەبێ هەبێ، بەڵام پێداویستییەکی زۆر و توانایەکی زۆرتریشی بە شێوازی زانستی و بە توانستی ماددی و بە هەناسە درێژی و بە دڵسۆزی هەیە، بە واتایەکی دیکە بارودۆخی خۆیی و بابەتییانە، هێشتا کۆسپ و بەربەستن لە ڕێی سەرهەڵدانی قوتابخانەیەکی کوردی لە مێژوودا. (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧ ،ل ٤٧) .

سەبارەت بە ئەدگار و خاسیەتی مێژوونووسی لێکۆڵەر، زوبێر بیلال دەڵێت : دەبێ مێژوونووس زۆر بە چاکی و قووڵی لە بابەتی نووسینەکەی خۆی بگات، لێکۆڵینەوەکانیشی رەسەن و زانستییانە بێ، بە ئەمانەت و دەسپاکییەوەش لە رووداوە مێژووییەکان بدوێ و خۆی لە دەمارگرژی و چەواشەکردن و سەر لێشێواندن و زێدەڕۆیی دوور رابگرێت، هیچ راستییەک نەشارێتەوە و قەناعەتی تەواویشی بەوەی هەبێ کە دەینووسێ، دەبێ چلچرای دەستی مێژوونووس راستگۆیی و ئەمانەت بێ لە تۆمارکردنی رووداوەکاندا، هەروا دەبێ خۆی لە چەواشەکردن و سەر لێشێواندن و هەڵفریودان دوور راگرێ و ناشبێ توندڕەوی و زیادەڕۆیی بکات، چ لە ستایشکردن و چ لە زەمکردنا، دەشبێ رووداوەکان چۆنن، ئاوا بەڕاستی هەڵیانبخا، چونکە لە رووداوەکانی مێژوودا گەلێ دەرس و پەند و عیبرەت هەیە. (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧ ، ل ٤٦). لە پاڵ ئەمەشدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کتێبخانەی مێژوویی کوردی زۆر خاکەڕایە و دیکۆمێنتی مێژوویی بە زمانی کوردی زۆر زۆر کەمی تێدایە، واتە تا ئێستا کێڵگەیەکە و نەکێڵراوە و پێداویستییەکی زۆری بە هەوڵ و کۆششی پسپۆران هەیە، بەڵام وەک دیارە ئەم مەسەلەیە گەلێ کۆسپ و تەگەرەی لەبەردەمدایە، چ خۆیی و چ بابەتیی، لەگەڵ ئەوەشدا مێژوونووس زوبێر بیلال پێی وایە کە ناشێ

ئەرکی پڕ لەبەر ئەو تاکە کەسانەش لەم کێڵگەیەدا فەرامۆش بکرێ وەک هەوڵەکانی (علاءالدین سەجادی) و مامۆستا (مەلا جەمیل رۆژبەیانی) و (دکتۆر کەمال مەزهەر)، لەم بوارەشدا دکتۆر کەمال مەزهەر یەکێکە لە رابەرانی لێتۆژینەوەی مێژوویی هاوچەرخی کورد، نووسینەکانیشی خاسیەت و ئەدگاری رەسەنایەتی و مەوزووعیەتی تێدایە کە ئەمەش دوو مەرجی سەرەکین لە نووسینەوەی ئەکادیمییانەی مێژوودا. (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧ ،ل٤٧). هەر لەم بارەیەوە دەریخستووە کە رووداوە مێژووییەکان ناکرێ لە بارودۆخی دەوروبەر جیا بکرێتەوە جا چ لایەنی ئابووری بێ یا سیاسی یا کۆمەڵایەتی یا جوگرافی، چونکە شێوازی زانستییانە لە تۆمارکردندا بەندە بە لێکدانەوەی رووداوەکان و شەن و کەوکردنیان و زانینی هۆ و ئەنجامەکانیان، لە پاشان شەن و کەوکردنی ئەو رووداوانە بە یەکتری و بە باری ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتییەوە، ئینجا نووسینەوەی لەبەر رۆشنایی باری بۆچوون و سەرنجێکی هاوچەرخانەدا، ناشبێ مێژوونووس لە دەرەوە سەیری مێژوو بکات، بەڵکو دەبێ شۆڕبێتەوە نێو رووداوەکان. (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧،ل ٤٦-٥١) .

سەبارەت بە رۆڵی تاک لە مێژوودا و هاوکات لە وەرچەرخاندنی رووداوەکان بۆ بەرژەوەندیی گەلەکەی دەڵێت : ناتوانین نکووڵی لە رۆڵی سەرکردەی ناودار و خاوەن فەلسەفە و تیۆری و رێنماییە ئاینییەکان و زانا و پیاوە ناودارەکانی کۆمەڵایەتی و سەرکردە گەورەکانی سەربازی و شۆڕشە میللییەکان و یاسادانەرە مەزنەکان و رزگارکەرانی کۆیلە و سیاسییە دیار و پزیشکە باڵادەستەکان بکەین، چ لە ژیانی کۆمەڵگەکەی خۆیان و چ لە وەرچەرخاندنی رەوتی مێژوویی گەل، بەڵکو رەوتی سەرجەمی دونیاش، بە چەشنێک تا بە (لینین)یش دەگات، هەرچەندە دەوری بزاڤی (ناردەییەکان)ی رەفز دەکرد کە لە رووسیادا و لە چارەگەی دوایی سەدەی نۆزدەهەم لە کایەدا بوون، بەڵام ئەوەی سەلماند کە (گەل خوڵقێنەری مێژووە)، بەڵام (سەرکردەی

گەل)یش دەوری دیاری خۆی لەم پرۆسەیەدا هەیە، چ لە تێگەیشتنی یاسا مەوزووعییەکانی کۆمەڵ و چ لە تێگەیشتنی بەرژەوەندییەکانی ئەو کۆمەڵە. (خەبات ، ١٩٩٧)

ئەوەی پەیوەستیشە بە راڤە جۆربەجۆرەکانی مێژوویی، زوبێر بیلال لە ژێر رۆشنایی پێناسەکەی (ئیبن خەلدوون) بۆ مێژوو دەڵێت: ناکرێ مێژوونووس لە بەرژەوەندی و لە سۆزو گۆدازی خۆی ببڕای ببڕ دابڕین، هەر بۆیە هەموو ئەو شرۆڤانەی بۆ مێژوو کراوە شتێکی نیسبین و قابیلی لێکۆڵینەوەن و لەوانەشە کاتی بن، چونکە هەر شرۆڤەیەک چارەسەری لایەنێکی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵ دەکات، چ لە لایەنی ماددییەوە بێ چ لە لایەنی رووحی و ئاوەزەو ە، بێگومان سروشت و ماددە و ئاوەز و مرۆڤیش رۆڵی خۆیان لە ژمارەیەک لە تەوەرەکانی ئەو شرۆڤەکردنەدا هەیە. (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧ ، ل٥٠) .

**دووەم : رێبازی لە نووسینی مێژوودا :**

لە سەدەی بیستەم رێبازی زانستی لێکۆڵینەوەی مێژوو جێ پێی خۆی قایمتر کرد، سەرچاوەی رەسەن و ژمارە و سەرژمێر بوونە شێرازەی لێکۆڵینەوە، مێژوونووسان زیاتر کەوتنە سۆراخی هۆ بزوێنەرە نەبینراوەکانی رووداو، پاشایان و سەرداران جێگەی شیاوی خۆیان وەرگرت، نە زۆریان پێ دراو نە لێشیان کەم کرایەوە، باسی نوێ هاتە کایەوە، وەک بزووتنەوەی کرێکاران و جووتیاران و رووناکبیران و ناکۆکییەکانی ناو چین و دەستەکانی کۆمەڵ و رۆڵی زانایان و ناودارانی کورد لە ئاراستەکردنی کۆمەڵگەی کوردی، هاوکات مێژوونووسانی سەردەمی نوێ زۆر لە جاران زیاتر کەوتنە بایەخدان بە ژیانی کۆمەڵایەتی وەک ئاوێنەی راستەوخۆی رووداوی مێژوویی کە لایەنی سیاسی تەنها یەکێکە لە رووە هەرە گرنگەکانی نەک زیاتر، (ئەحمەد، ٢٠٠٨،ل ٨٤).

شایەنی ئاماژەپێکردنە، دوای جەنگی دووەمی جیهانی، لەگەڵ وریابوونەوە و پەرەسەندنی هەستی نەتەوەییدا، رووناکبیرانی کورد بە

جۆرێکی قووڵتر لە جاران کەوتنە هەڵسەنگاندنی مێژوو، دیارە دەبوو مێژوونووسی کوردی لەو قەوارە تەسکەی پێش خۆی نەمێنێتەوە، تایبەت دوای ئەوەی ژمارەی تینووانی زانینی رابردووی گەل تا دەهات پەرەی دەسەند، بەم جۆرە ژمارەیەک رووناکبیری لێهاتووی خولیای مێژووی نیشتمان کەوتە سەریان، (ئەحمەد، ٢٠٠٨،ل ١٥٣). بێ هیچ گومانێک مامۆستا زوبێر بیلال بە یەکێک لە سەردەستەیان دادەنرێت .

یەکێک لەو بوارە گرنگانەی پێویستی بەقووڵبوونەوە و وردەکاری و ساغکردنەوە هەیە، بواری مێژووە. نووسین و توێژینەوە لەبواری مێژوودا، ئەرک و بەرپرسیاریەتییەکی ئاکاری و کۆمەڵایەتی گەورەیە. چونکە لەرێگەی مێژوو، ئێمە ئاشنای ڕابردوو، ڕووداو و دیاردەکانی ژیانی پێشووترمان دەبین. لەمێژوودا، گرنگترین بنەما کە پێویستە رەچاو بکرێت، بێلایەنی و سەربەخۆبوونە. واتە نووسینەوەی ئەوەی هەیە وەک خۆی نەک ئەوەی نووسەری مێژوو دەیەوێت. لە بنەڕەتیشدا، نابێ ئەوەمان لەبیربچێت کە مێژوو ئەوەیە کە ڕوویداوە، نەک ئەوەی کە دەگێڕدرێتەوە. ئەو کەسەی مێژوو دەنووسێت دەبێت دادگەر بێت و بێ لایەنانە ڕووداوەکان تۆمار بکات، نابێت بکەوێتە ژێر کاریگەریی هەوا و ئارەزووی تایبەتی خۆیی و بەو پێوەرە ڕووداوەکان تۆمار بکات، هەروەها نابێت بە پاڵنەری مەزهەب و ئایدۆلۆژی تایبەتی خۆی ڕووداوەکان لێک بداتەوە، ئەگەر مێژوونووس بێلایەنیی خۆی لەدەستدا و بەرێبازی زانستی و ئەکادیمی ڕووداوەکانی تۆمار نەکرد ئەوە هەموو نووسین و لێکۆڵینەوەکانی جێگەی گومانن و وەرناگیرێن، لەم لایەنەوە مێژوونووس تا رادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بووە و ناوەڕۆکی بەرهەمەکانی بە روونی رەنگی داوەتەوە، کە خۆی باوەڕی تەواوی پێی هەبووە.

لەمیانەی خستنەڕووی بەرهەمەکانی زوبێر بیلال روونبوویەوە کتێبخانەی مێژوویی خوێندووەتەوە تاوەکو سەردەمی خۆی، ئەمەش وەهای کردووە شیاو بێ بۆ نووسینەوەی ئەم کتێبە بەنرخانەی. زوبێر

بیلال بەباشی زانیوە زۆرێک سەرچاوە باس بکات کە لە کتێبەکانیدا بەکاریهێناوە دەکرێ ئەمانەی خوارەوەش تێبینی بکەین :

یەکەم: زوبێر بیلال مێژووی بەپێی بابەت پۆلێن کردووە، نەک بەپێی رووداو و ساڵەکان.

دووەم : زوبێر بیلال پشتی بەستووە بە وەسفی وردی رووداوە مێژووییەکان.

سێیەم: لە زۆربەی نووسینەکانیدا بەڵگەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پیرۆزی هێناوەتەوە، هەروەها هێنانەوەی دێڕی شیعر.

چوارەم: بەشێوەی گشتی وشەی ئاسانی بەکارهێناوە و وردبینیی خستووەتە سەر دەق (مـتن)ی هەواڵ، لە ڕووی دوور درێژییەوە جیاوازیی لەنێوان هەواڵەکانیدا هەیە، هەندێکی دوورودرێژە لەلایەنی سیاسییەوە و هەندێکیشی کورتە کە چەند دێڕێک تێناپەڕێنێ.

پێنجەم: هەروەک ڕێبازی ئەو تایبەتمەندە بەڕەخنەکردنی گێڕانەوەکان و تەنیا گێڕانەوەکانی کۆ نەکردووەتەوە. (اسماعیل، الثقافة، ع(٧)، ١٩٨٠ ، ص١٠٠-١٠١)، قەبارەی گێڕانەوەکانیش جیاوازن بەپێی زۆر و کەمی و گرنگی و بەو پێیەش درێژ و کورت ئەبنەوە، هەندێکی لاپەڕەیەک یان دوو لاپەڕەیە و هەندێکی تریش زیاتر لە پێنج لاپەڕە، ئەگەر رووداوەکەش دوورودرێژ بێ ئەوە بەپێی ساڵ دابەشی ئەکات. شێوازیشی لەباسکردنی رووداوەکاندا یەک جۆر نییە، هەندێ جار رووداو دەگێڕێتەوە ئینجا دەچێتە سەر وردەکارییەکانی و گێڕانەوەکان، هەندێ جاریش رووداوەکانی ئەو ساڵە ئەگێڕێتەوە ئینجا یەک بەیەک باسیان ئەکات و لەکۆتایی ئەو ساڵەدا باسی مردنی کەسە بەناوبانگەکان ئەکات.

شێوازی نووسینی مێژوویی لای زوبێر بیلال بە بەراورد بەوانەی سەردەمی خۆی پێشکەوتوو بووە و لە هەواڵی مێژووییدا و تەنیا سەرچاوەی هەواڵ و رووداوە مێژووییەکەی هێناوەتەوە، پێشەکی کتێبەکان و ناوەڕۆکەکانی شێوازێکی ئاسانە و سەجع ئامێز و گران

نییە و گرنگیی خستووەتە سەر زمانی دانەرانی سەردەمی خۆی و پێشتر و بەزمانی خەڵکی گشتی نەینووسیوە و وشەی ئاڵۆزی بەکارنەهێناوە کە تێگەیشتنی بۆ خوێنەر گران بێ.

زوبێر بیلال لە نووسینەکانیدا تەنیا گوازەرەوەی هەواڵ و تۆمارکەری رووداو نییە، بەڵکو لێکۆڵەرەوەیەکی لێهاتوو و رەخنەگرێکی بەرچاو روونیش بووە، هەوڵی شیکردنەوەی هەندێ دیاردە و رووداوی مێژوویی و رەخنەی خاوەن سەرچاوەی هەواڵەکانی کردووە و زۆرێک هەواڵیانی گفتوگۆ کردووە، بۆیە دەبینی زۆر سادە و بێ زۆر لەخۆکردن لەدووتوێی کتێبەکانیدا رەخنەی سیاسی و جەنگی و ئەخلاقی و کردەیی دەبینی، ئەوەیە وەهای کردووە بۆ هەمیشە کەسێتییە روونەکەی لە کتێبەکانیدا بەتەواوی ببینی. (اسماعیل، الثقافة، ع (٧)، ١٩٨٠ ، ص١٠٢).

بێگومان گرنگیی بەرهەمەکانی ئەم مێژوونووسە لە گرنگیی ئەو زانیارییانەدایە کە لە خۆی گرتووە، زۆر لە زانیارییەکان لە بارودۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ژیانی زانستییەوە لە خۆ گرتووە.

**یەکەم/ لایەنی ئابووری:** لێرەدا دەبینین زوبێر بیلال بایەخدانێکی باشی بە بارودۆخی ئابووری داوە، یەکێک لەو زانستە گرنگانەی یارمەتی مێژوونووس دەدات، زانستی ئابوورییە، چونکە کاریگەری گەورەی لەسەر رێرەوی مێژوودا هەیە، لەبەر ئەوەی لە زانستە بنچینەییەکانە و بە ئاگابوون لێی یارمەتیدەر دەبێ لە لێکۆڵینەوەی مێژوودا، چونکە هۆکارە ئابوورییەکان خاوەن کاریگەری بەهێزن لەسەر رێرەوی مێژوو. (عمر، ٢٠١٩ ،ل ١٧٥) . لەبەر ئەوەی ئابووری رۆڵێکی دیار دەبینێت لە رێڕەوی مێژووییدا و شۆڕشێک یا رووداوێک یان جەنگێک نییە مێژوو تۆماری کردبێت و هۆکاری ئابووری لە پشتەوە نەبێت، هەریەک لە کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی لە هۆکارە جوولێنەرەکانی مێژوون، هۆکاری سەرەکیشن لە دروستبوونی

ململانێـی نێـوان هێـزی زەحمەتکێشـی گـەل و هێـزی چەوسـێنەری بەکارهێنەر بۆ بەرژەوەندیی خۆی (عمر، ٢٠١٩ ، ل ١٧٥). دەبێ ئاماژە بۆ ئـەوەش بکـەین کـە مێژوونـووس زوبێـر بـیلال تەفسـیری مـەتریالی بـۆ مێژوو بـە یـەکێک لـە تەفسـیرە هـەرە گرنگـەکانی مێـژوو زانیـوە. (رامان، ژ(١٢)، ١٩٩٧، ل٤٨).

**دووەم : لایەنی کۆمەڵایەتی :**

زوبێـر بـیلال لــە کتێبەکانیـدا بایــەخی زۆر بــە رواڵــەتی ژیــانی کۆمەڵایەتی، بژێوی خەڵک و نەریت و بۆنە و کەژاوە و هاوپەیوەستەیی کۆمەڵایـەتییان دەدات و دەیانخاتـە بـەرباس، هـەروەهـا باسـی شـارو نەخشــە و ئاوەدانییــەکانیان دەکـات. (اسـماعیل، ١٩٩٨، ص٣٠)، خوێنـدنگا و مزگـەوت و گۆڕسـتان و کارێزەکـانیش بـاس دەکـات. (اسماعیل، ١٩٨٤، ص ١٧- ٢٧). لەمیانەی ئەوانەی کە باسکرا روونده‌بێتەوە رێبازی زوبیر بیلال لـە نووسـینی مێژووییدا گشـتگیرانە بـاس لەلایەنـە جیاوازەکـانی ژیـان دەکات، لە تەواوی ئـەو مـاوە مێژووییـەی لـە نووسـینی مێژوودا باسـی کـردووە، ئــەوەش بەڵگــەی فراوانیــی رۆشــنبیرییەکەی و شــارەزایی و توانای ئەو دەدات لەم پسپۆڕییەدا.

بەشـێکی زۆر نووسـینەکانی هـەر لـە سـەرەتـاوە بەنـد بـووە بـە مێژووی هەولێرەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا مێژووی گەلێ لـە هۆزەکانی زاگرۆسیشـی تۆمـارکردووە. (اسـماعیل، شـمس کردسـتان، ع(٣٢)، ١٩٧٥، ص ١٩- ٢٢)، دیـارە ئـەو لاکردنـەوەشـی بـۆ نووسـینەوەی مێـژووی هـەولێر و کەڵەپیاوانی هەولێر و هەروا شوێنەوارەکانی هەولێر، لەبەر ئـەوە بـووە، کە ئەم شارە زۆر دێرینە و تەمەنەکەی خۆی لە قەرەی (٨) هەزار ساڵ دەدا و هەمیشە نیشتەجێ بووە و گەلێ قۆناغی جیاجیاشی دیوە. وێڕای ئەوەش زوبێر بیلال لـە سـالانی حـەفتاکـان رووی کردۆتـە تۆمـارکردنی ئەو بابەتانەی بەندن بە مێژووی کورد و کوردستانەوە وەک (مێژووی زمــانی کــوردی) و مێـژووی هــۆزە کۆنــەکانی زاگــرۆس و مێــژووی هاوچـەرخی کـورد و مێـژووی کـورد لـە رووسـیا و یـەکێتی سـۆڤیەتی

جاران و مێژووی لوڕو لوڕستان و میرنشینی هەزبانی .. ئەو باسانەن کە زوبێر بیلال شەونخوونی بۆ دەکێشان و لاپەڕەکانی ژیانی بۆ خەرج کردوون .

سەبارەت بە پشت بەستنی بە ژێدەرە تۆمارکراوەکان بۆ مێژووی کۆن، دەڵێت : ئەوەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر کەمیی دۆزینەوەی شوێنەوارەکانی کوردستان، هەرچی مێژووی نزیکیشە ئەوا پشتی بە یادگاریی بەتەمەنەکان بەستووە. (اسماعیل، ۱۹۸۸، ص٤)، ئەمەش کارێکە هەم ئەرێنی و هەم نەرێنیشە، چونکە ئەو یادگارانە و چیرۆکخوانانە، بە شێوەیەکی تێکڕایی زۆر وردەکارانە نین، هیچ شتێکیش لە مێژوودا وەک نووسین و تۆمارکردن کاریگەری نییە، دەمێکیشە گوتوویانە "هەر شتێ کە بە قەڵەم نەنووسرێ بزر دەبێ"، هەر بۆیەش نووسین و تۆمارکردن، یادگەی هەمیشە زیندووی مرۆڤن. (رامان، ژ(۱۲)، ۱۹۹۷، ل ٥۲) .

بەردەست و هەست پێکراوەکان و بەڵگەنامە، ئەو ئامرازەیە کە مێژوونووس دەتوانێ بە هۆیەوە بە ئامانجەکەی بگات، لە نووسینەکانی تایبەت بە هەولێر زوبێر بیلال بەوە دەناسرێتەوە کە پشتی بە بەڵگە مێژووییەکان و شوێنەوار و گەواهیدەرە ماددییەکان بەستووە، بەمەش ئەو لە ڕێبازی زۆرینەی مێژوونووسان دوورکەوتۆتەوە، کە لەسەر ئەو بنچینەیە ڕێبازەکەیان گرتۆتەبەر کە ڕێبازی مێژوونووس زوبێر بیلال ڕێبازی شوێنەوارناسانی لە نووسینی مێژوودا گرتۆتەبەر. ئەو بڕوای وایە شوێنەوار هەواڵەکان و گێڕانەوەکانە، کە بە دڵنیاییەوە هۆی ئەمەش بۆ ناڕوونی و لێڵی نووسینەوەی مێژوویی دەگەڕێتەوە، کە لە هەندێ قۆناغی تایبەت نەنووسراوەتەوە و ئەمەش مانای ئەوە نییە کە مێژوونووس لە پاشماوەکانی نووسین دوورکەوتبێتەوە. بەڵکو ئەو بە ئامانجی بەدەست خستنی وردبینیی زیاتر لە نووسیندا ئەو ڕێبازەی گرتۆتە بەر. (البيضاني، البينة الجديدة، ع(١٣٦٨)، ٢٠١١، ص١٥).

زوبێر بیلال خۆی لە نووسینی هەموو سەردەمەکانی مێژووی کورد داوە، کۆن، ناوەڕاست و نوێ و هاوچەرخیش، لەمەدا دەکرێ

بگوترێ مێژوونووس زوبێر بیلال مێژوونوسێکی ئەنسیکلۆپیدیایە، کە پسپۆڕیی خۆی وەک شوێنەوارناسێک لێکداوەتەوە لەگەڵ بایەخدانی وەک مێژوونووسێک بۆ نووسینی مێژووی گەلەکەی و دەرخستنی راستییەکان .

سەرچاوەی نووسینە مێژووییەکانی زوبێر بیلال هی رەسەنیان کەم نین، بێگومان شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی، یەکێکە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی زۆربەی بەرهەمە مێژووییەکانی، تایبەت بەلای زوبێر بیلالەوە ئەم کتێبە لە بارەی دەوڵەت و میرنشینە کوردییەکانی چاخی ناوەڕاست و باسی ژیاننامەی شا و سوڵتان و میر و دەسەڵاتدارە سەربەخۆکان دەکات، بە چاکترین کتێب بۆ ئەو سەروبەندانە پێناسە کردووە و بە تاکە سوار و رابەری ئەو مەیدانە ناوی بردووە، تەنانەت بە سەرەتایەکی چاکی قوتابخانەی مێژووی کوردی داناوە. (اسماعیل، رێگای کوردستان، ١٩٩٥) دیارە گرنگیی ئەم کتێبە وای لە زوبێر بیلال کردووە بابەتێکی بە نرخ بە بۆنەی تێپەڕبوونی (٤٠٠) ساڵ بەسەر ئەم شاکارە ناوازە بنووسێت . (اسماعیل، رێگای کوردستان، ١٩٩٥).

زوبێر بیلال چۆتە لای گەورەپیاوانی شاری هەولێر و بەناو قەڵا و مزگەوتەکانی شاردا گەڕاوە و گەلێک یاداشتی دەربارەی دیدەنییەکانی لای خۆی تۆمار کردووە، لە پاڵ ئەوەشدا بێ وچان کەوتۆتە سۆراخی سەرچاوە کۆن و رەسەنەکان و گەلێک باس و خواس و بەسەرهاتی باوباپیرانی کۆکردۆتەوە و تەتەڵەیانی کردووە و لەگەڵ پوختەی دیدەنییەکانی تێکهەڵکێشی کردووە و بەرهەمی ناوازەی لێ هەڵچنیوە. (اسماعیل، ١٩٨٨).

**ئەنجام**

١- زوبێر بیلال لە رۆژگارێکدا لای لە مێژووی کورد کردووەتەوە کە ئەو بوارە زۆر هەژار و نووسەرانی زۆر دەگمەن بوون .

٢- لەلایەنی رۆشنبیرییەوە زوبێر بیلال بەدوای ئەو جوولە بیری و زانستی و رۆشنبیرییەدا رۆیشتووە کە لە جیهانی ئیسلامیدا روویانداوە، هەروەک سالی مردنی زانا و بیریار و خاوەن بۆچوونانی بۆ تۆمار کردووین لە شەرعناس و فەرموودەناس و واعیز و فەیلەسووف و مێژوونووس و ئەدیبان .

٣- بەشێکی زۆر نووسینەکانی هەر لە سەرەتاوە بەند بووە بە مێژووی هەولێرەوە، ئەو لاکردنەوەشی بۆ نووسینی مێژووی هەولێر و کەلەپیاوانی هەولێر و هەروا شوێنەوارەکانی هەولێر، لەبەر ئەوە بووە کە کوڕی ئەم شارەیە و ئەم شارە زۆر دێرینە و تەمەنەکەی خۆی لە قەرەی (٨) هەزار سال دەدا و هەمیشە نیشتەجێ بووە .

٤- مێژوونووس زوبێر بیلال رێبازی شوێنەوارناسانی لە نووسینی مێژوودا گرتۆتەبەر، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەی کە شوێنەوارە بەردەست و هەست پێکراوەکان و بەلگەنامە، ئەو ئامرازانەن کە مێژوونووس دەتوانێ بە هۆیەوە بە ئامانجەکەی بگات .

٥- بەرهەمەکانی تایبەت نییە بە یەک لایەن و سەردەم، بەلکو کۆکراوەیەک لە نێوان مێژووی کۆن بە قۆناغەکانی و مێژووی ئیسلامی و مێژووی هاوچەرخی نووسیوە، ئەمەش تایبەتمەند و جیاکارییەکی ترە کە پێی دەناسرێتەوە، لەمەدا دەکرێ بگوترێ مێژوونووس زوبێر بیلال مێژوونووسێکی ئەنسیکلۆپیدییە.

٦- زوبێر بیلال لە نووسینەکانیدا تەنیا گوزەرەوەی هەوال و تۆمارکەری رووداو نییە، بەلکو لێکۆلەرەوەیەکی لێهاتوو، رەخنەگرێکی بەرچاو روونیش بووە و هەولی شیکردنەوەی دیاردە و رووداوی مێژوویی داوە. ئەگەرچی رەخنەی ئەوەشی لێ دەگیرێ، کە بە تەنیا زانیارییەکانی کۆکردۆتەوە، بێ ئەوەی وەک پێویست رای خۆی لە بارەیانەوە دەربڕێت .

**پەراوێزەکان :**

١- لەساڵی ١٩٤٢ لە شاری هەولێر لە دایک بووە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٩ بە مەبەستی خوێندن چۆتە مۆسکۆ، لە ساڵی ١٩٦٧ بڕوانامەی ماستەری لە هەندەسەی کارەبایی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٧٥ دکتۆرای لە هەمان بەش لە مۆسکۆ وەرگرتووە، ناوبراو بەشداریکردووە لە دامەزراندنی پیشەسازی قورس لە عێراق وەکو کارگەکانی (ئەسکەندەریە، تاجی)، لەگەڵ ئەوەش لە بواری ئەدەب زۆر بەرهەمی هەیە و هەر لە ساڵی (١٩٦٩)وە دەستی داوەتە نووسین لە بواری ئەدەب، تاوەکو ئێستا (پێنج کتێب)ی لەو بوارەدا بڵاوکراوەتەوە و هەروەها نزیکەی (٣٠٠) توێژینەوە و وتاری لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی (الفیصل، لندن، الحیاة، الشرق الاوسط ، صوت الاخر، الاتحاد، التآخي، روز یوسف، گولان العربی، زاگروس، خەبات، رامان) بڵاوکراوەتەوە. چاوپێکەوتن لەگەڵ پ. د. جەودەت بیلال ئیسماعیل، هەولێر، ٢٠١٨/٩/٧ .

٢- لە ساڵی ١٩٤٤ لە شاری هەولێر لە دایک بووە، خەریکی پیشەی دارتاشی بووە، کارگەیەکی هەبووە بە ناوی (کارگەی ئامانج) لە بواری خوێندندا تەنیا قۆناغی سەرەتایی تەواوکردووە، لە ساڵی ٢٠٠٣ بە نەخۆشی شێرپەنجە لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە . چاوپێکەوتن لەگەڵ پ. د. جەودەت بیلال ئیسماعیل، هەولێر، ٢٠١٨/٩/٧ .

٣- مەهدی خۆشناو لە ساڵی ١٩٥٣ لە گەڕەکی تەیراوەی شاری هەولێر لە دایک بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی هەر لە شاری هەولێر تەواوکردووە، لە ساڵی ١٩٧٠ ئەندامی کۆنگرەی گشتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووە، لە ساڵی ١٩٧٢ پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە کردووە، لە دوای ساڵی ١٩٧٥ چووەتە ئێران و دوای ماوەیەک گەڕاوەتەوە شاری هەولێر، لەدوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ کراوەتە بەرپرسی ناوچەی دووی هەولێر، لە ساڵی ١٩٩٤ دەبێتە قایمقامی قەزای ناوەندی هەولێر، لە رێکەوتی ٢/١/ ٢٠٠٤ لە نێو هۆڵی بارەگای لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ دەستەیەک لە سەرکردەی پارتی دیموکراتی کوردستان تیرۆر کرا. ناوبراو هەر لەساڵی ١٩٧٠ پەیتا پەیتا شیعری لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوکردۆتەوە، لەدوای مردنیشی بەرهەمە ئەدەبیەکانی لە دووتوێی کتێبێکدا لە لایەن رێکخراوی (بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز) لە ساڵی ٢٠٠٤ بە ناوونیشانی (من لە مردندا جوان دەبمەوە) چاپکراوە. کەریم شارەزا، (شاعیر و نووسەر و خەباتگێڕی کورد شەهید مەهدی

خۆشناو ١٩٥٣-٢٠٠٤)، لە کتێبی (قاموسی ناوە نەمرەکان، ئامادەکردنی : مومتاز حەیدەری، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٤، ل ٤١١-٤١٢ .

٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ مومتاز حەیدەری ، هەولێر، ٢٠١٨/١١/٨ . مومتاز حەیدەری لە ١٩٣٨/٣/٨ لە شاری هەولێر لە دایک بووە، لە ساڵی ١٩٥٧ چووەتە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان، لە ساڵانی شەستەکاندا پەیوەندی بە حزبی شیوعی عێراقی کردووە و لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٩ وازی لە کاری حزبایەتی هێناوە، چەندین وتار و نووسینی لە بوارە جیاجیاکان لە ڕۆژنامە و گۆڤارە عێراقی و کوردستانییەکان بڵاوکردۆتەوە، لەماوەی ژیانیدا ئەندامی دەستەی نووسەرانی هەریەک لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی (کوردستانی نوێ، نووسەری نوێ، رۆشنبیر) و سکرتێری نووسینی گۆڤاری نووسەری کورد – خولی دووەم بووە، ناوبراو بۆ دوو خول وەکو سکرتێری سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان کاری کردووە، هەروەها سەرنووسەری گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی) بووە، لە ساڵی ٢٠٠٨ تا ساڵی ٢٠١٤ سەرنووسەری هەردوو گۆڤاری (k21، لەیلا قاسم)ی کردووە، ئێستا لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

٥- بەشێوەیەکی گشتی زانستەکان لە جیهانی ئیسلامیدا، دابەش دەکرێن بۆ دوو بەش: زانستە نەقڵییەکان و زانستە عەقڵییەکان، سەبارەت بە زانستە نەقڵییەکان بەرهەم و زادە و هزری کۆمەڵگای ئیسلامین، ڕاستەوخۆ بەستراونەتەوە بە قورئان و فەرموودە، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگوازرێتەوە کە ئەمانە دەگرێتەوە (علوم القرآن، علم الحديث، علم الفقه، اللغة العربية النحو و الصرف)، هەرچی زانستی عەقڵییە، ئەم زانستە بەرهەمی توێژینەوە و لێکدانەوەی هزرن کە بریتیین لە (شیعر و ئەدەب و پەخشان، زانستی مێژوو، داڕشتن و خۆشنووسی، پزیشکی، بیرکاری ...). حسێن شاکر شریف، کورد لە کتێبی (وفيات الاعيان و انباء ابناء الزمان) ی (ابن خلكان)، دەزگای چاپ و پەخشی نارین، ٢٠١٦ ، ل ٢٠٥-٢٤٨ .

**لیستی سەرچاوەکان**

**بەڵگەنامەی بڵاونەکراوە :**

- وزارة الداخلية ، مديرية الشرطة العامة ، بغداد ، شهادة الجنسية العراقية ، استمارة رقم ٣، رقم المحفظة ١٤٤١٨٣/٢ .
- مديرية عام دائرة التقاعد ، محافظة اربيل ، اسم المتقاعد : زبير بلال اسماعيل ، رقم التقاعدي ٣١٧١٩٧٨٠٠٣ ، عنوان الوظيفه السابق : مدرس .

**چاوپێکەوتنەکان :**

- پ. د. جەودەت بیلال ئیسماعیل، هەولێر، ٢٠١٨/٩/٧ .
- مومتاز حەیدەری ، هەولێر، ٢٠١٨/١١/٨ .
- مستەفا زوبێر بیلال، هەولێر، ٢٠١٩/٩/٢٩ .

کتێب :

**یەکەم / بە زمانی کوردی :**

- سەروەر عەبدولرەحمان عومەر، ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٩ .
- حسین شاکر شریف، کورد لە کتێبی (وفيات الاعيان و انباء ابناء الزمان) ی (ابن خلكان)، دەزگای چاپ و پەخشی نارین، ٢٠١٦ .
- عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی، ڕەوشی حوجرە لە پێگەیاندنی زانا ئاینییەکانی شاری هەولێر، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٧ .
- فاخر عالی خان ئاودەلی، ڕۆڵی زانایانی ئایینی لە ژیانی سیاسی هەولێردا ١٩٤٥-١٩٧٥، چاپخانەی هێڤی، ٢٠١٤ .
- کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو ـ کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو، چ٢، چاپخانەی هێڤی، هەولێر، ٢٠٠٨.

٦- کەریم شارەزا، (شاعیر و نووسەر و خەباتگێڕی کورد شەهید مەهدی خۆشناو ١٩٥٣-٢٠٠٤)، لە کتێبی (قاموسی ناوە نەمرەکان، ئامادەکردنی : مومتاز حەیدەری)، بەرگی یەکەم، هەولێر، ٢٠١٤.

- مەغدید حاجی، لە (ئوربیللۆم و ئەربەئیلۆ)وە بۆ هەولێر ، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٩ .

**دووەم / بە زمانی عەرەبی :**

زبير بلال اسماعيل، أربيل في أدوارها التأريخية، مطبعة النعمان، النجف، ١٩٧١ .

٢- ..................، ابن خلكان (٦٠٨- ٦٨١ هـ) حياته و آثاره، مطبعة الامة، بغداد، ١٩٧٩.

٣- ..................، علماء ومدارس في اربيل ، مطبعة الزهراء الحديثة ، موصل، ١٩٨٤ .
٤- ..................، الشيخ چولی (محمد ثناءالدين بن مصطفى بن الحاج عمر الاربيلي النقشبندي)، مطبعة التعليم العالي ، أربيل، ١٩٨٨ .
٥- ..................، الاكراد في كتب البلدانيين و الرحالة المسلمين في العصور الوسطى ، مطبعة وزارة الثقافة ، أربيل، ١٩٩٨ .
٦- ..................، تأريخ أربيل/ دراسة تأريخية عامة لاربيل وانحائها منذ اقدم العصور حتى الحرب العالمية الاولى، مطبعة الثقافة، ١٩٩٨ .
٧- اربيل بين الماضي والحاضر ، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، د.س .

**توێژینەوەکان :**

**یەکەم / بە زمانی کوردی :**

١- حکيم احمد مام بکر، چەند لایەنێکی گرنگی بەرهەمەکانی ولآتناسان بۆ دیرۆک و شارستانێتی کوردی لە سەدەکانی ناوەڕاست، گۆڤاری " مێژوو "، ژ (٢)، بەهاری ٢٠٠٧ .

**دووەم / بە زمانی عەرەبی :**

١- زبير بلال اسماعيل ، ابن خلكان، مجلة " شمس كردستان "، (بغداد)، ع (١)، ١٩٧١ .
٢- ..................، ابن المستوفي الاربلي، مجلة " شمس كردستان "، ع (٢)، ١٩٧١
٣- ..................، علي الحريري، مجلة " الثقافة "، (بغداد)، ع (١١)، ١٩٧٥ .
٤- ..................، من شعوب زاگروس القدماء (الكاشيون)، مجلة " شمس كردستان "، ع (٣٢)، ١٩٧٥ .
٥- ..................، محمد بن آدم البالكي، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، (بەغدا)، بەرگی پێنجەم، ١٩٧٧.
٦- .................. النقد الحديث و النقد في الادب الكردي، مجلة " الثقافة "، ع (٧)، ١٩٨٠.
٧-..................، ابن المستوفي ... المؤرخ و الاديب، مجلة " الحكم الذاتي " ، (اربيل)، ع (١-٢)، ١٩٨٢ .
٨-..................، الكهاريز في أربيل، مجلة " الحكم الذاتي " ، ع (٣)، ١٩٨٢ .
٩- ..................، ابوبكر المير روستم، مجلة " الحكم الذاتي " ، ع (١)، ١٩٨٣ .

١٠- ................، محمد بن الخطيب موسيقي من أربيل، مجلة " كاروان " ، (اربيل)، ع (٢٣)، ١٩٨٤ .
١١-................، قراءة في (تاريخ أربل) لأبن المستوفي، مجلة " الحكم الذاتي " ، ع (٢)، ١٩٨٥ .
١٢- ................، قراءة في (تاريخ أربل) لأبن المستوفي، القسم الثاني، مجلة " الحكم الذاتي " ، ع (٤)، ١٩٨٥ .
١٣- ................، بنو يونس الاربلي، مجلة " الحكم الذاتي " ، ع (٥٥)، ١٩٨٧ .
١٤-................، ابن فخر الاربيلي الاديب ... الكاتب، مجلة " الحكم الذاتي " ، ع (٥٨)، ١٩٨٨ .
١٥- ................، ابن فخر الاربيلي الاديب ، القسم الثاني، مجلة " الحكم الذاتي " ، ع (٥٩)، ١٩٨٨ .
١٦- ................، ابو بكر الأربلي الملقب كچك ملا، مجلة " الرسالة الاسلامية "، (بغداد)، ع (١٥-١٦)، السنة الحادية عشرة.

**وتارەكان :**

**یەكەم / بە زمانی كوردی :**

١- باكووری، فرمێسك و وتەیەكی وەفاداری بۆ هاوڕێی ئازیز خوالێخۆشبوو زوبێر بیلال، رۆژنامەی " برایەتی "(هەولێر)، ژ (٢٧٤٦)، ١٩٩٨/١٢/٢٩ .
٢- حەسەن مەحمود حەمە كەریم، كۆچی دوایی مامۆستا (زوبێر بیلال) خەسارەتێكی گەورەیە و پڕنابێتەوە، رۆژنامەی یەكگرتوو، (هەولێر)، ژ(٢٢٠)، ١٩٩٩/١/١ .
٣- زوبێر بیلال ئیسماعیل، شەهابە بەناوبانگترین گۆرانیبێژی هەولێر (...ـ ١٩٣٨ز ، گۆڤاری " هەولێر "، ژ(٥) زستانی ٢٠٠٠.
٤- ......................، مەقامبێژ و مەولوود خوێنەكانی شاری هەولێر ، وەرگێڕانی: تاریق سالح، پێداچوونەوەی : وریا ئەحمەد، گۆڤاری "چلاواز" (هەولێر)، ژ (٣٢)، تشرینی یەكەمی ٢٠٠٨.
٥- زوبێر بیلال ئیسماعیل خامەیەكی بە بڕشت و ژیانێكی پڕ لە بەخشش، چاوپێكەوتن، گۆڤاری " رامان " (هەولێر)، ژ (١٢)، ٥ی حوزەیرانی ١٩٩٧ .
٦- فرەنسۆ هەریری، لە یەكەم ساڵیادی مامۆستای خوالێخۆشبوو (زوبێر بیلال ئیسماعیل) دا، گۆڤاری "هەولێر" (هەولێر)، ژ (٥)، زستانی ٢٠٠٠ .

٨- مەهدی خۆشناو، لە ماڵئاوایی مامۆستا زوبێر بیلال دا، رۆژنامەی " برایەتی " (هەولێر)، ژ(٢٧٣٨)، ١٩٩٨/١٢/١٧ .

**به زمانی عەرەبی :**

١- اربيل العاصمة تؤبن المؤرخ الراحل زبير بلال اسماعيل، جريدة "خەبات "(اربيل)، ع (٩١٠)، ١٩٩٩/٢/٥ .

٢- ابو دانا، تقييم كتاب (تأريخ أربيل) للمؤرخ الراحل زبير بلال اسماعيل، جريدة "خەبات"، ع (٩١٤)، ١٩٩٩/٣/٥ .

٣- جواد كاظم البيضاني، زبير بلال أول مؤرخ كردى يهتم بدراسة التاريخ القديم ، جريدة " البينة الجديدة" (بغداد)، ع (١٣٦٨)، ٢٠١١/٩/٦ .

٤- ......................، زبير بلال اسماعيل مؤرخ مدينة اربيل حياته و نتاجه الفكري، صحيفة الكترونية " التآخي " (بغداد)، تاريخ النشر الاحد ٢٠١٢/٣/٤ .

٥- زينب جلبي، لمحات عن حياة ومؤلفات المؤرخ الكبير زبير بلال أسماعيل، صحيفة الكترونية "شباب مصر"، يوم ٢٠١٢/١/٩ .

٦- ..............، أربيل في أدوارها التأريخية " نقطة أنعطاف في دراسة التأريخ الكردي "، صحيفة " المثقف"، ع (٢٩٦٢)، ٢٠١٤ .

٧- .................، المؤرخ زبير بلال اسماعيل عطاء و ريادة، صحيفة " باس "(اربيل)، ١٣/ كانوون الثاني ٢٠١٦ .

٨- محمد مصطفى الصفار، المؤرخ زبير بلال اسماعيل ودوره في تدوين تأريخ الكورد و كوردستان، صحيفة ايلاف الالكترونية، السبت، ٢٠٠٥/٦/١١ .

٩- كريم شارەزا، المؤرخ المعاصر والباحث الآثارى زبير بلال اسماعيل، صحيفة "خەبات "، ع(١٠٠٦)، ٢٠٠٠/١٢/١٥ .

١٠- نوزاد بابان، في ذكرى رحيل المؤرخ الكبير زبير بلال اسماعيل، صحيفة الكترونية " خبر ٢٤"، شؤون ثقافية، ٢٠١٧ /١/٢٧ .

١١- وداعا .. زبير بلال اسماعيل، مجلة " زاگروس" (اربيل)، ع (١٣)، ٢٧ كانون الاول ١٩٩٨ .

١٢- في ذكرى مرور (٤٠٠) سنة على تأليف (الشرفنامة) آراء و ملاحظات تقييمية لمسيرة كتابة تأريخ شعبنا، جريدة " رێگای کوردستان" (اربيل)، ع () تشرين الثاني ١٩٩٥ .

## ملخص البحث

## (المؤرخ زبير بلال اسماعيل ودوره في كتابة تأريخ اربيل الثقافي)

للمؤرخ زبير بلال اسماعيل مساهمة كبيرة في كتابة التاريخ الكوردي بصورة عامة وتأريخ اربيل بصورة خاصة. وترجع كتاباته عن اربيل الى كونه من الرواد الاوائل في هذا المجال ، ومن ابرز مؤلفاته "اربيل في ادوارها التأريخية " المطبوع عام ١٩٧١ .

ان هذا البحث محاولة لتسليط الضوء على دور المؤرخ زبير بلال اسماعيل في كتابة التأريخ الثقافي لمدينة اربيل. ويتألف البحث من تمهيد ومبحثين، وقد تناولت في التمهيد سيرة وشخصية المؤرخ موضوع الدراسة. أما المبحث الاول فقد خصص لعرض الجانب الثقافي لمدينة اربيل في كتاباته ولاسيما العلماء و الشخصيات البارزة والمدارس وقراء المولد النبوي. وتناول المبحث الثاني دراسة منهج زبير بيلال اسماعيل في كتابة التأريخ ومفهوم التاريخ لديه .

## Abstract

### (The Historian Zuber Bilal Ismail and his role in writing the intellectual history of Erbil)

This paper focus on a historian zuber bilal ismail and his role in writing the intellectual history of Erbil. He played crucial role in writing the Kurdish history generally while the Erbil city specifically.

Therefore, this paper discuses his role in Kurdish history. Firstly as an introduction for this research his role and character have been analyzed. Next in a private chapter the intellectual life in Erbil has been examine particularly the role of famous people, school and Maulood readers in zuber bilal books. Finally, this paper evaluates the methodology in his books foe writing history. The aim is to explain the concept of history in his writing about history and the methodology.

The importance of this research is to deliberate the biography of many famous people in Erbil, well-known schools and the Maulood citers.

# ئافرەت لە رۆژنامەی هەولێر
# ١٩٥٠- ١٩٥٣

**م. ی. سروە قادر سمایل**
کۆلێژی ئاداب - بەشی مێژوو
زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر

**پێشەکی**

خەباتی رێکخراوەیی و رۆشنبیری و رۆژنامەگەری لایەنێکی گرنگی مێژووی هاوچەرخی کوردە و هێشتا وەکو پێویست لە چوارچێوەی توێژینەوەی ئەکادیمیدا بایەخی پێنەدراوە و زۆر لایەنی ئەم بوارانە تیشکیان نەخراوەتە سەر، لە ناویشیاندا رۆژنامەگەری بەگشتی و رۆژنامەگەریی پیشەیی بەتایبەت، لەوانەش رۆژنامەی (هەولێر) کە وەک هەفتەنامەیەکی ئەدەبی و رۆشنبیری لەلایەن کۆمەڵەی مامۆستایان- لقی هەولێر لەماوەی ساڵانی ١٩٥٠- ١٩٥٣ دەرچووە. لەم رۆژنامەیەدا ئافرەت رۆڵی گێڕاوە لە بەڕێوەبردن و دەرچوونی لەلایەک، لەلایەکی دیکەشەوە ژیانی کۆمەڵایەتی تێیدا رەنگیداوەتەوە. هەر بۆیەش بەپێویستمان زانی ئەم توێژینەوەیە بەناوونیشانی (ئافرەت لە رۆژنامەی هەولێر ١٩٥٠-١٩٥٣) ئامادە بکەین.

ئەم توێژینەوەیە لە چوار باس، دەرئەنجام، لیستی سەرچاوەکان و پوختەی توێژینەوە بەعەرەبی و ئینگلیزی کۆتایی دێت. باسی یەکەم تایبەت کراوە بەناساندنی رۆژنامەی هەولێر، باسی دووەم تایبەت کراوەبە، رۆڵی ئافرەت لە مێژووی کورددا، باسی سێیەم تیشکمان خستۆتە سەر رەنگدانەوەی بارودۆخی ئافرەت لە رۆژنامەی هەولێر، باسی چوارەمیش باسمان لە ئافرەت کردووە وەکو نووسەر لە رۆژنامەی هەولێر. لە کۆتاییدا بەچەند خاڵێک ئەو دەرئەنجامەمان خستۆتە ڕوو کە لەم توێژینەوەیەدا پێیان گەیشتووین.

سەبارەت بە سەرچاوەکانی ئەم توێژینەوەیەدا بەپلەی یەکەم ژمارەکانی خودی رۆژنامەکە بووە، هەرچەندە لە کۆی (١٤٠) ژمارەی تەنها (٩٣) ژمارەی کەوتۆتە بەردەست ، هەولێکی زۆریشماندا بۆ دۆزینەوەی ژمارەکانی دیکەی بەلام سەرکەوتوو نەبووین. لەپاڵ ژمارەکانی ئەم رۆژنامەیەش، پشتمان بەچەند سەرچاوەیەکی دیکەش بەستووە لەوانەش کتێبەکەی مەحمود زامدار بەناونیشانی (رۆژنامەی هەولێر ١٩٥٠- ١٩٥٣ حیکایەتی سەرهەڵدان و کۆتایی) نووسەر بەشیوەیەکی ورد باس لەدەرچوونی رۆژنامەکە و داخستنی و دەستەی نووسەران و بەڕێوەبردنی ئەو چاپخانانەی کە رۆژنامەکەی لێ چاپکراوە کردووە. هەروەها کتێبی (صحافة اربیل) کە لەلایەن نزار جەرجیس عەلی ئامادەکراوە لەگەڵ کتێبەکەی عەبدوڵڵا ئەنوەر (سمکۆ) بەناوونیشانی (رۆژنامەوانی کوردی شاری هەولێر ١٩٣٥- ١٩٧٥) دوو سەرچاوەی گرنگ بوون لەم توێژینەوەیەدا پشتیان پێ بەستراوە.

**باسی یەکەم : ناساندنی رۆژنامەی هەولێر :**

(هەولێر رۆژنامەیەکی ئەدەبی ئەقافی هەفتەیی) بووە لە شاری هەولێر لەلایەن کۆمەڵەی مامۆستایان- لقی هەولێر[1] دەرچووە، ژمارە (١)ی لە ١٦ی کانووی یەکەمی ١٩٥٠ دەرچوو دوا ژمارەشی کە ژمارە (١٤٠) بوو لە ٢٨ی کانوونی یەکەمی١٩٥٣ دەرچووە، بەڵام ٩٣ ژمارەی بەردەست، ئەوانی دیکەی هێشتا نەکەوتۆتە بەردەستە، هەر بۆیەش پارێزەر تاریق جامباز کە خەمخۆرانە ئەو (٩٣) ژمارەیەی پەیداکردووە، دوای هەوڵدانێکی زۆرو بێ ئومێدبوونی لەدۆزینەوەی ژمارەکانی دیکەی، بڕیاری داوە کە ئەو (٩٣) ژمارەیە لە فەوتان رزگار بکات، بیخاتە بەردەستی خوێنەرانی کورد و لەرێگای ئەکادیمیای کوردی لەساڵی ٢٠١٩دا جارێکی دیکە چاپ و بڵاوبکاتەوە (دیدار لەگەڵ تاریق جامباز، ٢٣ی حوزەیرانی ٢٠١٩). سەرەتا هەر ژمارەیەکی بەدوو لاپەڕە دەرچووە یەکێکیان بەعەرەبی و ئەوی تریان بەکوردی، بەلام لە ژمارە (٤)ەوە تاوەکو دەرچوونی دوا ژمارەی رۆژنامەکە بە چوار لاپەڕە دەرچووە دوولاپەڕە

بەکوردی دوو لاپەڕەکەی دیکە بەعەرەبی (رۆژنامەی هەولێر، ٢٠١٩، ل ؛ خەزنەدار، بدون سنة طبع، ص٥٩).

هەولێر سەرەتا: لەچاپخانەی کوردستان کە خاوەنەکەی گیوموکریانی بوو دەرچووە، بەڵام لەبەرئەوەی کرێکاری کەم بووە و توانای دارایی چاپخانەکەش لاوازبووە، بۆیە رۆژنامەکە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا دەرنەدەچوو، لەبەرئەوە چاپکردنی رۆژنامەکە گوازرایەوە چاپخانەی (ام الربيعين) لە شاری موسڵ، کە بە چوار لاپەڕە چاپ و بڵاوکرایەوە بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی. رۆژنامەکە بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بوو تاوەکو بەپێی یاسای چاپەمەنی (٢٤)ی ساڵی ١٩٥٤ داخراوە (علی، ١٩٨٨، ص٦١؛ سمکۆ، ٢٠١٢، ل٢٢٣).

بەرپرسی رۆژنامەکە جەمیل رەشید[٢]و دەستەی نووسەرانی (عەبدولمەجید حەسەن ئامێدی[٣] و عزەدین فەیزی[٤] و ئەستێر سەعید بوون[٥]). بەڕێوەبەری کارگێڕی جومعە محەمەد سەفار[٦]و بەڕێوەبەری بەشی عەرەبیش حوسێن رەشوانی[٧] بووە (علی، ١٩٨٨، ص٦١؛ زامدار، ١٩٨٨، ل١١). لە ژمارە (١٤)شدا یوسف شێخ یەحیا لەشوێنی جومعە سەفار بۆتە بەڕێوەبەری کارگێڕی، مستەفا شەعبانیش بۆ دەستەی نووسەران زیادکراوە، بەڵام لە ژمارە (٦٢) جەمال جەمیل کراوەتە بەڕێوەبەری کارگێڕی و مستەفا شەعبانیش لە دەستەی نووسەراندا نەماوە، لە ژمارە (٦٣)دا نافع دەباغ بۆتە ئەندامی دەستەی دەرکردن تاکو ژمارە (٨٨)، دواتریش لە ژمارە (٨٩)وە حوسێن رەشوانی کراوەتە ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەکە (زامدار، ١٩٨٨، ل١٤، سمکۆ، ٢٠١٢، ل٢٢٢).

سەبارەت بەتیراژ و شێوازی دابەشکردنی رۆژنامەکە هەر ژمارەیەکی ٧٥٠ دانەی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە، ٣٠٠ دانەی بۆ مامۆستایان و ٤٠٠ دانەشی بۆ توێژەکانی دیکە، ٥٠ دانەی دیکەشی بێ پارە بۆ هەندێک لە بەرپرسان و قوتابیانی کورد لە زانکۆکانی بەغدا نێردراوە (سمکۆ، ٢٠١٢، ل٢٢١).

دەربارەی بەشداریکردنی ساڵانە و شەش مانگی خوێندنی رۆژنامەی هەولێر بەم شێوەیە بووە: ئابوونەی ساڵانە لە ژمارە (١) تاکو ژمارە (٩٩) بۆ

ناو شار (٦٠٠) فلس بووە، بەڵام بۆ دەرەوە ٧٥٠ فلس ئابوونەی شەش مانگان هەمان ژمارەی ئاماژەمان پێکرد بۆ ناو شار (٣٠٠) فلس و بۆ دەرەوە (٤٠٠) فلس بووە، ئابوونەی ساڵانە لە ژمارە (١٠٠) تاکو دوا ژمارەی رۆژنامەکە ژمارە (١٤٠) بووە بەم شێوەیە بووە:

بۆ مامۆستا و قوتابی لەعێراق یەک دینار بۆ خەڵکی دیکە لە هەولێر یەک دینار بۆ خەڵکی دیکە لە دەرەوە ١٢٠٠ فلس بووە لە دەرەوەی عێراق ١٥٠٠ فلس بووە نرخی بڵاوکردنەوەی ریکلامیش (٢٥٠) فلس بووە قەوارەی لاپەڕەکانی رۆژنامەی هەولێر (٤٠سم بە ٧٥سم) بووە.

لە رووی داراییەوە پشتی بەداهاتی ریکلام بەستووە، تەنانەت داوای لە سەرۆکی فەرمانگەکان کردووە، ریکلامەکانی خۆیانیان بۆ بنێرن (سمکۆ، ٢٠١٢، ل ٢٥-٢٦). لەلایەک بۆ ناوبانگی خۆیان یارمەتیدان و هاوکاری دارایی رۆژنامەکە لەلایەکی دیکەوە زۆربەی ئەو کەسانەی هاوکاری رۆژنامەکەیان کردووە لەدەستەی نووسەران و هەروەها ئەندامی کۆمەڵەی مامۆستایانی- لقی هەولێر بووینە واتا بۆ دەرکردنی رۆژنامەکە و دابەشکردنی پشت بەچینی مامۆستا بەستراوە، ئەمەش کاریگەری کردۆتە سەر دواکەوتنی هەندێ ژمارەی رۆژنامەکە بەتایبەتی لە پشووی هاویندا، ئەمەش دەبووە جێگەی پرسیاری خوێنەران و هاوکارانی رۆژنامەکە (سمکو، ٢٠١٢، ل٢٢٧).

لەسەر ئاستی هەولێر و دەرەوەی هەولێر چەندین کەسایەتی دیار و مامۆستا هاوکاری دارایی و پاڵپشتی رۆژنامەکەیان کردووە نزیکەی ٢٢٧ مامۆستا لە پیاو و ئافرەت هاوکاری مانگانەی رۆژنامەکەیان کردووە لەسەر کەسایەتییە دیارەکانیش لە دەرەوەی هەولێر ئەمین بەگی یامولکی هاوکاری دارایی رۆژنامەکەی کردووە لەسەر ئاستی هەولێریش (فایەق نادر)، بەنووسراویش داود ئاغای یەعقوب ئاغا پاڵپشتی رۆژنامەکەی کردووە، هەروەها (فوئاد رەشید) بەتەلگراف پاڵپشتی رۆژنامەکەی کردووە لەکاتێکدا ناوبراو مفەتشی مەعارفی لیوای سلێمانی بووە (زامدار، ل١٥).

**باسی دووەم: رۆڵی ئافرەت لە مێژووی کورددا :**

یەکێک لەو بابەتانەی ئەم رۆژنامەیە گرنگی پێداوە رۆڵی ئافرەتە لە مێژووی کورددا، بۆ نموونە نووسەرێک بەناوی خەلیل خۆشناو لە (٧) ئەلقە و حەوت ژمارەی رۆژنامەکەدا بەناوونیشانی (خانزاد) باس لە رۆڵی خانزاد لە فەرمانڕەوایەتی کردنی میرنشینی سۆران دەکات.

لە ئەلقەی یەکەمدا باس لە هەوڵەکانی خانزادی میری سۆران دەکات، لە نەهێشتنی دیاردەی دزی و تاڵانی سەر رێگەی کاروانی بازرگانەکان (هەولێر، ژ٢٥، ٢ی حوزەیرانی ١٩٥١). لە ئەلقەی دووەمیشدا باس لەشوێنی نیشتەجێبوون و کۆچە وەرزییەکانی میر خانزاد دەکات کە شوێنی نیشتەجێبوونی سەرەکییەکەی هەریری پایتەختی میرنشینی سۆران بووە، بەڵام لە سێ مانگی هاویناندا خۆی و دەستەکەی روویان لە شەقڵاوە کردووە لە گەرمترین رۆژانی ئەو وەرزەدا لەسەر چیای سەفین رەشماڵیان هەڵداوە، لە پایزانیشدا گەڕاوەتەوە هەریر (هەولێر، ژ٢٦، ٩ی حوزەیرانی ١٩٥١).

دوای ئەوە نووسەر لە سێ ئەڵقەی دیکەدا باس لە ململانێی نێوان میر سلێمان بەگی میری سۆران و حسێن بەگی میری داسنی دەکات، لەو چوارچێوەشدا باس لە سیناریۆی کوشتنی سلێمان بەگ دەکات لەلایەن برازایەکی حسێن بەگ کە ناوی لەشکری بوو پاشانیش باس لە تۆڵەسەندنەوەی خانزادی خوشکی میر سلێمان بەگ لە لەشکری و لەڕێگەی دەستگیرکردن و هێشتنەوەی لەزیندان تا مردنی (بڕوانە: ژ(٢٨)، ٢٣ی حوزەیرانی ١٩٥١؛ ژ٢٩، ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٥١، ژ٣٠، ١٤ی تەموزی ١٩٥١).

سەبارەت بەسیناریۆی کوشتنی میر سلێمان بەگی برای میر خانزاد لەلایەن لەشکری زانیاریی پێچەوانە دژ بەیەک بڵاوکراوەتەوە لە بەیتە فۆلکلۆرییەکاندا، میر (سلێمان بەگ) دوای ئەوەی باوکی لەشکری کوشتووە، بەمنداڵی لەشکری هێناویەتی و پەروەردەی کردووە بەهۆی قارەمانی و سوارچاکی کراوەتە سەرلەشکری سۆران لە بنەچەدا ئێزیدییە و، بۆیە لەشکری لە هەلێک گەڕاوە بۆئەوەی تۆڵەی باوکی لە میر بکاتەوە. ئەم هەلەشی کاتێک بۆ رەخساوە والیی بەغدا میری سۆرانی بانگ کردووە بۆ بەغدا، ئەوەبوو

توانیویەتی ژەهرخواردی بکات. لەم بەیتەدا (سلێمان بەگ) وجاخ کوێربوو، بۆیە (خانزادە خاتوون)ی خوشکی میرایەتی سۆرانی گرتۆتە دەست و بڕیاردەدات تۆڵـەی براکـەی بکاتـەوە بـەئازارێکی زۆرەوە بیکـوژێ، بـەڵام لـە بـەیتێکی فۆلکلۆری دیکەدا ئـەویش هـەر بـە (بـەیتی لەشکری) ناسراوە هـەموو پیلانـی کوشتنی (سلێمان بەگ)ی میری سۆران خراوەتە ئەستۆی عوسمانیان و هـیچ باسی ناپاکی لەشکری ناکات (بڕوانە: هەروتی، ٢٠١٨، ل٨٥-٩٤).

دواتریش نووسەر لە ئەلقەی حەوتەم و کۆتاییدا لە چوارچێوەی دە خاڵدا باس لە لێهاتوویی خانزاد دەکات لە رووی بەڕێوەبردنەوە کە توانیویـەتی رێگا لە گرانی و نەهامەتی و برسێتی بگرێت و بەپێی ئایین زەکاتی بەسەر هـەژاران دابەش کردووە و کۆنترۆڵی بازاڕی کردووە و ئاوی بەیەکسـانی بۆ هـەموان دابـین کـردووە و هــەوڵی داوە کـە خێـزان لەســەر بنــەمای خۆشەویســتی دابمەزرێ ئەویش لە رێگەی رێگریکردن لە بەزۆر بەشوودانی کچ و سـزادانی ئەو باوک و مەلایانـەی کـە پێچەوانـەی ئـەوە هەڵسـوکەوتیان کردیـە، هـەروەها فەرمانی داوە کە سزای دزی و دەست بڕین و سزای رێگری کوشتنە بەمەش ئـارامی و هێمنــی بـاڵی بەســەر هــەریردا کێشـاوە. فەرمانیشــی دابـوو کـەوا هەرکەسێک بەرتیل وەربگرێ، لە هەریر دەربکرێ. هەوڵیشی دابوو کە بەشـی زۆری پێداویستییەکانی لەناوخۆدا دابین بکرێت، لەشکرێکی بۆ پارێزگاریکردنی هەریریش رێکخستووە و پێداویستی مانگانەی بۆ ئامادە کردوون تا دووربن لە خراپەکاری (هەولێر، ژ٣١، ٢١ی تەموزی ١٩٥١).

**باسی سێیەم: رەنگدانەوەی بارودۆخی ئافرەت لە رۆژنامەی هەولێر :**

یـەکێک لـەو لایەنانـەی کـە لـە رۆژنامــەی (هــەولێر)دا رەنگیداوەتــەوە بارودۆخی ژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەتی کوردە، لە یەکێک لە ژمارەکانیدا بابەتێک بەناونیشـانی (کۆشـی دایـک) کـە لەلایـەن نووسـەرێک بـەناوی کـەمال رەشـید نووسراوە، بڵاوکراوەتەوە. سەرەتا نووسەر باس لە گەورەیی دایک دەکات و بـە بناغـەی رێکخسـتنی ژیـانی دادەنێت، هـەروەها ئاماژەش بـەتێڕوانینی ئایینـە ئاسمانییەکان دەکات کە بەگەورەیی لە دایک دەڕوانن، پاشـان نووسـەر تیشـک

دەخاتە سەر دایکی نەخوێندەوار کە وەکو پێویست ناتوانن منداڵانیان پەروەردە بکەن کە بەهۆی لاوازیی ئاستی رۆشنبیرییان هەر لە سەرەتاوە قسەی نەشیاو فێری منداڵانیان دەکەن، تەنانەت لە رووی پاک و خاوێنیشەوە وەکو پێویست ناتوانن بایەخ بەمنداڵانیان بدەن (هەولێر، ژمارە ٤٣، ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٥١).

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە لەو ماوەیەدا رێژەی نەخوێندەواری بە گشتی لە لیوای هەولێر ساڵانی پەنجاکان بە بەراورد لەگەڵ لیوای کەرکووک و سلێمانی کەمتر بووە بۆ نموونە ساڵی ١٩٥٢- ١٩٥٣ لە هەولێر ٨%ی کوڕان خوێندوویانە کچانیش لە١% (کاکە سوور، ٢٠٠٤، ل٢٥٨).

لەهەمان کاتیشدا نووسەر لە بابەتەکەیدا تێڕوانینەکەی رەهایانە دەخاتەڕوو، لەکاتێکدا مەرج نییە هەموو دایکێکی نەخوێندەوار نەتوانێ منداڵەکەی بەجوانی پەروەردە بکات و خاوێن رابیگرێت، بەپێچەوانەشەوە مەرج نییە هەموو ئافرەتێکی خوێندەوار بتوانێ منداڵەکەی بەشێوەیەکی جوان پەروەردە بکات و خاوێن رابیگرێت.

لایەنێکی دیکە کە لەم رۆژنامەیەدا رەنگیداوەتەوە و بایەخی پێدراوە واقیعی ژیانی ئافرەتی کورد بووە وەک هاوسەر. لەم رووەوە لە ژمارە (٨٢)دا لەلایەن کەمال شاکر مەحمود(٨) کە مامۆستا بووە لەقوتابخانەی ئیبن مستەوفی بابەتێک بەناوونیشانی (گوناهی مێردی نەزان وە باوکی دڵ رەق) بڵاوکراوەتەوە، کە باس لەژیانی ژنێک دەکات کە دوای ئەوەی لەگەڵ مێردەکەی نەگونجاوە و بەردەوام کێشەیان هەبووە و لەلایەن مێردەکەیەوە ئازار دراوە، ئەویش بۆ دەربازبوون لەو ژیانەی جیابووەتەوە و جێهێشتنی پێ باش بووە. بەڵام کاتێک گەڕاوەتەوە ماڵی باوکی، باوکیشی دڵڕەقانە بەرانبەری هەڵسوکەوتی کردووە و گەڕانەوەی کچەکەی پێ شەرم بووە و هەڕەشەی کوشتنی لێکردووە و ویستوویەتی بینێرێتەوە لای مێردەکەی، ژنەکەش بۆ دەربازبوونی لەو ژیانە هەوڵیداوە خۆی فڕێ بداتە ناو رووبارێکەوە، بەڵام لەلایەن چەند سەربازێکەوە دەسگیرکراوە (رۆژنامەی هەولێر، ژمارە ٨٢ ٥ی ئابی ١٩٥٢).

لە بابەتێکی دیکەدا نووسەرێک بەناوی (ژ) بابەتێکی بەناوونیشانی (خاوەن کچ لەخوا بترسن) نووسیوە، کە تیایدا باوکان هان دەدات کە رێزی

کچەکانیان بگرن و وەکو کاڵایەک مامەڵەیان پێوە نەکەن و چاویان لە هاودڵێکی رێک و پەسند بێت بۆ کچەکانیان، نەک لەکاتی داخوازیدا باری سەرشانی زاوا قورس بکەن و داوای خشڵ و زێرو ماڵ و ئۆتۆمبیلی لێبکرێت، بەڵکو لەجیاتی ئەوە هاوکارییان بکرێت بۆ کرِینی خانوویەک یان زەوییەک کە ژیانی خۆیانی لەسەر بنیات بنێن (هەولێر، ژمارە ١٣٠، ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٣، ل٢٨٩). ئەو دیاردەیە تاکو ئێستاش لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا ماوە و لەکاتی هاوسەرگیریدا باری سەرشانی زاوا بەهۆی داواکاریی ماڵی بووک بۆ کرِینی خشڵ و زێرِ، قورس دەکرێت.

هەمان نووسەر لە بابەتێکی دیکەدا بەناوونیشانی (ئافرەت بۆ چ خراپ ئەبێ) باس لە دیاردەیەک دەکات کە ئەوکات لە چەند شارێکی عێراقدا بوونی هەبووە، ئەویش هەبوونی ئەو شوێنانە بووە کە (ئافرەتی داوێن پیس) بەئاشکرا و نهێنی لەشی خۆی تێدا دەفرۆشێ. نووسەر لە بابەتەکەیدا ئەوە بە پەڵەیەکی چڵکن بەسەر نێوچەوانی گەلی عێراق ناودەبات و رەخنە لە حکومەتی عێراق دەگرێت کە چاوپۆشی لەمانە دەکات، هەروەها پیاوانی ئایینیش بە کەمتەرخەم دادەنێت لەئاست ئەو دیاردەیە کە سەرەرِای هەبوونی ژمارەیەکی زۆری مزگەوت، کەچی دژی ئەو دیاردەیە کەسێک تێیدا دەنگ بەرز ناکاتەوە. (رۆژنامەی هەولێر، ژمارە ١٢٢، ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٥٣، ل٢٩٧).

مارف خەزنەداریش لەم رۆژنامەیەدا بەزمانی عەرەبی بابەتێکی بەناوونیشانی (میهرەبان خاتوون شاعرة العشق والجمال) نووسیوە. کە ژنە شاعیرێکی کورد بووە و کچی مەلا حەسەن مائی بووە لە ناوچەی بەرواری لە باکووری ئامێدی لە سەدەی هەژدەی زایینیدا ژیاوە. نووسەر لە بابەتەکەیدا باس لە تایبەتمەندییە شیعرییەکانی میهرەبان خاتوون دەکات، هەروەها باسی ئەو پەیوەندییە خۆشەویستییەش دەکات کە لەنێوان ئەو شاعیرە و ئامۆزایەکیدا هەبووە، ئەوەش کاتێک ئاشکرا دەبێت کە میری ناوچەی بەرواری دەکەوێتە ژێر کاریگەری کەسایەتییەکەی و بۆ خوازبێنی داوا لە باوکی میهرەبان خاتوون دەکات، بەڵام میهرەبان کە تا ئەوکات بەهۆی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی پەیوەندییە خۆشەویستییەکەی ئاشکرا نەکردبوو، بەڵام لەو کاتەدا

بەشـیعرێک ئـەو خۆشەویسـتییە دەردەبڕێت، کـاتێکیش میـر ئـەو شـیعرەی پێدەگات ئـەویش بـە شـیعرێک وەڵامـی دەداتـەوە، کـە نووسـەر لـەم بابەتـەدا هـەردوو شـیعرەکەی نووسـیوە و بـۆ زمـانی عـەرەبیش وەریگێـڕاوە. دوای ئەوەش میر رازی بوو کە میهرەبان خاتوون هاوسەرگیری لەگەڵ ئامۆزاکەیدا بکات (رۆژنامەی هەولێر، ژمارە ٩٠، ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٢، ل١٥٥).

ئەو بابەتە سێ لایەن دەردەخات، یەکەمیان ئاستی رۆشنبیریی ئافرەتێکی کوردە لە سەدەی هەژدەمدا کە شاعیر بووە لەکاتێکدا ئەوکات خوێندەواری لـە کۆمەڵگـەی کوردیـدا بەگشـتی ***لەئاسـتێکی*** نزمـدا بـووە. دووەمیـان ئاسـتی هۆشـیاریی ئـەو میـرەی بـەرواری بـووە کـە رێـزی لـە هەسـت و پەیوەنـدیی خۆشەویسـتی میهرەبـان خـاتوون گرتـووە، هەربۆیـەش خـۆی دەسـتبەرداری بووە لەو پێناوەی کە میهرەبان خـاتوون بەخۆشەویستەکەی خـۆی بگـات کـە ئـامۆزای خـۆی بـووە. سـێیەمیان زاڵبـوونی داب و نـەریت رێگـر بـووە لـەوەی ئافرەتێک بتوانێ پەیوەندیی خۆشەویستی ئاشکرا بکات تەنانەت بۆ کەسە هەرە نزیکـەکانی خۆیشـی، دوای تێپـەڕبوونی زیـاتر لـە دوو سـەدەش ئـەو داب و نەریتە کاریگەری لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا هەر ماوە.

**باسی چوارەم: ئافرەت وەکو نووسەر لە رۆژنامەی هەولێردا :**

لـە رۆژنامـەی هـەولێردا مامۆسـتایانی ئـافرەت جـێ پەنجـەی دیاریـان هەبووە و شان بەشانی مامۆستایانی پیاو کاریان لە رۆژنامەکەدا کردووە و ژمارەکانیـان دابەشـکردووە و لـە چەنـد ژمارەیەکیشـدا بابـەتیان نووسـیوە. دەسـتەی نووسـەرانی رۆژنامەکـە وەک لـە تـەوەری یەکەمیشـدا باسـمان لە نووسەرانی رۆژنامەکە کرد، لە پێنج کەس پێکهاتبوون کە یـەکێکیان ئـافرەت بوو ئەویش ئەستێر سەعید بوو، دوو بابەتیشی لـە دوو ژمـارەی رۆژنامەکەدا بڵاوکردۆتەوە کە هەردووکیان بـەزمانی عـەرەبین. بابـەتی یەکـەمیان لـە ژمـارە (١)ی رۆژنامەکـەدا بڵاوکراوەتـەوە بەناوونیشـانی (المـرأة والمجتمـع/ ئـافرەت و کۆمەڵگە)، بابەتی دووەمیشی بەناوونیشانی (البنت والمدرسة/ کچ و قوتابخانـە) لـە ژمـارە (٨)دا بڵاوکردۆتـەوە، بـەڵام لەبەرئـەوەی تائێسـتا ئـەو ژمارەیـە نەدۆزراوەتەوە، بۆیە نازانین ناوەڕۆکی بابەتەکانی چییە و باس لە چی دەکات.

جگە لـە ئەسـتێر سـەعید، ژمارەیـەکی دیکـەش لـە مامۆسـتایانی ئـافرەت لە رۆژنامەکەدا بابەتیان بڵاوکردۆتەوە وەک ناهیدە شێخ سەلام[٩] کە لە ژمـارە (٣)دا شیعرێکی بەناوونیشانی مەلیک، هەر لەو ژمارەیەدا لوتفیە دەباغ بابەتێکی بەزمانی عەرەبی بەناوونیشـانی (فاجعة العراق الكبری/ کارەسـاتە گەورەکـەی عێراق) بڵاوکردۆتـەوە، لـە ژمـارە (٤)یشـدا لوتفیـە دەبـاغ شـیعرێکی بـەزمانی عــەرەبی بەناوونیشــانی (فقیــدة العــراق/ ئافرەتــە کۆچکردووەکــەی عێــراق) بڵاوکردۆتـەوە. لـە ژمـارە (٨)یشـدا عەتیـە ولیـەم بـەزمانی عـەرەبی بابـەتێکی بەناوونیشـانی (اثر المدارس الابتدائیة فی اعداد الجیل/ کاریگـەریی قوتابخانـە سـەرەتاییەکان لـەئامادەکردنی نـەوەدا) بڵاوکردۆتـەوە. لـە ژمـارە (٩)دا دوو بابـەتی دیکـە لەلایـەن دوو مامۆسـتای ئافرەتـەوە بـڵاو کراونەتـەوە یەکـەمیان وتارێکی شەکیبە سەرافە بەناوونیشانی (هـل تعلـم/ ئایـا دەزانـی)، دووەمیشـیان بابـەتێکی ناهیـدە شـێخ سـەلامە بەناوونیشـانی (چـل رۆژ)، لـەژمارە (١١)شـدا لەلایـەن نەعیمـە سـابیر[١٠]و بەسـێ سـابیر[١١] دوو بابـەت بـەزمانی عـەرەبی بڵاوکراونەتەوە کە هی یەکەمیان بەناوونیشانی (الام/ دایک) و هی دووەمیشیان بەناوونیشانی (المعلم الصالح/ مامۆستای باش) بڵاوکراونەتەوە (زامدار، ١٩٨٨، ل٤٧-٤٩).

شایانی باسە ئەو ژمارانەی رۆژنامەی هەولێر کە لە سەرەوە ئاماژەمـان پێداون و مامۆستای ئافرەت بابەتیان تێدا بڵاوکردۆتەوە، تائێستا نەکەوتوونەتـە بەردەست چاپ نەکراونەتەوە، بۆیە نەمانتوانیوە تیشک بخەینە سەر ناوەڕۆکی ئەو بابەتانەی کە لە سەرەوەدا ئاماژەمان پێداون.

لەنێو ئەو ژمارانەشدا کە چاپکراونەتـەوە و لەبەردەسـتدان دەردەکـەوێت کە مامۆستایانی ئـافرەت بابـەتیان تێدا بڵاوکردۆتـەوە. لـە ژمـارە (٦)دا بابـەتێک بەزمانی عەرەبی بەناوونیشانی (مكانة المعلم في المجتمع/ پێگـەی مامۆسـتا لـە کۆمەڵگادا) لەلایەن حەمدیە سابیر[١٢] بڵاوکراوەتەوە کە تێیدا ئـەوە دەخاتـە ڕوو کە مامۆستا هێزێکی کاریگەرە لەهەر بەرەوپێشچوونێکی کۆمەڵایەتیدا، گەلان و حوکومەتـەکانیش درکیـان بـەم هێـزە کـردووە و بایـەخی تایبـەتییان پێـداوە و پشـتیان پێبەسـتووە بـۆ ڕاهێنـانی خوێنـدکاران لەسـەر بیرکردنـەوەی بـاش و

هاوکاری و پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی و بڵاوکردنەوەی گیانی مرۆڤایەتی، ئاماژە بەوەش دەدات کە داهاتووی نەتەوە و مرۆڤایەتی لە دەست مامۆستادایە، تارادەیەکی زۆریش مامۆستا شوێنی باوک دەگرێتەوە لە پەروەردەکردنی منداڵاندا (هەولێر، ژ٦، ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٥١).

هەر لەو ژمارەیەدا بەناوونیشانی (وەڵامی هەڵێن) بە هەڵبەست وەڵامی (هەڵێن/ حەزووورە)ی جەبار ئاغا (کانی) کە ئەویش هەر بە هەڵبەست نووسیویەتی و لە ژمارەی پێشووتری بڵاویکردۆتەوە، دراوەتەوە بەجیا لەلایەن هەریەکە لە دایکی رۆژ (ناهیدە شێخ سەلام)و دایکی جەودەت خەزنەدار (بڕوانە: هەولێر، ژ(٥)، ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٥١؛ هەولێر، ژ(٦)، ٢٠ی کانوونی دووەمی ١٩٥١).

لە ژمارە (١٦)شدا لەلایەن ماری مالک کە مامۆستای وەرزش بووە لە قوتابخانەیەکی ناوەندیی کچاندا، بابەتێک بەزمانی عەرەبی بەناوونیشانی (الرياضة في بلادنا/ وەرزش لە وڵاتماندا) بڵاوکراوەتەوە، کە تێیدا باس لەوە دەکات ژیانی وەرزشی لە ئێستادا لایەنێکی گرنگی لە ژیانی نەتەوە پێشکەوتووەکان پێکهێناوە کە هیچی کەمتر نییە لە زانستەکانی دیکە (هەولێر، ژ١٦، ٣١ی ئاداری ١٩٥١).

لە ژمارە (٣٢)شدا بابەتێک بەزمانی عەرەبی بەناوونیشانی (افسحوا الطريق/ رێگا چۆلکەن) لەلایەن قەدریە عەلی نووسراوە و بڵاوکراوەتەوە، کە تێیدا باس لە رۆڵی کاریگەریی ئافرەت لە کۆمەڵگادا دەکات و بەپێویستی دەزانێت کە رێی پێبدرێت شان بەشانی پیاو مافەکانی پیادە بکات و هیچ ئاستەنگێک لە پێشیدا نەهێڵرێت بۆ خوێندن و کارکردن و پێشخستنی کۆمەڵگا (هەولێر، ژ٣٢، ٢٨ی تەموزی ١٩٥١). بەم شێوەیە دەبینین کە ژمارەیەک مامۆستای ئافرەت لە رۆژنامەی هەولێردا، بابەتی پەروەردەییان نووسیوە ئەمەش ئەوە دەرەخات ئاستەنگەکان ئافرەتانیش سەرەڕای کاری پیشەییان بایەخیان بەکارکردن لە رۆژنامە و نووسین تیایدا داوە.

لە ژمارە (٩١)یشدا بەزمانی عەرەبی بابەتێک بەناوونیشانی (كيفية استعمال وسائل الايضاح بصورة عامة/ چۆنیەتی بەکارهێنانی هۆکارەکانی

روونکردنـەوە بەشـێوەیەکی گشـتی) لەلایـەن نەسـرین ئـەدیب نووسـراوە و بڵاوکراوەتـەوە. لـەو بابەتـەدا سـەرەتا پێناسـەی هۆکارەکانی روونکردنەوە لـە پرۆسـەی خوێنـدن و پـەروەردەدا کـراوە، پاشـان خاڵـە بنەڕەتییـەکان لـە بـەکارهێنانی هۆکارەکـانی روونکردنـەوەدا خراونەتـە روو (هـەولێر، ژ٩١، ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٢).

لە ژمارە (١١١)شدا بەزمانی عەرەبی بابەتێک بەناوونیشانی (العصا في التربية/ لێدان بەدار لە پەروەردەدا) لەلایەن هـ. ئەمین رواندزی نووسراوە، کە تیایدا نووسەر ئـەو کردارە لـە پـەروەردەکردنی منداڵاندا رەت ناکاتـەوە، بـەڵام چەنـد خاڵێک دەخاتـە ڕوو بـۆ لەبـەرچاوگرتنیان لـەکاتی سـزادانی منداڵانـدا و بە بۆچوونی ئەو منداڵە لەکاتی سزادانیدا دەبێ ئەو هەستەی لەلا دروست بێت کە ئـەوە ئـەنجامی هەڵەکەیـەتی نـەک تۆڵەکردنـەوە لێی (هـەولێر، ژ١١١، ١٧ی ئاداری ١٩٥٣).

ژیـانی خێزانـی و پرۆسـەی هاوسـەرگیریش کـە ئـافرەت بەشـێکە لێیـان، لە رۆژنامەی هەولێردا رەنگیانداوەتەوە بۆ نموونە لە ژمـارە (٣٦)ی رۆژنامـەی هەولێردا بابـەتێک بـەزمانی عـەرەبی بەناوونیشـانی (التغيرات التي حدثت على حياة الاسرة في بلدان الشرق الاوسط/ ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسـەر خێزاندا هاتووە لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا) بەپێنووسی (ع. برية) نووسراوە، کە پێدەچێت ئەو نووسەرە مامۆستا عەلی جوکل بەرییە (١٩٢٥-٢٠١٣) بێت لـەو بابەتەدا نووسـەر باسی رۆڵی ئافرەت لە مێژوودا دەکات کە چۆن شان بەشانی پیاو رۆڵی گێڕاوە لـە گـەیشـتن بەئامانجـەکانی ژیـان، هـەروەها نووسـەر باسـی تێڕوانینی پیاو بەرانبەر ئافرەت دەکات بەتایبەت دوای جەنگی یەکـەمی جیهـانی کـە لـەژێر کاریگـەریی نووسـەرو بیرمەنـدانی کۆمـەڵایەتیـدا تێڕوانینـی پیـاوان گۆڕانکارییان بەسەردا هـاتووە و پشـتگیریی مافـەکانی ئافرەتانیـان کـردووە کـە ئەوەش بۆتە هۆکاری پێشکەوتنی بەرچاو لە ژیانی خێزاندا (هەولێر، ژمارە ٣٦، ٢٥ی ئاب ١٩٥١).

لـە ژمارەکـانی ٧٦ و٧٧ی ئـەو رۆژنامـەیەشـدا، بـەدوو زنجیرە بابـەتێک بەناوونیشـانی (ژنهێنـان و ژیـانی ژن و مێردایـەتی) لەلایـەن عەبدولمەجیـد

حەسەن نووسراوە و زەکی ئەحمەد هەناری وەریگێڕاوە، بڵاوکراوەتەوە، کە تێیدا نووسەر ژنهێنان بەپێویستییەکی کۆمەڵگە و بناغەی ژیان دادەنێ (هەولێر، ژمارە ٧٦، ١٧ی حوزەیران ١٩٥٢)، هەروەها جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە ژن و پیاو هەردوولا رەزامەندبن بۆ هاوسەرگیری و ژن بۆی هەیە لەڕووی باوک و گەورەکانی رابوەستێ، ئەگەر رەزامەندی لەسەر پیاوێک نەبێت بۆ هاوسەرگیری (هەولێر، ژمارە ٧٧، ١ی تەموزی ١٩٥٢). ئەوەش بابەتێکی گرنگ بووە بۆ بڵاوکردنەوەی هۆشیاری لەنێو کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەی کوردستان سەبارەت بە سەربەستی ئافرەت لە پێکهێنانی ژیانی هاوسەریدا، تا ببێتە بنەمایەک بۆ پێکهێنانی خێزانێکی بەختەوەر.

هەر سەبارەت بەژیانی هاوسەرگیری، لە ژمارە ٨١دا بابەتێکی دیکە بەناوونیشانی (ژنهێنان و شووکردن لەپاش دڵداری و یەکدیتن) بەپێنووسی محەمەد رەشید نووسراوە. لەو بابەتەدا نووسەر باس لە زۆر بەشوودانی ئافرەت دەکات، بەتایبەت لەو کاتەی کە هەژاری دەبێتە رێگر لەبەردەم گەیشتنی دوو دڵدار بەیەکتر و رەچاوی ئاستی هۆشیاری و خوێندەواری ناکرێت، بەڵکو رەچاوی ئاستی ماددی دەکرێت (هەولێر، ژمارە ٨١ ٢٩ی تەموزی ١٩٥٢).

هەر سەبارەت بەژیانی خێزان، نووسەرێک بەناوی (ژ) لە ژمارە ٣١دا بابەتێکی نووسیوە بەناوونیشانی (خانمەکەم ژنێکی باش بە!) تێیدا نووسەر لەپێناوی خێزانێکی ئارام و بەختەوەردا هانی ژن دەدات کە بەڕووی خۆش و دڵێکی جۆش و بەرگێکی خاوێن و رەنگاوڕەنگ و ئارایشی جوانەوە پێشوازی لە پیاوانیان بکەن، بۆئەوەی ماندوویێتی بحەسێتەوە و بەختیاری و ئاسوودەیی هەمیشەیی خێزانەکە داپۆشێ (هەولێر، ژمارە ١٣١، ٣٠ تشرینی یەکەم ١٩٥٣).

لە هەردوو ژمارەی ١٣٦و ١٣٧یشدا، سەبارەت بەژیانی خێزانی، لە دوو زنجیرەدا، بەڵام بە دوو ناوونیشانی جیاواز یەکەمیان بەناوونیشانی (الاسباب المؤدية الى الخلاف الزوجي/ ئەو هۆکارانەی دەبنە ناکۆکی ژن و مێرد) و دووەمیشیان بەناوونیشانی (الاسباب المؤدية الى تأخر الزواج والخلافات الزوجية/ ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی دواکەوتنی هاوسەرگیری و ناکۆکیی

نێوان ژن و مێرد)، بابەتێک لەلایەن عادل حاجی سالّح موختار بەزمانی عەرەبی نووسراوە، کە تیایاندا نووسەر بەشێک لەهۆکارەکانی دروستبوونی کێشە و ناکۆکی لەنێوان ژن و مێرددا دەگەڕێنێتەوە بۆ باوانیان کە کوێرانە کچ و کوڕەکانیان دەخەنە نێو پرۆسەی هاوسەرگیرییەوە، بەشێکی دیکەش لە هۆکارەکان دەخاتە ئەستۆی خودی ژن و مێردەکە کە وەکو پێویست بایەخ بەیەکتری نادەن (هەولێر، ژ١٣٦، ٣٠ تشرینی دووەمی ١٩٥٣؛ هەولێر ژ١٣٧، ٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٣).

**ئەنجامەکان :**

لە ریگەی ئەم توێژینەوەیەدا بەچەند ئەنجامێک گەیشتین کە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا دەیانخەینە ڕوو:

١.(هەولێر) رۆژنامەیەکی پیشەیی هەفتەیی بوو لەلایەن کۆمەڵەی مامۆستایانی- لقی هەولێر دەرچوو بەشێکی زۆری ئەو بابەتانەی تێیدا بڵاوکراوەتەوە تایبەت بووە بەکاروباری مامۆستایان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بابەتی ئەدەبی و زانستی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی گرنگی زۆری پێدراوە و لاپەڕەکانی رۆژنامەکانیان دەوڵەمەند کردووە.

٢.رۆژنامەی هەولێر بەبایەخەوە رۆڵی ئافرەتی کوردی لە بواری مێژوودا باس کردووە نموونەشی خانزادی میری میرنشینی سۆرانە کە چۆن توانیویەتی کاروباری ناوخۆی میرنشینەکە لەماوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی بەشێوەیەکی رێکوپێک بەڕێوە ببات بەجۆرێک لە سەردەمی ئەودا ئارامی و هێمنی باڵی بەسەر هەریری پایتەختی میرنشینەکە کێشابوو. جگە لەوەش پارێزگاری لە سنووری میرنشینەکە کردبوو لە ئەگەری هەر هێرشێکی دەرەکی.

٣.بارودۆخی کۆمەڵایەتی ژیانی ئافرەتی کورد لە ژمارەکانی ئەم رۆژنامەیەدا رەنگی داوەتەوە کە لە چەند ژمارەیەکدا تیشک خراوەتە سەر ژیانی ئافرەت، وەکو دایک، هاوسەر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی رەهایانە رەخنەی لە ئافرەتی کورد گرتووە لە ژیانی رۆژانەیان لە بەخێوکردنی منداڵەکانیان و ژیانی هاوسەرگیرییان ... هتد.

٤.بابەتێکی دیکەی ئەم رۆژنامەیە گرنگی پێداوە ئافرەت وەکو نووسەر لەم رۆژنامەیەدا، ئەگەر سەرنج بدەین ئافرەت وەکو توێژی مامۆستا لە دەستەی بەڕێوەبردن و نووسەرانی ئەو رۆژنامەیە بەرچاو دەکەوێت لە چەند ژمارەیەکدا بابەتەکانیان بڵاوکردۆتەوە، ئەگەرچی زۆربەی بابەتەکانیان بەشێوەیەکی گشتی بووە بەڵام هەنگاوێکی زۆرباش بوو بۆ دەستگرتن و هاندانی ئافرەتی کورد شان بەشانی پیاوان بەنووسینەکانیان جێ پەنجەیان دیاربێ لە رۆژنامە و گۆڤارەکان.

**پەراوێزەکان:**

١. عەبدولمەجید حەسەن دوای ئەوەی بەپێی فەرمانێکی میری لە ١ی نیسانی ١٩٥٠ کرایە بەڕێوەبەری مەعاریف لە شاری هەولێر، لەگەڵ ژمارەیەک لە مامۆستا دڵسۆزەکانی ئەم شارە بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەی مامۆستایانیان لە هەولێر هێنایە ئاراوە و هەوڵەکانیشیان خستەگەڕ، سەرەنجام لە٥ی نیسانی هەمان ساڵدا کۆبوونەوەی هەڵبژاردنی یەکەم دەزگای بەڕێوەبردنی لقی هەولێری کۆمەڵەی مامۆستایان بەسەرپەرشتی مامۆستا عەبدولمەجید حەسەن ئەنجامدرا و دەستەیەکیشیان بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکە هەڵبژارد کە پێکهاتبوون لە: عیزەدین فەیزی (سەرۆک)، جەمیل رەشید ئامێدی (جێگری سەرۆک)، ئەستێر سەعید (ئەندام)، حەمدیە سابیر (ئەندام)، حەیدەر عوسمان (ئەندام)، جەمال جەمیل (ئەندام)، یوسف شێخ یەحیا (ئەندام)، جومعە محەمەد سەفار (ئەندام)، مستەفا حەسەن شەعبان (ئەندام). ئەو کۆمەڵەیە هەر لە سەرەتاوە چەندین کارو چالاکی گرنگی ئەنجام دا لەوانەش سازدانی یەکەم وەرزی رۆشنبیری لە شاری هەولێر و کردنەوەی دەرسی نموونەیی بۆ ژن و پیاو پێکەوە، هەروەها دامەزراندنی کۆمەڵەی هەرەوەزی بۆ یارمەتیدانی مامۆستایان و زۆر کاری دیکەش. هەر بەهەوڵی ئەو کۆمەڵەیەش بۆ یەکەمین جار کچان توانییان بەشداری لەنمایشی وەرزشی ساڵانەی قوتابخانەکان بکەن و رۆڵێکی باشیشی گێڕا لە پێشخستنی خوێندن بە زمانی کوردی لە لیوای هەولێردا ئەویش بەکردنەوەی قوتابخانەی نوێ لە

ناوەوە و دەرەوەی شار. یەکێکی دیکەش لەکارە گرنگەکانی ئەو کۆمەڵەیە دەرکردنی رۆژنامەی هەولێر بوو (بڕوانە: فەیزی، ١٩٨١، ل٢٩، فەیزی، ٢٠٠٦، ل٧٠-٧٢، کوردستانی نوێ، ژمارە ٢٦٩، ١٩٩٢/١٢/١٦، گۆڤاری هەولێر، ژمارە ٧، هاوینی ٢٠٠٠، ل٧١).

٢. جەمیل رەشید ئامێدی ساڵی ١٩١٧ لەدایکبووە دەرچووی کۆلیژی پەروەردەی بەشی کیمیایی زانکۆی مووسڵە دواتر بوو بە بەڕێوەبەری ئامادەیی رواندوز، هەرلەوێش ژیانی هاوسەرگیری پێکهێناوە ١٩٥٣-١٩٥٦ بۆتە بەڕێوەبەری ئامادەیی کاوە لە دهۆک ماوەی نێوان ١٩٥٩-١٩٦٢ چۆتە ولاتی سعودیە مامۆستای خوێندنی ئامادەیی بووە لە پایتەختی سعودیە لە ساڵی ١٩٩٩ کۆچی دوایی کردووە، (رۆژنامەی هەولێر، ٢٠١٨، ل١١).

٣. عەبدولمەجید حەسەن ئامێدی ساڵی ١٩٠٥ لە مووسڵ لەدایکبووە خوێندنی سەرەتایی و خوێندنی تایبەتی ئایینی و خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٢٥ دا تەواو کردووە پاشان لە هەمان ساڵدا بۆتە مامۆستا لە مووسڵ. چەندین جار کراوەتە بەڕێوەبەری پەروەردەی ( سلێمانی، هەولێر و مووسڵ) ئەندامی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی هەولێر و بەڕێوەبەری بەشی عەرەبییەکەی بووە. (رۆژنامەی هەولێر، ٢٠١٨، ل١١).

٤. عزەدین فەیزی ساڵی ١٩١٧ لە بنەماڵەیەکی ئایینی شاری هەولێر لەدایکبووە و نەوەی زانای ناودار مەلا جەرجیسی ئەربیلییە. ساڵی ١٩٣٩ خانەی مامۆستایانی لە بەغدا تەواو کردووە لەو ساڵەوە بۆتە مامۆستا و دواتر بەڕێوەبەری قوتابخانە و سەرپەرشتیاری پەروەردە و چەندین پلەی دیکەی پەروەردەیی تا ساڵی ١٩٧٦ لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوە. رۆڵی بالای لە چەسپاندنی خوێندن بەزمانی کوردی و وشیارکردنەوەی نەتەوەیی و کردنەوەی قوتابخانەی شەوانە بۆ خەڵکی نەخوێندەوار هەبووە. ساڵی ١٩٥٠ بەیەکەم سەرۆکی کۆمەڵەی مامۆستایان لە هەولێر هەڵبژێردراوە، ساڵانی ١٩٣٩-١٩٤٥ بەرپرسی حزبی هیوا بووە لە هەولێر ١٩٨٥/١٢/٢٢ کۆچی دوایی کردووە. (رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٧٧٣)، ١٩٩٤/٧/١٧).

٥. ئەستێر سەعید ساڵی ١٩٢٢ لەدایکبووە خەڵکی ماردینی باکووری کوردستانە، هاوسەری (دکتۆر حیکمەت حەکیم) بووە، لە ساڵی ١٩٤٠ خانەی مامۆستایانی لە بەغدا تەواوکردووە، بەڕێوەبەری قوتابخانەی خانزادی کچان بوو لە هەولێر. ساڵی ٢٠١٠ لە نەمسا کۆچی دوایی کردووە (رۆژنامەی هەولێر، ٢٠١٨، ل١١).

٦. جومعە محەمەد صەفار ساڵی ١٩١٥ لە هەولێر لەدایکبووە، ساڵی١٩٣٥ وەکو مامۆستا دەستبەکار بووە. لە قوتابخانەکانی ئەربیلی ئولا و سانیە و سالیسە مامۆستا بووە، هەروەها بەڕێوەبەری قوتابخانەی موزەفەریەی سەرەتایی بووە. ساڵی ١٩٧٥ کۆچی دوایی کردووە (رۆژنامەی هەولێر، ٢٠١٨، ل١١).

٧. حسێن رەشوانی ساڵی ١٩٢١ لە بنەسڵاوە لەدایکبووە، خوێندنی لە میسر تەواوکردووە دوو بڕوانامەی لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە بەمامۆستای دواناوەندی هەولێر دامەزراوە. بەرپرسی بەشی عەرەبی رۆژنامەی هەولێر بووە. لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (کاروان) و دواتر سەرنووسەری بووە. سەرپەرشتی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە شێخان و تەلەعفەر و خانەقین و...هتد بووە دواتر بۆ ماوەی سێ ساڵ دوورخراوەتەوە بۆ ناسریە، ١٩٩٧/٥/١١ کۆچی دوایی کردووە (رۆژنامەی هەولێر، ٢٠١٩، ل١٢).

٨. کەمال شاکر مەحموود ساڵی ١٩٢٧ لە مووسڵ لەدایکبووە، خانەی مامۆستایانی لە ساڵی ١٩٥٠ لە بەغدا تەواو کردووە، لە چەند قوتابخانەیەکی شاری هەولێر مامۆستا بووە، پاشان کراوەتە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی (سەرەتایی و سەرپەرشتیاری یەکەمی سەرەتایی) بووە. لە ساڵی ٢٠٠٣ کۆچی دوایی کردووە.

٩. ناهیدە شێخ سەلام، کچی شێخ ئەحمەدی عازەبانە ساڵی ١٩٢٢ لە سلێمانی لەدایکبووە، ساڵی ١٩٤٢ خانەی مامۆستایانی لە بەغدا تەواو کردووە. لە شارەکانی هەولێر و شەقڵاوە و کەربەلا و کوت و بەغدا...هتد مامۆستا بووە ساڵی ٢٠٠٥ لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

١٠. نەعیمە سابیر فەتحوڵڵا، ساڵی ١٩٢٥ لە قەڵای هەولێر لە دایکبووە، خانەی مامۆستایانی لە بەغدا تەواو کردووە، لە قوتابخانەکانی رواندز و هەولێر مامۆستایەتی کردووە، ساڵی ٢٠١١ کۆچی دوایی کردووە.

١١. بەستێ سابیر فەتحوڵڵا، ساڵی ١٩٢٨ لە قەڵای هەولێر لەدایکبووە، خانەی مامۆستایانی لە ساڵی ١٩٤٣ لە بەغدا تەواو کردووە لە قوتابخانەکانی رواندز و هەولێر مامۆستایەتی کردووە، خێزانی حسێن رەشوانی – بەرپرسی عەرەبی رۆژنامەی هەولێر بووە. ساڵی ٢٠١٣ کۆچی دوایی کردووە.

١٢. حەمدیە سابیر، ساڵی ١٩٢٤ لە قەڵای هەولێر لەدایکبووە، خانەی مامۆستایانی لە بەغدا تەواو کردووە، لە چەند قوتابخانەیەکی شاری هەولێر وانەی (ئینگلیزی) وتۆتەوە بۆ یەکەمین جار فێرگەی نەهێشتنی نەخوێندەواری لەگەڵ چەند مامۆستایەک لە هەولێر کردۆتەوە و بەڕێوەبەری کاوەی شەوان بووە. لە ژیان ماوە لە ئەڵمانیا دەژی (رۆژنامەی هەولێر، ٢٠١٩، ل١٥).

**سەرچاوەکان:**

**یەکەم – کتێب:**

**أ- بە زمانی کوردی:**


١. خەزنەدار، جەمال، رابەری رۆژنامەگەری کوردی ، (بغداد، ١٩٧٣).

٢. زامدار، مەحمود، رۆژنامەی هەولێر حیکایەتی سەرهەڵدان و کۆتایی ١٩٥٠- ١٩٥٣، (بێ شوێنی چاپ)، ١٩٨٨.

٣. سمکۆ، عەبدوڵڵا ئەنوەر، رۆژنامەوانیی کوردی شاری هەولێر ١٩٣٥- ١٩٧٥، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەڵات، (هەولێر، ٢٠١٢).

٤. فەیزی، عیزەدین، یەکێتی نووسەرانی کورد و دوو کۆڕ، چاپخانەی شارەوانی هەولێر، هەولێر، ١٩٨١.

٥. فەیزی، گۆران سۆران، باری ئەدەبی کوردی لە شاری هەولێر لەنێوان ساڵانی ١٩٣٥–١٩٥٨، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.

٦. قادر، سەرۆ، ئافرەت کێشەیەک بەدرێژایی مێژوو، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر، ٢٠٠٩).

٧. كاكە سور، محەمەد عەبدوڵڵا، گەشەكردنی خوێندنی فەرمی لە لیواكانی كوردستانی عێراقدا، چاپی یەكەم، (هەولێر، ٢٠٠٤).
٨. هەروتی، سەعدی عوسمان، خانزادی سۆران و ئەدەبی زارەكی، (هەولێر، ٢٠١٨).

**كتێب بە زمانی عەرەبی:**

١. جباری، جبار، تاريخ الصحافة الكردية في العراق، بغداد، ١٩٧٥.
٢. جەرجیس، نزار، صحافة اربيل، بغداد، ١٩٨٨.

**دووەم: رۆژنامە:**

**ژمارەكانی رۆژنامەی هەولێر:**

١. ژ ٥، ١٣ كانوونی دووەمی ١٩٥٠
٢. ژ ٦، ٢٠ كانوونی دووەمی ١٩٥٠
٣. ژ ١٦، ٣١ ئاداری ١٩٥١
٤. ژ ٢٥ ، ٢ حوزەیرانی ١٩٥١
٥. ژ ٢٦، ٩ حوزەیرانی ١٩٥١
٦. ژ ٢٨، ٢٣حوزەیرانی ١٩٥١
٧. ژ ٢٩، ٣٠ حوزەیرانی ١٩٥١
٨. ژ ٣٠، ١٤ تەمووزی ١٩٥١
٩. ژ ٣١، ٢١ تەمووزی ١٩٥١
١٠.ژ ٣٢، ٢٨ تەمووزی ١٩٥١
١١.ژ ٣٦، ٢٥ ئابی ١٩٥١
١٢.ژ ٤٣، ٢ تشرینی یەكەمی ١٩٥١
١٣.ژ ٧٦، ١٧ حوزەیرانی ١٩٥٢
١٤.ژ٧٧، ١ تەمووزی ١٩٥٢
١٥.ژ ٨١، ٢٩ تەمووزی ١٩٥٢
١٦.ژ ٨٢، ٥ ئابی ١٩٥٢
١٧.ژ ٩٠، ٧ تشرینی یەكەمی١٩٥٢
١٨.ژ ٩١ ، ١٥ تشرینی یەكەمی ١٩٥٢
١٩.ژ ١١١، ١٧ ئاداری ١٩٥٣
٢٠.ژ ١٢٢، ٢ حوزەیرانی ١٩٥٣

٢١.ژ ١٣٠، ٢٢ تشرینی یەکەمی ١٩٥٣
٢٢.ژ ١٣١، ٢٩ تشرینی یەکەمی ١٩٥٣
٢٣.ژ ١٣٦، ٣٠ تشرینی دووەمی ١٩٥٣
٢٤.ژ ١٣٧، ٧ کانوونی یەکەمی ١٩٥٣

**کوردستانی نوێ:**

١. ژ ٢٦٩، ١٩٩٢/١٢/١٦
٢. ژ ٧٧٣، ١٩٩٤/٧/١٧

**سێیەم: گۆڤار:**

١. گۆڤاری هەولێر، ژمارە ٧، هاوینی ٢٠٠٠.

**چوارەم: دیدار:**

١. دیدار لەگەڵ پارێزەر تاریق جامباز، هەولێر، ٢٣ی حوزەیرانی ٢٠١٩.

**ملخص البحث**
**المرأة في جريدة هەولير**
**١٩٥٠- ١٩٥٣**

كانت هەولير (جريدة أدبية ثقافية اسبوعية)، تصدرها جمعية المعلمين- فرع اربيل خلال السنوات ١٩٥٠- ١٩٥٣ وقد صدر منها (١٤٠) عددا ويعد صدورها منعطفا جديدا في تاريخ الصحافة لهذه المدينة في مجال التنوير. لعبت المرأة دورا في تلك الجريدة كجزء من هيئة التحرير من جهة والنشر فيها من جهة اخرى، كما تناولت الجريدة في موضوعاتها الحياة- الاجتماعية والدور التأريخي للمرأة.

هذا البحث يتكون من عدة مباحث فضلا عن الاستنتاج وقائمة المصادر وخلاصة باللغتين العربية والانكليزية.

المبحث الاول، خصص لتعريف الجريدة. وتطرق في المبحث الثاني لدور المرأة في تاريخ الكورد. وفي المبحث الثالث ألقينا الاضواء على صدى اوضاع المرأة الحياتية في صفحات الجريدة. اما في المبحث الرابع فقد عرضنا مكانة المرأة في الصحيفة ككاتبة.

**Abstract**

**Woman in HawlerNews Paper**

**1950-1953**

It was a weekly Literary intellectual newspaper issued by the teachers association. It was published just for 140 numbers. -Hawler newspaper was based for intelligence provision to Hawler city to be nemar ked as a turning point throughout the ared of enliyhtment .

Woman had her outstanding practice in this newspaper as editorial staff member ship and topic publication which in cluded their social life and historicalpositions.

The research includes four studiesm, conclusion, tist of sources and abstract in Arabic and English languages.

The first study is dedcicated for the familiarsation of Hawlernesws paper. The second one talks about women,s role in Kurdish history. In the third study, we have highlighted the reflection of women,slife conditions in Hawlernewspaper,s speaking about the women writers appeared on the newspaper.

Finally, in somepoints, we have shown what we conluded through our topic study.

# تیشكێك بۆ سەر چەند لایەنێكی داب و نەریت لە میزۆپۆتامیا و كاریگەرییان لە سەر هزری كۆمەڵگا

## (كۆمەڵگای كوردەواری بە نموونە)

**م.ی.شیرین محەمەد داود**
بەشی ڕێبەری گەشتیاری
پەیمانگەی تەكنیكی كارگێڕی هەولێر
زانكۆی پۆلیتەكنیک

**پێشەكی**

زانستی شوێنەوارناسی لەم سەردەمانەی دواییدا گرنگییەكی زۆری بە توێژینەوەی سەردەمەكانی پێش مێژوو داوە، بە مەبەستی ئاشنابوون بە سیستەمی ژیانیان، لە هەمان كاتدا تێگەیشتن لە ڕۆشنبیری و شێوازی شارستانی و ئایدۆلۆژیا و ئەو بنەمایانەی كە ڕۆڵ و كاریگەرییان هەبووە لەسەر شێواز یاخود چۆنیەتی هەڵس و كەوتكردنیان. (كسار، ١٩٨٣، ص٢٢) لە هەمان كاتدا ئەو بەڵگە شوێنەواری و مرۆڤناسییانەی سەبارەت بە چاخەكانی پێش مێژوو كە لەبەر دەستی توێژەراندایە دەریان خستووە، كە مرۆڤ لە سەردەمی چاخە بەردینەكاندا پەیڕەوی كاری جادووگەری كردووە، لە ئەنجامی بەردەوامی توێژینەوەكانی توێژەرانیش دەركەوتووە، لە بارەی ئەو بەڵگە شوێنەوارییانەی كە لەبەر دەستی توێژەراندان ، سەبارەت بە بابەتی جادووگەری، دەریان خستووە كە پەیڕەوكردنی كاری جادووگەری بەردەوامی هەیە و لە چاخە هەرە كۆنەكانەوە تاكو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان. (التركي، ٢٠١٣، ص١٣).

بێگومان توێژینەوە زانستییەکانی ئەم سەردەمە چەندین زانیاریی گرنگیان خستۆتە بەردەستەوە ئەم توێژینەوانەی لە لایەن زانایانی بواری مرۆڤناسی و سۆسۆلوجیا ئەنجامدراوە، لەم توێژینەوانەشدا هەوڵیان داوە شیکردنەوە و لێکدانەوەی (لۆجیکی – مەنتیقی Logical ) بۆ پەیڕەوکردنی کاری جادووگەری و پاراسایکۆلۆژی (Para-psychological) بکەن کە لە لایەن مرۆڤی کۆن پەیڕەو دەکران پاراسایکۆلۆژیشیان بەم شێوەیە پێناسە کردووە: (پاراسایکۆلۆژی وشەیەکە لە دوو بڕگە پێکهاتووە، بڕگەی یەکەم "پارا" واتای دەرەوەی سنوور یاخود بازنە دەگەیەنێ (خارج نطاق) و بڕگەی دووەم "سایکۆلۆجی" واتە زانستی دەروونناسی هەردوو وشەکە بەیەکەوە بە واتای لە دەرەوەی چوارچێوەی زانستی دەروونناسی دێت، ئەم وشەیە تاکو ئێستاش لە توێژینەوەدایە. (الترکي، ٢٠١٣، ص٣٢) کە لە لایەن مرۆڤی کۆن ئەنجامدراوە. گومان لەوەدا نییە کاری جادووبازی و ئەفسووناوی کاریگەریی ڕاستەوخۆیان لە سەر ژیانی مرۆڤی کۆن و تەنانەت لە سەر ژیانی مرۆڤی ئەم سەردەمەش هەبووە، بە شێوەیەک دەبینین ئەو زانایانەی کە لەم بوارە کاردەکەن دەریان خستووە، پەیڕەوکردنی ئەم جۆرە کارە ئەفسووناوییانە لەلایەن مرۆڤی کۆن جادووگەرییە و لە هەمان کاتدا پەیڕەوکردنی لە لایەن مرۆڤی سەردەمیش بە کاری پاراسایکۆلۆژی لە قەڵەمیان داوە. (الترکي، ٢٠١٣ ص١٣) ڕەگ و ریشەی پەیڕەوی کارە جادووبازی و ئەفسووناوییەکان لە هەڵسوکەوتی و ژیانی کۆمەڵگای کۆنی ڕۆژهەڵاتی خواروو بە گشتی و کۆمەڵگای کۆنی میزۆپۆتامیا بە تایبەت بەرجەستە دەکەین، توێژەرانیش بە یاسای جادووبازی ناوی دەبەن، ئەم یاسایانەش کۆنترۆڵی ڕەفتار و کردەوەکانی کۆمەڵگای کۆن و نوێیان کردووە، لەم توێژینەوەدا هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی زانستییانە بیانخەینە ڕوو. بێگومان ئەم کاریگەرییەش لە ڕێگەی کارتێکردنی بیری مرۆڤەوەیە لە بەر ئەوەی بیری مرۆڤ لە وڵاتی میزۆپۆتامیا بە خەیاڵ داپۆشراوە،

(فرانکفورت، ١٩٦٠، ص١٣) تێگەیشتنیشمان لەم بابەتە یارمەتیمان دەدات بۆ ئاشنابوونمان بە مێژوو و سروشتی ژیانی تاک و کۆمەڵگای کۆن، بەم شێوەیەش دەتوانین بگەین بە چەندین نیشانە و هێما و بەڵگەیەک کە بەها و ئەنجامی مێژوویی گرنگیان هەیە ...

بەتایبەتی تێگەیشتن لەو کەلتوورەی کە لە دیدگای کۆمەڵگادا پەنگی خواردووە بە درێژاییی هەزاران ساڵ. (الترکي، ٢٠١٣، ص١٣) کەواتە لێرەدا ڕوون دەبێتەوە توێژینەوەی مێژووی کۆن هۆشیارمان دەکاتەوە بۆ تێگەیشتن لە ئێستای مرۆڤ و بنەما سەرەکییەکانی کەلتووری مرۆڤایەتی لە کۆندا، بەم شێوەیەش توێژینەوەی مرۆڤی کۆن لە لایەن توێژەران بە پێویست دانراوە بەمەبەستی تێگەیشتن لە مێژووی هاوچەرخ و ئێستای مرۆڤ، کەواتە توێژینەوە لە مێژوو بە دەسکەوتێکی گرنگ دادەنرێ بۆ ئاشنابوونی مرۆڤ بە ڕابردووی خۆی هەروەک بەشێک لە توێژەران مێژوو بە بیر و هەستی مرۆڤ ناودەبەن بێگومان ڕابردووشی کاریگەری لەسەر ژیاننامە و بەسەرهات و ئێستای تۆماردەکەن. (باقر،٢٠٠٩، ص١٢١) لە هەمان کاتدا مێژووناس (MARCUS TULLIUS CICERO) لە ساڵی ١٠٦ – ٤٣ پ.ز دەڵێ "ئەگەر هیچ شتێک نەزانی کە بەر لەدایکبوونت ڕوویداوە ئەوا هەرگیز گەورە نابیت" کەواتە لێرەدا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بنچینەی ئەو زانیارییانەی کە کۆمەڵگای کۆنی میزۆپۆتامیا پێیگەیشتووە لە ڕۆشنبیری و ئەفسانە و داهێنان. (الترکي، ٢٠١٣، ص١٣) کەواتە لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدەدەین تیشک بخەینە سەر بابەتی جادووگەری، بەیەکێک لەو بابەتە هەرە گرنگانە دادەنرێت چەندین توێژینەوەی لە بارەوە نووسراوە ئێستاشی لەگەڵدا بێت بەشێوەیەکی ئاڵۆز و تەم و مژاوی ماوەتەوە، لێرەدا دەمانەوێ هەندێ بابەتی تازە لەم بوارە بخەینە ڕوو کە لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا بەرجەستەیان دەکەین....

گرنگیی توێژینەوە: ئەو بیروباوەڕانەی لە نێو کۆمەڵگەی کۆنی میزۆپۆتامیادا هەبوون، کاریگەری لەسەر مرۆڤی ئەم سەردەمەدا

جێهێشـــتووە، بە تـــایبەت ئەو بیروبـــاوەڕانەی لە نێـــو کـــۆمەڵگەی کوردەواریدا بەرجەستەیان دەکەین بەمەبەستی گەیشتن بەو ئامانجەی ئایا، مرۆڤی ئەم سەردەمە کە پەیڕەوی ئەم بیروباوەڕە کۆنانە دەکات لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کە جیهان لەو پەڕی پێشکەوتندایە تا چەند بڕوای بەم کـــرداره ئەفســـووناوییانه هەیە و پەیڕەویـــان دەکـــات؟ ئەم توێژینەوەیەمان بە پێویست زانی.

گیروگرفتـــی تـــوێژینەوە: لە دیـــارترین ئەو گیروگرفتـــانەی لە نووسـینی ئەم تـوێژینەوەیەدا دووچـاری بـووین دەسـتکەوتنی داتـا و زانیاری بوو، لە بارەی شوێنەوارەکانی وەک نزاگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی کەندەکۆخ بەتایبەتی کە لە چەندین شوێن لە کوردستاندا بوونی هەیە، نەمـــانتوانی زانیـــاریی تەواو لە بـــارەی مێـــژووەکەی بە دەســـت بێنین... بێجگە لە کەمیی سەرچاوەکان لەم بارەیەوە.

**خوێندنەوەیەک بۆ کۆمەڵگەی میزۆپۆتامیا و کۆمەڵگەی کوردەواری:**

زانایـانی بـواری شوێنەوارناسـی و مـرۆڤ ناسـی لە سـەرووی هەمووییـان زانـای بەناوبانـگ (جـیمس فریـز) دەڵـێ "بـۆ تێگەیشـتن لە شارسـتانیەتی کـۆمەڵگە کۆنەکـان، پێویسـتە بەراوردیـان بکەیـن بەو کەلتوورەی کە لە نێو کۆمەڵگاکانی سەدەی نۆزدەدا بوونیان هەبووە، ئەو کۆمەڵگا جیاوازانەی کەوا پێیـان دەوترێت کۆمەڵگـای سـەرەتایی، بەپێـی داڕشـتنی فریـزر". (فریـزر،١٩٧١، ص١٠) بـۆیە لەم تـوێژینەوەیەدا هەوڵـدەدەین تیشـک بخەیـنە سـەر هەنـدێ داب و نەریتـی کـۆن لە میزۆپۆتامیـا، لە ڕێـگەی بەراورد کردنـی بە هەنـدێ لەو ڕەفتـارە کەلتوورییـانەی کە تـاکو ئێسـتاش بە ڕوونـی بەرجەسـتەیان دەکەیـن بە تـایبەتی لە بەشـێک لە ناوچەکـانی کوردسـتان و کـۆمەڵگەی ئەمـڕۆی کوردەواریدا.

تـوێژینەوە شـوێنەواریەکان ئاشـنامان دەکەن بە چەنـدین زانیـاریی گرنـگ، لە بـارەی سـەرهەڵدانی بیروبـاوەڕ لەم خـاک و کـۆمەڵگەیەدا کە

جادووگەری باڵی بەسەردا کێشابوو، (ابراهيم، ٢٠٠٩،ص٧.) بە شێوەیەک مرۆڤ پەیڕەوی هەندێ کاری ئەفسووناوی جادووگەری دەکرد، بەو بڕوایەی کەوا کاریگەرییان هەبووە لەسەر ژیانی ڕۆژانەی بە شێوازێکی ئەرێنی یاخود نەرێنی. (البرواري، ٢٠٠٣، ص٢) جادووگەری ئەو جیهانە نادیار و ئاڵۆزەیە کە هزری مرۆڤی سەرەتایی سەرقاڵ کردبوو و هەمیشە پاڵی پێوە ناوە بۆئەوەی لە ڕاستی و دروستی ئەو دیاردانەی کە لە سروشت و ژینگەی دەوروبەریدا هەبووە لێیان تێبگات و ئاشکرایان بکات، هەر بۆیە بەشێکی زۆری دیاردە سروشتییەکان هەمیشە جێگای تێڕامان و ترس و دڵەڕاوکێی بوون، ئەمەش وای کرد مرۆڤ چەندین ڕێگا بگرێتە بەر بۆئەوەی بەسەریاندا زاڵ بێت و بتوانێت زیانەکانی لە خۆی دوور بخاتەوە، بۆیە هەندێ جار وەکو خواوەند پەیکەری بۆیان دروستکردووە لە سەر بنەمای لێکچوون (مبدأ التشبيه) بۆ رازیکردنیان هەڵساوە بە ئەنجامدانی کرداری پەرستش لە پێناویدا بۆ ئەوەی لەو خواوەندانە نزیک ببنەوە، ئەمەش لە ڕێگەی پێشکەشکردنی قوربانی و ئەنجامدانی نوێژ و نزا و پاڕانەوە بووە هەندێ جاریش کاری جادووگەری ئەنجامداوە، بەم شێوەیە جادووگەری چۆتە ناو قووڵایی ناخی مرۆڤەوە، وەک هۆکارێکی کارتێکەر و چارەسەر بووە بۆ هەموو کێشەکانی مرۆڤی کۆن. (الدوري، ٢٠٠٩، ص١٣ و صاحب، ٢٠١٢، ص٦) ئەم کردارەش کاهنەکان ڕۆڵی گرنگیان هەبووە لە ئەنجامدانی، وەک خوێندنەوەی بەخت و دیاریکردنی لایەنی چاکە و خراپە و پاشەڕۆژ و چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بە جادوو و فاڵگرتنەوە، تا وای لێهات ژمارەیەک لە خەڵکی میزۆپۆتامیا ببوون بە پسپۆر لەم بوارەدا، دۆزینەوەی ئەندازەیەکی زۆر لە تێکستی جۆراوجۆر بەڵگەی بەهێزن لەسەر ئەم ڕاستییە. (احمد، ١٩٨٨، ص١٤١ - ١٤٣)

لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە جادووگەری بەشێک بووە لە بیر و باوەڕی کۆنی دانیشتوانی میزۆپۆتامیا و نەتەوە کۆنەکانی تر. (الدوري،

٢٠٠٩، ص٤٢.) تاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان ئەم جۆرە بیرو باوەڕانە لە ناو کۆمەڵگادا بەرجەستە دەکەین... لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدەدەین بەرچاوترین نموونەی ئەو دیاردانەی کە بەردەست کەوتوون لەم توێژینەوەیەدا بخەینەڕوو.

ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە زۆربەی توێژەران کۆکن لە بارەی کردارە جادووگەرییەکان لە سەرووی هەموویان (جیمس فریزر) کە دەڵێت: مرۆڤ بە هۆی دوو بنەما توانیویەتی کرداری جادووگەری ئەنجام بدات، ئەوانیش لە بنچینەدا بریتین لە (مەنتیق - لۆجیکێکی) سەرەتایی. (فریزر،١٩٧١ ص٤٦ و الدوري ٢٠٠٩ ص٤٦)

**بنەماکانی جادووگەری:**

**یەکەم: بنەمای جادووگەری لە یەکچوون (التشابە) یاخود (قانون السحر التشاكلي):**

لە ئەنجامی تێڕوانینی تاکەکانی کۆمەڵگای میزۆپۆتامیا لە سەر ئەو دیاردە جیاوازییە سروشتییانەی ژینگەی دەوروبەری کە بە شێوەیەکی زیندوو سەیری هەموو دیاردەکانی کردووە، ترس و دڵەڕاوکێی هەبووە لێیان و ویستوویەتی هێزی سروشت بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی بەکار بهێنێت بە هۆی ئەم بیرو باوەڕانەش لە هزری مرۆڤ کە لە ئەنجامی دروست بوونی زنجیرەیەک لە داب و نەریت سەری هەڵداوە، بۆیە توێژەران ئەم نەریتەیان لە نێو مرۆڤی کۆندا بەم شێوازە پێناسە کردووە و دەڵێن: (نەریت – طقوس – Ritual): بریتییە لە پەرستشێکی جووڵەیی هەموو ئەو کردارانە دەگرێتەوە کە بەندەیەک پەیڕەوی دەکات لە پێناو ڕازیکردنی پەرستراوەکەی. وە بەبڕوای زانایانی مرۆڤناسی نەریت بریتییە لە کرداری لاسایی کردنەوە، زۆر جار پەیوەندی بە ئاین و جادووەوە هەیە، بەو پێیە نەریت داتاشراوی ناو ژیانی کۆمەڵگایە کە پەیڕەوی دەکەن، وە مرۆڤی سەرەتایی پێی وابووە جێبەجێکردنی دەبێتە هۆی ڕەزامەندیی خواوەند و هێزی سەرووی

سروشت بە پێچەوانەشەوە دەبێتە هۆی تووڕەبوونی، نەریت چەندین کردار و چالاکی لە خۆ دەگرێت وەک هەڵپەڕکێ پێشکەش کردنی قوربانی... (الراوي، ٢٠٠١، ص٤).

لە هەمان کاتدا (فریزر) دەڵێت سەرهەڵدانی ئەم نەریتانە دەبێتە هۆی پەیدابوونی بنەمای لەیەکچوون، کە بە یاسای جادووگەری لەیەکچوون ناوی بردووە. (فریزر، ١٩٧١، ص٤٦) لە ئەنجامی دۆزینەوەی ئەو پاشماوە شوێنەوارییانەی کە مرۆڤی چاخە بەردینەکان، لە سەر دیواری ئەشکەوتەکان کێشاویەتی، لەوانە وێنەی ئەو ئاژەڵانەی کە ویستوویەتی ڕاویان بکات وەک سەرچاوەیەکی بژێوی پشتی پێ بەستووە، لە ڕێگای ئەم جۆرە چالاکیانە تاکو بتوانێت هەست بە ئارامی بکات و ڕاوکردنی نێچیرەکەی ئاسان بێت، وەک کارێکی لاسایی کردنەوە وێنەی ئەم ئاژەڵانەی کێشاوە، بەپێی ئەم یاسایە لێچوون لێکچوون بەرهەم دەهێنێت. (الدوري ٢٠٠٩، ص٤٢.) یاخود بە واتایەکی تر (السحر في الخيال يقابله عمل في الواقع) واتە ئەنجامدانی جادووگەری بە ئەندێشە لە بەرامبەر دەبێتە کردار لە ڕاستیدا، (کسار، ١٩٨٨، ص٢٤) و هەر بەپێی یاسای لەیەکچوونە مرۆڤ ئەگەر بیەوێت زیان بە کەسێک بگەیەنێت، ئەوا بە دروستکردنی بووکەڵەیەکی هاوشێوەی ئەو کەسە دەتوانێ لە ڕێگەی زیان گەیاندن بە بووکەڵەکە وەک شکاندنی دەستی وەیان کوێرکردنی چاوی ئەوا هەمان ئەو زیانانە دووچاری کەسی لێچووی بووکەڵەکە ببێت، کەواتە ئەو بووکەڵەیە وەک هێمایەک لەجیاتی مرۆڤەکە بەکار دەهێنرێت بەمەبەستی ئازار گەیاندن بەو کەسە. (الدوري، ٢٠٠٩، ص٤٢.) ئەمەش لەسەر بنەمای بوونی پەیوەندیەکی بەهێز لە نێوان شتە لەیەکچووەکان لە هزری مرۆڤی کۆندا دروست بووە، بەو واتایەی دوو شتی لەیەکچوو پەیوەندیەکی گرێدراویان بەیەکەوە هەیە هەرچەندە لە یەکتریش جیابن، بۆیە مرۆڤ هەوڵیداوە وەک جێگرەوە (بدیل Alternative) مامەڵە لەگەڵ هێما هاوشێوەکان بکات بۆ بە جێهێنانی مەرامەکانی وەک زاڵبوون بەسەر کەسی نەخوازراو یاخود چاکبوونەوە

لە نەخۆشـــی.. هەر لەم ڕوانــگەیەوە (هنــری فرانکفــۆرت) ئەم جــۆرە بیروباوەڕەی لە هزری مرۆڤی کۆن بە " الجزء بدل الکل " ناوبردووە. (بەش لەجیاتی هەموو) لەسـەر ئەم بنچینەیەش دەتوانرێ ناو یاخود تەڵێک لە پرچ یاخود سێبەر وەک بەشێک لە جەستەی مرۆڤ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ. لەبەرئەوەی تاکی میزۆپۆتامیا هەردەم هەستی کردووە کە تەڵی پرچ و سێبەر هتد.. لێواو لێو وێنای خاوەنەکەی دەکەن هەر بۆیەش بە شـێوەیەکی زینـدوو سـەیری هەمـوو شـتەکانی کـردووە. (فرانکفـورت ،١٩٦٠، ص٢٤-٢٥.) بیـرۆکەی ئەم جێگـرەوەیە ڕۆڵێکـی گرنگـی هەبووە لە بواری خۆپاراستن و چارەسەرکردنی نەخۆشی (فریزر، ١٩٧١، ص١١٧).

هۆکارەکەشـی بـۆ ڕوحـی خـراپ (Evil spirit) دەگەڕێتەوە کە دووچاری جەستەی مرۆڤ دەبێت، چارەسـەریش لە ڕێگەی دەرکردنی ئەو ڕووحە خراپە بووە لە جەستەی مرۆڤ، بە ناردنی بۆ جەستەیەکی تر کە پێی دەڵێن جێگرەوە(Alternative) ئەم جێگرەوەیەش بووکەڵەیەک دەبێت بە ڕێگایەکی جادوویی ئەم خراپییەی بۆ دەگوازرێتەوە هەروەک پێشـتر ئاماژەمـان پێدا، یـاخود هەنـدێ جـار ئەو جێگـرەوەیە ئاژەڵێـک دەبێـت دیسـانەوە هەمـوو ئەمەش کاردەکـاتە سـەر ئـاژەڵەکە و دەبێـتە هۆی مردنی، هەموو سـەرچاوەی خراپی و نەخۆشییەکە لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ جیهانەکەی تر. بەم شێوەیەش ئەو نەخۆشـی و خـراپییەی کە نەخۆشەکە دووچاری ببوو لێی ڕزگار دەبێت و چاک دەبێتەوە. (الاسود، ٢٠١٠، ص٢٥ و ساکز، ١٩٧٩، ص٣٤٥).

ئەم جۆرە چارەسـەرکردنەش چارەسـەرکردنێکی جـادووگەرییە و پشـت بە ئەنجامـدانی کـرداری جـادووگەری دەبەسـتێ، پێـی دەوترێـت چارەسەرکردنی ڕۆحی. (الخطیب، ٢٠١٤، ص٢٨٧) و (الراوي، ٢٠٠١، ص٤.) لە نێو کۆمەڵگای کوردەواریی ئەمڕۆدا بە جۆرێک کرداری جادووگەری بەرجەسـتە دەکرێـت بـۆ نمـوونە کاتێـک کەسـێک تووشـی نەخۆشـی زەردووی (Jaundice) یاخود(زەردک) دەبێت و تووشبووەکە دەبرێت

بۆ چیای زەردک[1]، ماسییەک ڕاو دەکەن و دەیهێننە لای نەخۆشەکە دایدەنێن تاکو نەخۆشەکە بە بەردەوامی سەیری بکات، لە ئەنجامی ئەم سەیرکردنەش وردە وردە تا ماوەی سێ ڕۆژ هەموو زەردووی نەخۆشەکە بۆ ماسییەکە دەگوازرێتەوە و دەمرێت و بەمەش نەخۆشەکە چاک دەبێتەوە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز (هدية طه عزيز)، ئافرەتی ماڵەوە، تەمەن ٧٠ ساڵ لە رۆژی ٢٠١٨/١٢/١٨). ئەم دیاردەیە بە شێوازی جیاواز لە چەندین ناوچەی تر لە کوردستاندا بوونی هەیە، لە ئەنجامی سەردان کردنمان بۆ دەڤەری ئاکرێ ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە خەڵکی ئەم دەڤەرە بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشی زەردک سەردانی کانیاوێک دەکەن بە ناوی (کانیا زەرک)[2]، بە تایبەتی لە ڕۆژانی چوارشەممە تووشبووانی ئەم نەخۆشییە سەردانی ئەم کانییە دەکەن و بە ئاوی ئەم کانییە خۆیان دەشۆرن و دواتر چاک دەبنەوە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز، رباط نەجمەدین، دانیشتووی دەڤەری ئاکرێ، لە رۆژی ٢٠١٩/٣/٥) (وێنەی ژمارە ١ أ - ب).



وێنەی ژمارە ١ – أ فۆتۆ توێژەر





وێنەی ژمارە ١ – ب فۆتۆ توێژەر

هەندێک جاریش مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ ناوی کەسێک دەکات وەک بەشێکی جەوهەری لەو کەسە. (فرانكفورت، هنري، ١٩٦٠، ص٢٥) لە

دیـــارترین نمـــوونەش لەم بـــارەیەوە لە کۆمەڵگـــای کوردەواریـــدا لە کوردســـتان بەرجەســـتەی دەکەیـــن لە شـــوێنەواری نزاگـــای[٣] شـــێخ عەبدولقادری گەیلانی[٤] (وێنەی ژمارە ٢ أ- ب)



وێنەی ژمارە ٢ — أ فۆتۆ توێژەر





وێنەی ژمارە ٢ — ب فۆتۆ توێژەر

شـــایەنی باســـە شـــوێنەواری ئەم نزاگـــایە لە بەرد و خـــۆڵ دروستکراوە و پێکهاتووە لە دوو ژووری لە ناویەک (وێنەی ٣)، لەسەر بەردەکان چەندین ناو نووسراوە، بە گوێرەی وتەی ئەوکەسانەی کە سەردانی ئەم شوێنەیان کردووە پێویستە بۆ ماوەیەکی کورت تێیدا بمێننەوە و بخەون دوای ئەوە کەسی خەوتوو خەونێک دەبینێت و مارێک دێتە خەونی ئەوا بەم چەشنە مرازی دێتە دی، بەڵام جاری وا هەیە کەسی خەوتوو هیچ خەونێک نابینێت، ئەوا لەم بارەدا ناگات بە مرازی دڵی. (سەردانی مەیدانی نزاگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ناحیەی کەلەک، لە ڕۆژی ٢٠١٨/١٢/٣٠).

ئەوەی لەم شـــوێنەوارەدا تێبینـــی دەکەیـــن، دەبینـــین لە ســـەر دیوارەکانی لە دەرەوە و ناوەوەی تەنانەت سەر دەرگاکەشی چەندین ناو نووسراوە، بۆ مەبەستی گەیشتنی مرۆڤە بە ئاواتەکانی، لە وانەش نووســـینی نـــاوی دوو دڵـــدار لە تەنیشـــت یەک، (وێـــنەی ژمـــارە ٤) بەمەبەســـتی گەیشـــتنیان بەیەک واتە دوای ئەوەی کە نـــاوی کەســـەکە



وێنەی ژمارە (٣) فۆتۆ توێژەر

لەسەر دیواری ئەم نزاگایە نووسرا، ئەوا دەگات بە ئاواتەکانی واتە ناوەکان بۆ ئەم مەبەستە نووسراون، هەروەک لە وێنەکەدا دیارە ناوی کچێک و کوڕێک نووسراوە بە ناوەکانی (کانیوار و ایهان). کەواتە لێرەوە بەتەواوی بۆمان ڕوون دەبێتەوە بیرۆکەی جێگرەوە (بدیل) لە بیروباوەڕی دانیشتوانی میزۆپۆتامیادا لە کۆنەوە رەگ و ڕیشەی داکوتاوە و تاکو ئێستاش بەردەوامی هەیە، مرۆڤ لە ژیانیدا پشتی پێ دەبەستێ وەک چارەسەر بۆ گرفتەکانی.



(وێنەی ژمارە ٤) فۆتۆ توێژەر

بابەتی قوربانی کردن بۆ ڕووبارەکان بابەتێکی چەسپاوە لە بیری (هـزری) دانیشـتوانی میزۆپۆتامیـا بـۆیە هەنـدێ جـار هاوشـێوەی ئەم قوربانییە بۆ هەردوو ڕووبارە مەزنەکەی دیجلە و فوراتی ئەنجامدراوە، وەک جێگرەوەیەک بەمەبەستی خۆ پاراستنیان لە زیانی ڕووبارەکان، کە سەرچاوە و بنەمای دروستبوونی شارستانیەت بوون لە ناوچەکەدا. تـا وای لێهات ئەوەنـدە ڕووبارەکـان پیـرۆز بـوو لایـان وەکـو خواوەنـد سـەیریان دەکـرد، چـونکە بە سـەرچاوەیەکی گرنگـی ژیـان و ئـاوەدانی هەژمار دەکرا، هەر لەم ڕوانگەیەوە دانیشتوانی میزۆپۆتامیا قوربانییان پێشکەش بە ڕووبارەکان دەکرد، بۆ مسۆگەرکردنی سەرچاوەی بژێوی ژیان کە لە ئاوی ڕووبارەکان خۆیان دەبینییەوە. بۆ ئەم مەبەستەش وەک نیشانەیەک بوو بۆ دەربڕینی سوپاسگوزاری و پێزانینیان بۆ ئەم دوو ڕووبـارە ئاژەڵیـان دەکـردە قوربـانی، جـگە لە هەنـدێک قوربـانی ماددی تر. (الخطیب، ص٢٧٢، ٢٠١٤).

ئەوەی کە گـرنگە لێـرەدا ئەو ڕاسـتییە بیخەیـنە ڕوو ئەم بیـرو بـاوەڕە کـۆنەی دانیشـتوانی میزۆپۆتامیـا کـاریگەری خـۆی لەسـەر بیروبـاوەڕی مرۆڤـی ئەم سـەردەمەش جێهێشـتووە، وەک دیـاردەیەک ئێستاشی لەگەڵدا بێت ساڵانە دانیشتوانی نزیک ڕووبارەکان پەیڕەوی دەکەن، بـۆ ئەم مەبەسـتە لە دوای سـەردانیمان بـۆ ناوچەکـانی دەوروبەری زێی کەڵەک و دوای چەندین بەدواداچوون و چاوپێکەوتن لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە بە مەبەستی لابردن و نەمانی بەڵا و ئافات بە تایبەت لەسەر ئەوانەی لە دانیشتووانی نزیک کەنارەکان قوربانییەک پێشـکەش بەم زێـیە دەکەن، بە بیـروڕای ئەوان سـاڵانە زێـیەکە داوای قوربانییان لێدەکات هەروەک خەڵکی ناوچەکە دەگێڕنەوە کە ڕووبارەکە هـاژەی دێـت و هـاوار دەکـات خەڵـکەکەش پێیـان وایە ئەم ڕووبـارە قوربانی دەوێت بۆیە بە زووترین کات چۆلەکەیەک یان مریشکێک یان ئاژەڵێک سـەر دەبڕن و خوێنەکەی فڕێدەدەنە نـاو زێیەکە بە بیروڕای خەڵکی ئەو ناوچەیە بە جێبەجێ نەکردنی قوربانی یان دواخستنی ئەوا

نەهامەتییان بەسەردا دێت و کەسێک لە ئاوی زێیەکە دەخنکێت و دەبێتە قوربانی. (چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی محمد علی تەمەن ٤٤ دانیشتووی ناحیەی کەڵەک، دووکاندار و عماد موراد، تەمەن ٣٣ساڵ دانیشتووی ناحیەی کەڵەک، ماسیگر لە رۆژی ٢٠١٩/١٢/٣٠).

ئەوەی جێی ئاماژە پێدانە مرۆڤ ویستوویەتی ئەو قوربانییانەی کە پێشکەشی ڕووبارەکەی کردووە ببێتە هۆکارێک بۆ پاراستنی لە زیانەکانی ڕووبارەکان بۆ ئەوەی مەترسی لەسەر ژیانیان کەم بکەنەوە لە ڕێگەی پێشکەش کردنی ئەم قوربانییەوە، ئەمەش بیرۆکەی جێگرەوەیە لە هزری مرۆڤ لە سەردەمی کۆن و ئێستادا، هەروەک لە پێشتردا ئاماژەمان پێکرد.

هەروەها لە میانی چەندین چاوپێکەوتن و بەدواداچوونمان بۆ ئەم بابەتە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت کە مرۆڤ لە ئێستادا لە بواری تری ئەفسووناویدا ئاو بە کاردەهێنی، بۆ نموونە لە ناو کۆمەڵگەی کوردیدا بە تایبەتی لە خودی شاری هەولێر کاتێک کەسێک دەمرێت و تەرمەکەی دەبەن بۆ گۆڕستان خەڵکی گەڕەک جامێک ئاو بە دوای مردووەکەدا دەڕژێنن، بەو بڕوایەی کە لە دوای ئەم مردووە ناخۆشی نەیێتە ڕێگەیان و خێر و خۆشی بێت. ئەم شێوازە بیرکردنەوەیە لە ناوچەکانی تری کوردستانی باکوور و تەنانەت لە ناو تورکەکانیش بوونی هەیە لە رۆژهەڵاتیش لە ناو کورد و فارسەکانیش بەدی دەکرێت ئەم دیاردە ئەفسووناوییەش لەم ناوچانە شێوازێکی تری وەرگرتووە، کاتێک کەسێک گەشت دەکات ئەوا کەسوکارەکەی دوای ئەوەی کە لە ماڵ دەردەچێت ڕاستەوخۆ بە دوایدا جامێک ئاو دەڕژێنن بەو بۆچوونەی کە ئەو کەسە ڕێگای سەفەری رۆشن و ڕووناک بێت، وەک ئاو بە سەلامەتی گەشتەکەی بکات و بگەڕێتەوە دەڵێن وەکو ئاو بڕۆ و وەکو ئاویش بگەڕێوە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا بحری سالم فتاح، قوتابی دکتۆرا، لە رۆژی ٢٠١٩/٤/١).

بە بۆچوونی هەندێک لە توێژەران لە توێژینەوەکانیان ئاماژەیان بەم بابەتە کردووە و دەڵێن، ئەم دیاردەیە دیاردەیەکی زۆر کۆنە و بنەمایەکی جادووگەری هەیە و لە سەردەمی کۆندا ئاو ڕژاندن لە دوای کەسی گەشتیار کەلتوورێکی باو بووە، چونکە بێگومان لە کاتی گەشتکردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر گەشتی کردووە، بەتایبەت لە کاتی تێپەڕین بە ناوچە بیابانەکاندا مرۆڤ دووچاری کەم ئاوی دەبێت و مەترسی لە سەر ژیانی دروستکردووە، بۆیە زۆرێک لە گەشتیاران بە هۆی نەبوونی ئاوەوە خنکاون، هەر لەم ڕوانگەیەوە هەڵساون بە کرداری ڕژاندنی ئاو ڕاستەوخۆ کاتی لە ماڵ دەرچوونی و گەشتەکەیدا ئەمەش بەو واتایە دێت کە ئەو کەسەی ئاوەکە دەڕژێنێت، هیوا دەخوازێت کە ئەو کەسە لە گەشتەکەیدا بە سەلامەت بگەڕێتەوە. و لە کاتی گەشتەکەی ئاوی دەستکەویَ هەروەک چۆن لە یەکەم هەنگاویدا بە ئاو بەڕێ کەوت بەم شێوەیەش لە مەترسی خنکان بە دوور دەبێت. (الترکي، ٢٠١٣، ص٣٩)

ئەوەی لێرەدا پێویستە تیشکی بخەینە سەر ئەوەیە کە بوونی ئەم دیاردانە هەر لە کۆندا پەیڕە و کراوە و تاکو ئێستاش لە بیر و هۆشی کۆمەڵگادا وەک خورافات و ئەفسانە لە لایەن بەشێک لە توێژەران پێناسە دەکرێت لەوانە (کلود لیفی ستراوس) کە توێژەرێکی بواری ئەفسانە و مرۆڤناسیی سەدەی بیستەمە دەڵێت: هەر ئەفسانەیەک یان گواستراوە یان وەرگیراوە ڕەگ و ڕیشەکەی لە ئەفسانەیەکی تردا خۆی دەدۆزێتەوە کە سەرچاوەکەی گەلێک یاخود نەتەوەیەکی هاوسنوورە، بەرگێکی تری بەبەردا کراوە، لەگەڵ بوونی هەمان ناوەڕۆک و تایبەتمەندی. هەروەها ستراوس، ئەم ڕاستییەمان بۆ دووپات دەکاتەوە و دەڵێت کەلتووری دانیشتووانی میزۆپۆتامیا بە تەنها نەگەیشتە سووریا بەڵکو گەیشتە یۆنان و هند و هندیە سوورەکان، بۆیە ناتوانین ئەفسانەکان گرێبدەین بە بیر و باوەڕێکی دیاریکراوی ناوچەیەک یاخود جێگایەک، بەڵکو واباشترە بیانگەڕێنینەوە بۆ

کەلتـــوورێکی گشـــتگیر و جیهـــانی، کە هەر نـــاوچەیەک بە شـــێوازێکی تـایبەتی خـۆی لە بیـر و هـزری خەڵکەکەیـدا ڕەنگـی داوەتەوە. (الجـوزو، ١٩٨٠، ص٢٢)

**٢. بنەمای جادووگەری پەیوەندیکردن: (قانون السـحر الاتصـالي):**
ئەم بنەما و یاسایە دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو گریمـانەیەی کە گوایە هەمـوو شـتە بەیەک لکاوەکـان لە کاتێـک لە کاتەکانـدا بەیەکەوە لکـاون دوای جیابوونەوەشـیان بە بەردەوامـی پەیوەنـدییان بەیەکەوە دەمێنێت. بۆ نموونە بوونی پەیوەندی لەشی مرۆڤ لەگەڵ بەشـەکانی جەسـتەی لەو کـاتەی کە لەیەک جیـا دەبێتەوە، وەک پـرچ و نینـۆک، ئەگەر هـاتوو یەکێـک لەم بەشـانە کەوتە دەسـتی کەسـێک کەواتە لە ژێـر ڕکێفـی ئەو کەســەدا بە خواسـتی خـۆی دەتـوانێ مـامەڵەی خراپـی پـێ بکـات، بەمەبەسـتی زیـان گەیانـدن بە خـاوەنەکەی، ئەم جـۆرە جـادووگەرییە هەموو خەڵک لە سەرتاسـەری جیهان بـاوەڕی پێی هەیە. (فریزر، ١٩٧١، ص ص١٠٧ – ١٨١). دیـارترین نمـوونە لەم بـارەیەوە وێڵاشـی منـداڵە، بە شـــێوەیەک کە منـــداڵ لە دایـــک دەبێـــت وێڵاشـــەکەی لە نەخۆشـــخانە دەشـاردرێتەوە لە لایەن خـانەوادەکەی تـاکو لە دواییـدا ببێتە منـداڵێکی سـەرکەوتوو وەک پزیشـک بە نمـوونە، واتە بـوونی ئەم وێڵاشـە لەنـاو نەخۆشـخانە کـاریگەری خـۆی لەسـەر ئەم منـداڵە تۆماردەکـات و لە دواڕۆژدا دەبێـــت بە پزیشـــک. ئەمەش بەپێـــی بیـــر و بۆچـــوونی خـــانەوادەکەی لەبەرئەوەی ڕۆژێـک لە ڕۆژان ئەم شـــوێن و پیشـــەیە بەشێک بووە لە جەستەی ئەم مرۆڤە. (الترکي، ٢٠١٣، ص٣٠) یاخود باوکی منداڵەکە هەڵدەستێت بە ناشتنی وێڵاشی منداڵەکەی لە باخچەی ماڵەوەدا لەژێر دارێک، بۆ ئەوەی پەیوەندیی خێزانییان پتەو و باش بێت، هەندێ جاریش ئەم وێڵاشە لە شێوەی دڵ لێدەکەن ئینجا دەیشارنەوە، ئەمەش بە مەبەستی بوونی پەیوەندییەکی بەهێزی خۆشەویستی لە نێوان منداڵ و خێزانەکەی. (Iraqi Refuge News, Face Book 22,Oct,2016)) ئەم شێوازە لە هەڵسوکەوت و دیاردانە نەک تەنها لە کۆمەڵگای کوردەواری

بگـــرە لە چەنـــدین شـــوێنی تـــر لە جیهانـــدا بـــوونی هەیە، بەڵام لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر گۆڕانی بەسەر دادێت.

کـرداره جادووگەرییەکـان لە ژێـر ڕۆشـنایی ئەم یاسـایەدا پشـت دەبەستێت بەیاسای کێشکردن (قانون الجاذبیة) واتە ئەو شتانەی یاخود ڕوونتـر بڵێـین ئەو ئەنـدامانەی جەسـتەی مـرۆڤ کە پێشـتر بەیەکەوە لکـابوون و یەک بەش بـوون لەو جەسـتەیە دوای جیابوونەوەیـان لە یەکتـر کاریگەرییـان بەسـەر یەکەوە دەبێـت بەپێـی یاسـای کێشـکردن چـــونکە مەیلـــی ســـۆزدارییان بەســـەریەکەوە هەیە، بەم شـــێوەیەش جادووگەر بەئاسانی دەتوانێ بەپێی ویست و ئارەزوو مامەڵەی خراپیان لەگەڵدا بکـات و بەکاریـان بهێنێـت دوای ئەوەی بەشـێک لەو ئەنـدامانی دەست کەوت وەک تـاڵی پـرچ و نینـۆک و ددان و یـاخود پـارچەیەک لە جل و بەرگ، هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێدا. (الدوري، ٢٠٠٩، ص٢٤٥-٢٤٧ ).

**٣. جادووگەری بە پشت بەستن بە دیاردە سروشتییەکان:**

مرۆڤـی کـۆن لە میزۆپۆتامیـا لە هەوڵـی بێوچانـدا بـووە بـۆ سـوود وەرگـرتن لە دیـاردە سروشـتییەکانی دەوروبەری پشـتی پێدەبەسـت بـۆ ئەنجامدانی چەند کردارێکی جادووگەری.

بـۆیە لێـرەدا پێویسـتە هەڵوەسـتە بکرێـت لەسـەر، تێگەیشـتن و تێڕوانینـی هـزری تـاکی کۆمەڵگـای میـزۆپۆتامیـا بەرامـبەر بە دیـاردە سروشـتییەکان، و یـان شـتەکانی دەوروبەری کە لە ژیـانی ڕۆژانەیـدا بەکاری هێناون. (فرانكفورت، هنري وآخرون ، ١٩٦٠ ، ص١٥١).

کاتێک مرۆڤ مەبەستی لابردنی جادووە، یان بە واتـایەکی تـر ئەو کەســە جــادووی لێکرابێـت و کەوتبێـتە ژێـر کـاریگەری جـادوو ئەوا هەنـــدێک لەو شـــتانەی کە لە سروشـــت هەبـــووە ڕووی تێکـــردووە و ویستوویەتی وەک چارەسەر بەکاری بهێنێت. لە دیـارترین کرداری ئەو جۆرە جادووگەریـانە تێڕوانینی مرۆڤ بووە بۆ ماددەی (خـوێ) وەک مـاددەیەکی زینـدوو سـەیری کـردووە و تەنـانەت کەوتـووەتە ئاخـاوتن

لەگەڵیــدا (فرانكفــورت، هنــري وآخــرون ، ١٩٦٠، ص١٥١) وەک لەم دەقەی خوارەوە بە دیاردەکەوێت:

"ئەی خوێ، ئەی ئەو کەسەی لە شوێنێکی پاکژ دروست بووی،

خۆراکی خواوەندی (انليل) دروستی کردی،

ئەی پادشـا ئەی گەورە ئەی میر بەبێ تۆ بخـوری خواوەند لەت نابێ،

من فلانی کوڕی فلان دووچاری داوی جادوو بوومە،

(کەوتـوومەتە داوی جـادوویەکی زۆر گەرمەوە – زۆر بەهێـزەوە)

ئەی خـوێ چارەسـەری ئەم گـرێیەی مـن بـکە، ئەم جـادووەم لەسـەر هەڵگـرە، وەکـو خواوەنـدی مـن، نـزا و شـکۆداریت بـۆ بەرز دەکەمەوە". (فرانكفورت، هنري واخرون، ١٩٦٠، ص١٥٢).

تاکو ئەمرۆ لە نێو کۆمەڵگای کوردەواریدا هاوشـێوەی ئەم بابەتە ڕەنگدانەوەی ماوەتەوە، بۆ نموونە کاتێک منداڵێک نەخۆش دەبێ ئەگەر سەرچاوەی نەخۆشییەکەی نەزانرێت، ئەوا دەوترێت ترساوە و پێویستە ترسی لێ دەربکرێ، ئەم کردارەش بە بەکارهێنانی بڕێک خوێ دەبێت کاتێـک ئـاگرێکی بچـووک دەکەنەوە بڕێـک لە خـوێ فڕێـدەدەنە نـاو ئـاگرەکەوە، وە پێویسـتە دووکەس لەم نەریـتە بەشـداربن یەکێکیـان منداڵەکە دەگرێتە باوەشی و خوێیەکە فڕێدەداتە ناو ئاگرەکە، وە کەسی دووەم دەڵـێ ئەوە ترسـی کـێ دەردەکەی؟ ئەویـش دەڵـێ ترسـی فـلان دەردەکەم واتا ناوی منداڵە ترسـاوەکە دەهێنی، ئەم کردارە بۆ مـاوەی سـێ جـار دووبـارە دەکـرێتەوە، زۆرجـار منـداڵەکە چـاک دەبێـتەوە. (چـاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێـز، نبیهـة معـروف عبداللـه، ئـافرەتی مـاڵەوە تەمەن، ٦٠ ساڵ، لە رۆژی ٢٠١٩/٣/٢٨)

هەروەهـا نمـوونەیەکی تـر کە تـاکو ئێسـتا وەک داب و نەریتێـک لەنێـو کۆمەڵگـای کوردەواریـدا بەردەسـتە ئەوەیە کاتێـک مرۆڤێـک دووچـاری ناخۆشـی و دڵەڕاوکێ دەبێت و کارەکانی بە باشـی ئەنجـام نـادات وا بیردەکـاتەوە کە هێـزی نەرێنـی لە نـاو ماڵەکەیدا زۆر بـووە و

پێویستە ئەم هێزە لە ناو ببات، بۆ ئەم مەبەستە ڕوو لە خوێ دەکات، بە شێوەیەک خاوەن ماڵ، هەڵدەستێت بە ڕژاندنی خوێی درشت (ملح خشن) بە ناو هەموو گۆشەیەکی ماڵەکەیدا خوێیەکە بڵاودەکاتەوە، دواتر ماڵەکەی خاوێن دەکاتەوە بەم شێوەیە لە هێز و کاریگەرییە نەرێنییەکان ڕزگاری دەبێت، واتە خوێیەکە ڕۆڵی سەرەکی گێڕا لە لابردنی ناخۆشییەکان و ڕامالێنی لە ناو ماڵەکەیدا بەپێی ئەم نەریتە، خوێیەکە هەموو کاریگەرییە نەرێنییەکانی ناو ماڵەکەی لەگەڵ خۆیدا دەسڕێتەوە بەم شێوەیە جۆرێک لە ئاسوودەیی و هەستکردن بە ئارامی ڕوو لە خاوەن ماڵ دەکات. (چاوپێکەوتن لەگەڵ دکتۆرە ژیان فەقێ احمد، لە ڕۆژی ٢٠١٨/١٢/٢٠).

کەواتە لێرەدا ئەوە لامان ڕوون دەبێتەوە، لە دوای تێپەڕبوونی هەزاران ساڵ بە سەر تێڕوانینی تاکی کۆمەڵگای میزۆپۆتامیا بەرامبەر بە سروشت و دیاردە سروشتییەکان، لەوانەش ماددەی خوێ نە گۆڕاوە هەرماوە لە هزری مرۆڤی ئەم سەردەمەش پەنگی خواردۆتەوە لە کاتی پێویست پەنای بۆ دەبات وەک چارەسەر بۆ کێشەکانی بۆیە بەشێک لە توێژەرانی بواری زانستی مرۆڤ ناسی لە بارەی بەردەوام بوونی ئەم جۆرە دیاردانەش تاکو ئێستا لە ناو کۆمەڵگادا دەڵێن ((مرۆڤ هەموو ئەو زانیاری و چالاکی و تێگەیشتنانەی لە بارەی دروست بوونی داب و نەریتەوە بە شێوەیەکی حەتمی وەری گرتووە لە ئەنجامی کاریگەری ئەو ژینگەیە بووە کە تێیدا سەری هەڵداوە و ژیاوە)) واتە خۆی هۆکاری دروست بوونیان نەبووە بە شێوەیەکی سروشتی سەری هەڵداوە و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گواستراوەتەوە بە تێپەڕبوونی سەردەم. (هرزاني، ٢٠٠٦، ص٥ - ٦)

هەروەها نموونەیەکی تر لەسەر ئەم بابەتە کە تاکو ئێستا لە نێو کۆمەڵگای کوردەواریدا وەک نەریتێک بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پەنای بۆ دەبرێت بۆ ئازاردانی شتێک لە سروشت، ئەمەش لە نموونەی گوندی دارە بزمارەدا[٥] لە سنووری پارێزگای هەولێر بەرجەستە

دەکەین. ناوەرۆکی ئەم بابەتە خۆی لە بوونی دیاردەیەک دەبینێتەوە کە، هەرکەسێک ئێش و ئازاری ددانی هەبێت سەردانی ئەم گوندە دەکات و پەنا بۆ لای دارە بزمارە دەبات و بزمارێک یاخود مێخێک لەم دارە دەکوتێ بۆ چارەسەری ددانەکەی و کەمکردنەوەی ئێش و ئازاری نەمێنێ یاخود هەندێ جار ددانەکە دەرزێ و دەکەوێتە خوارەوە واتە بە رزینی رەگی دارەکە ددانەکە دەرزێت، بەمەش نەخۆشەکە رزگاری دەبێت لە ددان ئێشەکەی. وێنەی ژمارە (٥، أ - ب) (چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز عەزیز عەبدی، تەمەن ٦٥ ساڵ دانیشتووی گوندی دارە بزمارە، لە رۆژی (٢٠١٨/١١/١).





وێنەی ژمارە ( ٥ – أ ) فۆتۆ توێژەر

وێنەی ژمارە (٥- ب) فۆتۆ توێژەر

ئەوەی جێی ئاماژەپێکردنە ئەو دارەی کە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێ لە جۆری داری ئەسپیندار یاخود قەڵەم تۆزی پێ دەوترێت، شایانی باسە پێشتر دارێکی لەم چەشنە هەبووە و بۆ ماوەی چەندین ساڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە بزماریان لێ کوتاوە، تا وای لێهاتووە دارەکە رەگەکەی بە تەواوی رزیوە و کەوتۆتە خوارەوە، بەڵام خەڵکی ناوچەکە هەڵساون دارێکی تریان بۆ ئەم مەبەستە دەستنیشان کردووە و بۆ بزمار لێ کوتان وەک چارەسەر بۆ ددان ئێشە. (چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز، سیسە نیعمەت عزیز تەمەن ٨٠ ساڵ دانیشتووی گوندی دارە بزمارە رۆژی ٢٠١٨/١/١١).

هەر لەبارەی دیاردەی بزمار کوتان بە پێویستی دەزانین ئاماژەیەکی کورت بە هاوشێوەی ئەم دیاردەیە لە مێژووی کۆنی میزۆپۆتامیادا بدەین، کاتێک کە پاشاکان ئاواتیان ئەوە بوو پەرستگایان بۆ خواوەندێکیان دروست بکردایە بە نیازی تاهەتایە بنیاتیان دەنا، واتە هیچ لە ناو نەچێت و هەربمێنێت. بۆ ئەم مەبەستە هەڵساون بە چەسپاندنی پەیکەری بناغە، (هیاکل اسس) کە شێوەیەکی بزماری هەبوو، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بزمار هێزێکی جادوویی هەیە بێجگە لە بوونی هێزی چەسپاندن، وایان دەبینی کە لێدانی بزمار لە دیوار بەسەر جنۆکەی خراپ زاڵ دەبێت و لە شوێنی خۆیدا بزمار ڕێژی دەکات و دایدەکوتێت مەبەست ئەوەیە کە جنۆکەی خراپ توانای ئەنجامدانی کاری خراپی نامێنێت، ڕێگری لێدەکات بچێتە ناو پەرستگا و لەناو دەچێت. بەم شێوەیەش پەرستگا پارێزراو دەبێت ئەم جۆرە پەیکەرانەش کە بۆ پاراستنی پەرستگا بە کاردەهاتن، یەکەم جار لە مێژوو لە دەوروبەری (٢٦٠٠ پ.ز) دەرکەوت شێوەی بزماریان وەرگرت. (الدوري،٢٠٠٩، ص١٩٩) وێنەی ژمارە (٦).



**وێنەی ژمارە (٦) پەیکەری بناغە وەرگیراوە لە (الدوري،٢٠٠٩، ص٩٩)**

شایانی باسە نموونەی زۆر لەبەر دەستدایە ئەو ڕاستییە دەخەنە ڕوو کاتێک مرۆڤ بۆ نەخۆشی چارەسەری پزیشکی وەردەگرێت و

چاک نابێت، ئەوا بێگومان ناچار دەبێت بە دوای هۆکاری تردا بگەڕێت. بۆ چاک بوونەوە لە نەخۆشییەکەی. هەروەک دکتۆر (فاروق ناصر الراوي) دەڵێت: مرۆڤ بە مەبەستی پارێزگاریکردن لە خودی خۆی و لابردنی ئازار لە سەر کەسە نزیکەکانی هۆکاری پاڵنەر بوون بۆئەوەی، بەدوای چارەسەر بگەڕێ لە ڕێگەی تاقیکردنەوەی ئەو شتانەی کە لە سروشتدا هەبووە لە درەخت و دار و بەرد و هتد .. بێجگە لە پەیڕەوکردنی هەندێ نەریتی ئاینی و جادووبازی (الراوي، ١٩٨٥، ص٣٢٦) بۆ نموونە لە ناو کۆمەڵگای کوردەواریدا کاتێک کەسێ تووشی کۆخە دەبێت ئەوا سەردانی کەندەکۆخ[٦] دەکات.

شایانی باسە، خەڵکی بێجگە لە چارەسەر بوونی نەخۆشی کۆخە لە هەمان کاتدا بە مەبەستی هاتنە دی مراز و ئاواتەکانیان سەردانی دەکەن، کەندەکۆخ لە چەندین شوێن لە کوردستان بوونی هەیە لەوانە لە پارێزگای هەولێر لەناو خودی شاری هەولێر، دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شاری هەولێر پشت منارەی هەولێر ناسراوە بە منارەی چۆلی، لە سنووری پارێزگاکەش هەیە لە قەزای کۆیە و قەزای ڕەواندز و هەروەها لە دەڤەری گەرمیانیش بوونی هەیە. بۆ ئەم مەبەستە سەردانی کەندەکۆخمان کرد لە گوندی کاولۆکان لە قەزای ڕەواندز، بۆئەوەی بە وردی بابەتەکە بخەینە ڕوو. (سەردانی مەیدانی بۆ قەزای ڕەواندز لە ڕۆژی ١/٨/ ٢٠١٨ ).

هەروەک لە وێنەکەدا دیارە (وێنەی ژمارە ٧) کەسی تووشبوو پێویستە سێ جار بە ناو ئەم کونەدا بڕوات کە لە خودی بەردەکەدایە دواتر هەندێ گەنم و شیرینی لەسەر ڕووی دیوارەکە دادەنێت بۆ ئەوەی باڵندە بێن بیخۆن، پاشان نەخۆشەکە کۆکەکەی نامێنێت دوای ئەنجامدانی ئەم چالاکییە.

سەبارەت بە ساغ بوونەوەی مێژووی کەندەکۆخیش زانیاریی تەواو لە بارەیەوە تاکو ئێستا نەزانراوە ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێک لەوانە هیچ یەک لەم شوێنانە مێژوویەکی نووسراوی نییە بۆ ئەوەی

پشتی پێببەستین، بۆیە تەنیا پشتمان بە گێڕانەوەی کەسانی بە تەمەن و سەردانیکاران بەستووە لە توێژینەوەکەدا و نەگەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە کامیان کۆنترە وە دواتر ئەوەی تر دروستکراوە.

لە ئەنجامی ئەو ڕوونکرنەوەیەی دەربارەی کەندەکۆخ خستمانە ڕوو، کە لە هەریەک لە شاری هەولێر و کۆیە و ڕەواندز و گەرمیانیش بوونی هەیە، پێدەچێت ئەو شوێنانە مرۆڤ خۆی دەستێکی بالای هەبووبێت لە دروستکردنیاندا، بۆئەوەی خەڵکی هەموو ئەم ناوچانە سوودی لێ ببینن، لە لایەکەوە بۆ چارەسەر و لە لایەکی ترەوە بۆ بەدیهاتنی ئاواتەکانیان، بە تایبەت لە سەردەمی کۆن کە هاتوچۆکردن لە بەینی ئەم شارانە ئەستەم بوو، هەر بۆیەش لە زۆربەی شوێنەکان بوونی هەیە.

هەر لە بارەی کەندەکۆخەوە بە پێویستم زانی ئەوە بخەمەڕوو کە هەندێ جار شاعیران لە شیعرەکانیان ئاماژەیان بە کەندەکۆخ کردووە، ئەمەش گرنگیی ئەم شوێنە دەگەیەنێت لەسەردەمی خۆی..

هەروەک هونەرمەندی گەورە، چەتۆ حەسەن [٧] لە میانی شیعرێکی کە لەسەر گەڕەکی تەیراوە[٨] نووسیویەتی، ئاماژە بەناوی کەندەکۆخیش دەکات، ئەمەش دەقی شیعرەکەیە.



وێنەی ژمارە (٧) فۆتۆ توێژەر

**سەلامت لێ بێ تەیراوەی ڕەنگین**
**جێ ژوانگەی دۆست و یارانی دێرین**
**سەلام لە جادە و کووچە و کۆڵانت**
**حەوش و حەسار و خانی و دووکانت**
**لە هەردوو جەژن و ڕۆژی نەورۆزت**
**جۆش و خرۆشی لاوی دڵسۆزت**
**لە حەمام سیروان لە کەندەکۆخت**
**کوڕی قیت و قۆز کچانی شۆخت**(٩)

**ئەنجام:**

لە کۆتـایی ئەم تـوێژینەوەیەدا گەیشـتینە چەنـد دەرئەنجامێـک لە خوارەوە دەیخەینەڕوو:

یەکەم: جادووگەری یەکێک بووە لەو دیاردانەی کە هەر لە کۆنەوە مرۆڤ لە ژیانیدا پشتی پێبەستووە و پەیڕەوی کردووە، لە چاخەکانی پێش مێژوودا، تەنانەت تاکو سەردەمی ئەمڕۆشدا پەیڕەوی دەکات.

دووەم: هۆکـاری پەنـا بردنـی مـرۆڤ بـۆ کـارە جادووگەرییەکـان دەگەڕێــتەوە بــۆ تێڕامــانی مــرۆڤ لە ســەر نهێنییەکــانی ژیــنگەی دەوروبەری کە زۆرجار دەبوونە جێگەی ترس و دڵەڕاوکێ بە جۆرێک تا وای لێدەهات ببێتە هـۆی سـەرهەڵدانی زنجیرەیەک لە داب و نەریت، ئەم نەریتـانەش پەیـڕەو دەکـران وەک ڕازیکردنـی خواوەنـد بـۆ ئەوەی لێیـان نزیـک بێتەوە، بە بـڕوای زانایـانی مرۆڤناسـی نەریـت بـریتییە لە کـرداری لاسـایی کـردنەوە، زۆر جـار پەیوەنـدی بە ئـاین و جـادووەوە هەیە، بەو پێیە نەریـت داتاشـراوی نـاو ژیـانی کۆمەڵگـایە کە پەیـڕەوی دەکەن، وە مرۆڤـی سـەرەتایی پێـی وابـووە جێبەجێکردنـی دەبێتە هـۆی ڕەزامەنـدیی خواوەنـد و هێـزی سـەرووی سروشـت بە پێچەوانەشـەوە دەبێـتە هـۆی تووڕەبـوونی، نەریـت چەنـدین کـردار و چـالاکی لە خـۆ

دەگرێت وەک هەڵپەڕکێ پێشکەش کردنی قوربانی ئەنجامدانی نزا و پاڕانەوە.

سێیەم: بەپێی یاسای لەیەکچوون مرۆڤ ئەگەر بیەوێت زیان بە کەسێک بگەیەنێت، ئەگەر بووکەڵەیەکی هاوشێوەی ئەو کەسە دروست بکات ئەوا دەتوانێ لە ڕێگەی زیان گەیاندن بە بووکەڵەکە وەک شکاندن و شێواندنی ئەوا هەمان ئەو زیانانە دووچاری کەسی لێچووی بووکەڵەکە ببێت، کەواتە ئەو بووکەڵەیە وەک هێمایەک لەجیاتی مرۆڤەکە بەکار دەهێنرێت بەمەبەستی ئازار گەیاندن بەو کەسە ئەمەش لەسەر بنەمای بوونی پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان شتە لەیەکچووەکان لە هزری مرۆڤی کۆندا دروست بووە، بەو واتایەی دوو شتی لەیەکچوو پەیوەندییەکی گرێدراویان بە یەکەوە هەیە و کاریگەریشیان بەسەریەکەوە دەبێت.

چوارەم: هەر سەبارەت بە بنەمای لەیەکچوون مرۆڤی کۆن لە ڕابردوودا بووە کە هەموو شتە بەیەک لکاوەکان پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، تەنانەت دوای جیابوونەوەشیان بە بەردەوامی ئەو پەیوەندییەیان بەیەکەوە هەر دەمێنێت.

پێنجەم: بەکارهێنانی خوێ بۆ لابردنی کاریگەری جادوو لەسەر کەسی جادوولێکراو و ئەنجامدانی قوربانی بۆ ڕووبارەکان وەک ڕووباری دیجلە و فورات، یەکێک بوو لەو بیروباوەڕانەی کە دانیشتووانی میزۆپۆتامیا لە کۆنەوە پەیڕەویان کردووە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشدا لە ناو کۆمەڵگای کوردەواریدا ڕەنگی داوەتەوە، وەک بەکارهێنانی خوێ بۆ لابردنی هێزی شەڕ و خراپەکاری لە ناوماڵدا و هەروەها قوربانی کردن بۆ ڕووباری کەڵەک لە لایەن بەشێک لە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە تاکو ئێستا بەردەوامی هەیە و کاریگەری ئەم بیروباوەڕە کۆنانە وەک نەریتێک ماوەتەوە.

شەشەم: لە میانی ئەم توێژینەوەیە ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە مرۆڤ کاتێک کێشەیەکی تەندروستی دەبێت و لە ڕێگەی

چارەسەری پزیشکییەوە چاک نابێتەوە، ئەوا پەنا بۆ هۆکاری تر دەبات، ئەمەش لە نموونەی دارەبزمارەدا بەرجەستە دەکرێت وەک سەردانی دارە بزمارە، و کوتانی بزمار لە دارەکە وەک چارەسەر لە ددان ئێشە و کەم کردنەوەی ئازارەکانی.

حەوتەم: هەروەها کەندەکۆخیش نموونەیەکی ترە لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە پێی گەیشتووین، مرۆڤ کاتێک دووچاری کۆخە دەبێت سەردانی کەندەکۆخ دەکات، کەندەکۆخ لە شاری هەولێر و رەواندز و کۆیە و گەرمیان بوونی هەیە، پێدەچێت بوونی کەندەکۆخ لە چەندین ناوچەی جیا جیا لە کوردستاندا دروستکراو بێت، خەڵک بە ئاسانی پێی بگات، بە تایبەتی لە سەردەمی کۆندا گەیشتن بە ناوچەکانی تر ئەستەم بوو، کەمی هۆکاری گواستنەوە یەکێک بووە لەم هۆکارانە.

هەشتەم: هەموو ئەو بیرو باوەڕانەی کە مرۆڤ لە کۆمەڵگای کۆنی میزۆپۆتامیا پەیڕەوی کردووە کاریگەری خۆی لەسەر مرۆڤی ئەم سەردەمەدا جێهێشتووە و بە خورافات و ئەفسانە ناوی دەبەین، چونکە هیچ بنەمایەکی زانستییان نییە و دوورن لە ڕاستییەوە.

**سەرچاوەكان:**

١. ابراهيم، نعمان جمعة: (٢٠٠٣)، حضارة العصر الحجري الحديث في كوردستان العراق، كلية الاداب جامعة صلاح الدين، رسالة ماجستير غير منشورة.

٢. احمد، سامي سعيد: (١٩٨٨) الحضارة العراقية في الاديان والمعتقدات، العراق في موكب الحضارة، الجزء الاول، بغداد.

٣. الاسود، حكمت بشير: (٢٠١٠)، الرموز الفكرية في حضارة بلاد وادي الرافدين، بغداد.

٤.البرواري، حسن احمد قاسم، (٢٠٠٣)، رموز الالهة في منحوتات منطقة بادينان، كلية الاداب جامعة صلاح الدين، رسالة ماجستير غير منشورة .

٥. باقر، طه: (٢٠٠٩)، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، بيروت.

٧. التركي، قصي منصور عبدالكريم: (٢٠١٣)، جوانب من الجذور الحضارية لأساطير بلاد الرافدين واثرها في الثقافة الافريقية القديمة، مجلة دراسات تاريخية، العدد ١، مركز البصيرة للبحوث والاستشارات والخدمات التعليمية، الجزائر.

٨. الجوزو، مصطفى: (١٩٨٠)، الاساطير العربية والخرافات، ط ٢، بيروت.

٩. الخطيب، عبدالرحمن يونس: (٢٠١٤)، المياه في حضارة وادي الرافدين، ط ١، بغداد.

١٠. الراوي، فاروق ناصر: (١٩٨٥)، العلوم والمعارف، موسوعة حضارة العراق، الجزء الثاني، بغداد.

١١.الراوي، شيبان ثابت: (٢٠٠١)، الطقوس الدينية في بلاد الرافدين حتى نهاية عصر البابلي الحديث، كلية الاداب جامعة بغداد، اطروحة دكتورا غير منشورة.

١٢. ساكز، هاري: (١٩٧٩) ، عظمة بابل – موجز حضارة بلاد وادي الرافدين القديمة، ترجمة، عامر سليمان، جامعة الموصل.

١٣. صاحب، زهير: (٢٠١٢) ، جذور الحضارة العراقية عصر قبل الكتابة، بغداد.

١٤. فرانكفورت، هنري وآخرون: (١٩٦٠) ، ماقبل الفلسفة، الانسان في مغامرته الفكرية الاولى، ترجمة، جبرا ابراهيم جبرا، بغداد.

١٥. فريزر، جيمس: (١٩٧١) ، الغصن الذهبي – دراسه فى السحر والدين، الطبعة الأولى، الجزء الاول، ترجمة، نايف الخوص، الهيئة المصرية العامة للطباعة و النشر.

١٦.القحطاني، سعيد بن مسفر بن مفرح: (١٩٩٧) ، الشيخ عبالقادر الجيلاني واراؤه الاعتقادية والصوفية، ط ١، الرياض.

١٧. كسار، اكرم محمد عبد: (١٩٨٣) قراءة في نتاجات الانسان الفنية الاولى، مجلة سومر، مج ٣٩.

١٨. هرزاني، نوری یاسین: (٢٠٠٦)، مقدمة في الفلكلور الكردي، دراسة انثروبولوجية اجتماعية، كركوك.
١٩. تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر: (١٩٨٥)، هەولێر – لە یادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێردا ١٨٨٥ – ١٩٨٥ ، کۆمەڵە وتارێکی رۆشنبیری و مێژوویی، شارەوانی هەولێر ئامادەی کردووە، ، هەولێر.

**دووەم: چاوپێکەوتنەکان:**

١. چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز هدية طه عزيز، تەمەن ٧٠ ساڵ ئافرەتی ماڵەوە، لە رۆژی (٢٠١٨/١٢/١٨).
٢. چاوپێکەوتن لەگەڵ سیسە نیعمەت عزیز تەمەن ٨٠ ساڵ دانیشتووی گوندی دارە بزمارە لە رۆژی (٢٠١٨/١/١١).
٣. چاوپێکەوتن لەگەڵ عەیز عەبدی، تەمەن ٦٥ ساڵ دانیشتووی گوندی دارە بزمارە، لە رۆژی (٢٠١٨/١١/١).
٤. چاوپێکەوتن لەگەڵ نبيهة معروف عبدالله، ئافرەتی ماڵەوە، تەمەن ٦٠ ساڵ، لە رۆژی، (٢٠١٩/٣/٢٨).
٥. چاوپێکەوتن لەگەڵ دکتۆرە ژیان فەقێ احمد، دکتۆرا لە زمانی عەرەبی، لە پەیمانگەی تەکنیکی کارگێڕی هەولێر بەشی کارگێڕی دەزگاکانی گەشتیاری، لە رۆژی ٢٠١٨/١٢/٢٠.
٦. چاوپێکەوتن لەگەڵ رباط نەجمەدین، دانیشتووی دەڤەری ئاکرێ، لە رۆژی، ٢٠١٩/٣/٥.
٧. چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی محمد علی تەمەن ٤٤ ساڵ دانیشتووی ناحیەی کەڵەک، دووکاندار عماد موراد، تەمەن ٣٣ ساڵ دانیشتووی ناحیەی کەڵەک ماسیگر، لە رۆژی (٢٠١٨/١٢/٣٠).
٨. چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا بحری سالم فتاح، مامۆستا لە پەیمانگەی تەکنیکی کارگێڕی هەولێر، بەشی رێبەری گەشتیاری، قوتابی دکتۆرا، لە رۆژی (٢٠١٩/٤/١).

**سێیەم: سەردانە مەیدانییەکان:**

١. سەردانی مەیدانی بۆ گوندی دارە بزمارە لە رۆژی، (١ /١١/ ٢٠١٨).
٢. سەردانی مەیدانی نزاگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ناحیەی کەلەک، لە رۆژی (٢٠١٨/١٢/٣٠).

٣. سەردانی مەیدانی بۆ قەزای ڕەواندز لە رۆژی (١/٨/ ٢٠١٨ ).
٤. سەردانی مەیدانی بۆ قەزای کۆیە لە رۆژی (٢/٥/ ٢٠١٩).
٥. سەردانی مەیدانی بۆ کەندەکۆخ لە شاری هەولێر لە رۆژی (٢٠١٩/٣/١٠).

**روونکردنەوە:**

١.چیای زەردک: یەکێکە لەو چیایە ئیستراتیجیانەی دەکەوێتە دەشتی نەینەوا بە سەر شارە مەسیحیی و ئێزیدییەکانی وەک بەرتلە و بەعشیقە درێژ دەبێتەوە.

٢.کانیا زەردک: بریتییە لە سەرچاوە کانییەک دەکەوێتە ناوچەیەکی شاخاوی لە قەزای ئاکرێ نزیک هاوینەهەواری سیپەی گەشتیاری.

٣.شوێنەواری نزاگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی: دەکەوێتە ناحیەی کەلەک سەر بە قەزای بەردەڕەش لە باشووری، رۆژئاوای شاری هەولێر و باشووری ڕۆژهەڵاتی قەزای بەردەڕەش و ڕۆژهەڵاتی موسڵ، دەڕوانێتە سەر زێی کەڵەک. ئەم شوێنەوارە بریتییە لە ئەشکەوتێک لە بناری چیایەک هەڵکەوتووە، دەمی ئەشکەوتەکەش بە دیوار دروستکراوە، دەرگا و پەنجەرەیەکی بچووکی تێدایە، شێوەی ژوورێکی بچووکی پێک هێناوە، لە ناو ژوورەکەش دەچێتە ناو ژوورێکی تری زۆر بچووک ئەم شوێنەش کۆتایی ئەشکەوتەکەیە، کە لە بەردو خۆڵ پێکهاتووە، (سەردانی مەیدانی نزاگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە ناحیەی کەلەک، لە رۆژی ٢٠١٨/١٢/٣٠).

٤.شێخ عەبدولقادری گەیلانی: یەکێکە لە کەسایەتییە ناودارەکانی ئیسلام، لە شاری گەیلان لە دایک بووە کە دەکەوێتە باکووری ئێستای ئێران لە ماوەی ساڵانی (٤٧٠ – ٥٦١ ک/ ١٠٧٧– ١١٦٦ ز) ژیاوە، دوای ڕووخانی دەوڵەتی بوەیهی شیعە مەزهەب لە ساڵی (٤٨٨ ک/ ١٠٩٥ ز) هاتۆتە شاری بەغدا هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. (القحطاني، ١٩٩٧، ص ص١٥ — ٣٥).

٥.گوندی دارە بزمارە: لە سنووری پارێزگای هەولێرە، دەکەوێتە باکووری شاری هەولێر و باکووری ڕۆژهەڵاتی ناحیەی پیرمام، و نێوان گوندەکانی سوولی لە باکووری ڕۆژهەڵات، زیارەتی مەلازادە لە ڕۆژهەڵات و گوندی سەرووکانی لە باشووری ڕۆژئاوا. (سەردانی مەیدانی بۆ گوندی دارە بزمارە لە رۆژی ٢٠١٨/١/١١)

٦. کەندەکۆخ: (بریتییە لە شوێنەواری تاشە بەردێکی مام ناوەند لە بەشی ناوەڕاستیدا کونێک هەیە دەکەوێتە ناو گۆڕستانی جووان (جوولەکەکان) یان گۆڕستانی کەندەکۆخ یان تاتانی پێ دەوترێت دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی گوندی کاولۆکان، لە سەر ڕووباری ڕەواندز لە باکووری قەزای ڕەواندز، ئەم گۆڕستانەش بە یەکێک لە گۆڕستانەکانی سەردەمی میرنشینی سۆران هەژمار دەکرێت بە گوێرەی ئەو مێژووەی لەسەر کێلی گۆڕەکان نووسراوە. (سەردانی مەیدانی بۆ دەڤەری ڕەواندز لە رۆژی، ١/٨/ ٢٠١٨).

٧.چەتۆ حەسەن: ئەکتەر و هونەرمەندی ناوداری شاری هەولێرە و رۆڵی لە چەندین تەمسیلی و فیلمدا گێڕاوە. لە رۆژی ٩/١٥/ ٢٠١٩ کات ٢٢:٠٠

http://www.kurdiu.org/index.php/ku/news/entertainment/43388

٨.گەڕەکی تەیراوە: یەکێکە لە گەڕەکە گەورەکانی شاری هەولێر، ناونانی ئەم گەڕەکە دەگەڕێتەوە بۆ کەسێک بە ناوی طاهر ئاغا خەڵک پێیان وتووە تاهیر - حاجی تەیرۆ دواتر بووە بە تەیراوە، کە خاوەن زەوی کشتوکاڵی بووە لەو ناوچەیە، جۆرەها کشتوکاڵی کردووە یەکەم کەس بووە لەو شوێنە خانووی دروستکردووە. (تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر، ١٩٨٥، لالا١٣٢ - ١٨١)

٩.تێبینی ئەم شیعرە لە ٤٠ دێڕ پێکدێت، تەنها ئاماژەم بە هەشت دێڕ کردووە، پەیجی هەولێری جاران، at 10:10pm. 2F

## ملخص البحث

## إضاءة على بعض الجوانب والعادات والتقاليد
## في بلاد الرافدين وانعكاسها على فكر المجتمع
## (المجتمع الكوردي نموذجاً)

**م.م شيرين محمد داود**
قسم الدليل السياحي – المعهد التقني
كلية التقنية – الادارة – اربيل

تضم هذه الدراسة بفرعها النظري والميداني جوانب عديدة من الجوانب الحضارية القديمة التي ظهرت داخل مجتمع بلاد الرافدين، والتي لاتزال مستمرة حتى وقتنا الحاضر، تتناول هذه الدراسة بعض من العادات والتقاليد القديمة، كالسحر لمعالجة المرض وذلك من خلال طرق عديدة منها طريقة سحر المحاكاة او تمثيلي وطريقة سحر الاتصالي، وتهدف هذه الدراسة تسليط الضوء على هذا الجانب وتأثيرها في حياة الإنسان وذلك بالإعتماد على الممارسات السحرية حيث مارست احد من هذين المبدئين التي مارسها الإنسان كوسيلة سحرية من اجل الانتقام من الاعداء، حيث قامت الباحثة بالتركيز على هذه الجوانب المذكورة باستخدام طريقة المقارنة لتلك العادات والطقوس القديمة داخل مجتمع وادي الرافدين القديمة ومدى تاثيرها واستمرارها وانعكاسها داخل مجتمعنا الكردي.

إعتمدت الدراسة على زيارات ميدانية عديدة للمواقع الاثرية والتراثية مثل زيارة منطقة داره بزمارة التابعة لناحية پيرمام ضمن حدود محافظة اربيل وزيارة منطقة كەندەكۆخ في مركز مدينة اربيل و قرية كاولۆكان في قضاء رواندز التابعة لمحافظة أربيل أيضاً، مع زيارات ميدانية للمزارات والمقامات ومنها زيارة مقام الشيخ عبدالقادر الگيلاني، في مركز ناحية كلك التابعة لقضاء بەردەرەش وزيارة منطقة كانيا زەردك في قضاء عقرة اضافةً الى إجراء المقابلات مع بعض الشخصيات الدينيه والإجتماعية والسواح الذين يزورون هذه المناطق لاهداف معينة. مثل زيارة منطقة كندەكوخ لمعالجة الكحة الشديدة، في كل من مركز مدينة اربيل ومدينة كوية – كويسنجق ومدينة رواندز وزيارة قرية دارة بزمارة لمعالجة آلام الاسنان، وزيارة منطقة كانيا زەردك لمعالجة مرض اليرقان. من خلال هذه الدراسة وصلت الباحثة

الى جملة من الإستنتاجات منها إن الإنسان قد مارس بعض الطقوس والشعائر التي كانت تمارس من قبل سكان بلاد الرافدين منذ العصور القديمة، استمرت حتى يومنا هذا، وتبين لنا بأن الغريزة الانسانية والدفاع عن النفس وإبعاد الاذى عن الاقربين قد دفعت الانسان ومنذ القدم الى إتباع تلك الممارسات والطقوس السحرية، وانتقلت هذه المفاهيم والافكار بمرور الزمن من جيل الى جيل وتبين ذلك من خلال بعض العادات والتقاليد او الطقوس القديمة ومقارنتها مع بعض التقاليد الحالية الموجودة داخل مجتمعنا المعاصر. وقد أفادتنا ذلك بمعلومات قيمة عن الافكار والمعتقدات لدى المجتمع الكردي الحالي، التي يمتد جذورها الى فترات زمنية قديمة في تاريخ بلاد وادي الرافدين، مثل تقديم النذور والقرابين لنهري دجلة والفرات الذي كانت مصدر الحياة في تلك الرقعة الجغرافية، ونلاحظ استمرار مثل هذه الطقوس او الافكار داخل المجتمع الكوردي حاليا في ظاهرة تقديم القرابين لنهر الزاب الكبير في ناحية الكلك، ونحاول في هذه الدراسة تسليط الضوء بشكل علمي على هذا الجانب.

**Research Summary**

**Illuminating some aspects of the customs and traditions in Mesopotamia and their reflection on the thought of society**

**(Kurdish society as a model)**

This theoretical and field study includes many of the ancient civilizational aspects that have emerged within Mesopotamian society, which are still going on till the present day, this study deals with some of the old customs and traditions, such as magic to treat the disease, and through many ways including the method of simulation or communicational magic method.This study aims to shed light on this aspect and its impact on human life by relying on the magic practices where one of these two principles practiced by man as a magical means for revenge against enemies, where the researcher focused on the obove mentioned aspects using the comparison method for those old customs and rituals within the Mesopotamian society and the extent of its impact on continuity and reflection within our Kurdish society.

The researcher relied on several field visits to archaeological and heritage sites such as Dara Bzmara area of Piramam district within the borders of Erbil governorate, and visit the Kanda Kokh area in the city center of Erbil and the village of Kawlukan in the district of Rawandz of Erbil province, also visiting some shrines and sanctuary. These included visiting the shrine of Sheikh Abdul Qader Gaylani, in the center of Kalak sudistrict of Bardardarish district, visiting the region of Kanya Zardak in Akre district, in addition to conducting interviews with some clerics, social figures and tourist who are still visiting these places for certain purposes. Some of these purposes for example, visit the Kinda Kukh area for the treatment of severe cough, located in the city center of Erbil and the city of Koya - Koisnjk and the city of Rawandz and visit the village of Dara Bzmara to treat dental pain, also visit the Kanya Zardek to treat jaundice. Through this study, the researcher reached a number of conclusions, of which that man has practiced some rituals and ritualism that were practiced by the people of Mesopotamia since ancient times, some have continued to this day, which show us that human instinct like self-defense and deportation harm on relatives has led man to observe these magical practices and rituals since ancient times.These concepts and ideas have passed over time from generation to generation and this has been demonstrated by some of the old customs and traditions and compared with some of the existing traditions within our contemporary society. This has provided us with valuable information about the ideas and beliefs of the current Kurdish society, which has its roots in ancient periods in the history of Mesopotamia, such as offering vows Tigris and Euphrates rivers that were the source of life in that geographical area, and we note the continuation of such rituals and ideas within the Kurdish community in the phenomenon of offering sacrifices to the Great Zab River in Kalak sudistrict, and in this study we try to shed scientific light on this aspect.

# شێوازەکانی نووسینی چاوپێکەوتن لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا

## توێژینەوەیەکی شیکارییە بۆ گۆڤاری ( ڕامان ) - ٢٠١٨

**پ. ی. د. ئاریانا ئیبراهیم محەمەد**
بەشی ڕاگەیاندن/ کۆلێژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

### پێشەکی

ئەم توێژینەوەیە وەك هەوڵێکی زانستی بۆ ناساندن و خستنەڕووی گرنگترین شێوازەکانی نووسینی چاوپێکەوتن لە ڕۆژنامەگەریی کوردیدا، کە لەم نێوەدا گۆڤارەکان ڕۆڵی کاریگەرییان بینیوە، لە بەکارهێنان و پەرەپێدانی زمانی نووسین و شێوازەکانی نووسینی چاوپێکەوتن و ژانرەکانی ڕۆژنامەوانییدا. لەم توێژینەوەیەدا توێژەر هەوڵی داوە، بە شێوازەکانی نووسینی چاوپێکەوتن لە گۆڤاری ڕامان ئاشنا بێت و ڕۆشنایی بخاتە سەر، بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەکانی ساڵی ٢٠١٨ دیاریکراوە، بۆ شیکردنەوەیان، ئەمەش ئەوەندە سانا نییە چونکە سەرجەم ژمارەکانی گۆڤاری ڕامان بەدەر نین لە بڵاوکردنەوەی چەندان چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی.

ئەم توێژینەوەیە لە پێشەکییەك و سێ بەش پێکدێت.لە بەشی یەکەمدا: چوارچێوەی زانستی توێژینەوەکە دیاریکراوە، و لایەنەکانی کێشەکە، سامپڵی توێژینەوەکە، پرسیارەکان و ئامانجەکان دیارکراوە. لە بەشی دووەمدا پێناسەکانی چاوپێکەوتن لە دیدی بۆچوونی چەند پسپۆڕێکی شارەزای بواری ڕۆژنامەوانی شیکراوەتەوە، لەگەڵ جۆرەکانی چاوپێکەوتن. هەروەها پرسیار و هەنگاوەکانی خۆئامادەکردن و چۆنیەتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن و قالبە هونەرییەکانی نووسینی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی خراوەتە بەرباس. بەشی سێیەم وکۆتایی تایبەت کراوە بە گۆڤاری ڕامان، کە تێدا مێژووی دەرچوون و قۆناغەکانی گەشەکردن و لایەنی هونەریی گۆڤارەکە و تایبەتمەندییەکانی

باسکراوە. لەگەڵ خشتەی شیکاری کە بۆ ژانری چاوپێکەوتنی سامپڵی توێژینەوەکە دروستکراوە. لە ئەنجامدا توێژەر بۆی دەرکەوت کە شێوازی هەرەمی رێك ستۆری زیاتر پەیرەوکراوە بۆ نووسینی چاوپێکەوتن و شێوازە ئەدەبییەکەی زاڵە بەسەر لایەنی زمان و دەربڕینی ناوەرۆکی چاوپێکەوتنەکان لە کۆتاییدا. پێشنیاز و راسپاردەکان بۆ باشترکردنی چاوپێکەوتنەکان لە گۆڤارەکە خراوەتەڕوو. لەگەڵ لیستی سەرچاوەکان.

## بەشی یەکەم: چوارچێوەی گشتی توێژینەوە

### ١- کێشەی توێژینەوە:

لە سەرجەم توێژینەوە زانستییەکاندا کۆمەڵێك هەنگاوی زانستییانە هەن بەبێ بەسەرکردنەوەیان، ئەنجامدانی پرۆسەی توێژینەوەی زانستی، کرچوکاڵ و بێ دەرئەنجام دەبێ، یەکێك لەو هەنگاوانە درككردنە بە بوونی کێشەیەکی دیاریکراو کە شایانی ئەوەبێت، توێژینەوەی زانستی لەسەر بکرێت. هەروەکو د. ئەحمەد جەمال دەڵێت "بۆ ئەوەی توێژینەوە ئەنجام بدرێت، هەر دەبێ کێشەیەکی دیاریکراو لە ئارادابێت، لەبەرئەوەی لایەنێکی گرنگە لە لایەنەکانی میتۆدی زانستی و سیمایەکی سەرەکیی جۆرەکانی سەرجەم توێژینەوەکانیشە."(ظاهر. ١٩٨٣. ٦٦). هەنگاو و رێوشوێنە زانستییەکان وادەخوازن کە ناکرێت بیرۆکەی توێژینەوەی زانستی لە بۆشاییەوە سەرچاوە بگرێت، لەبەرئەوەی دەرئەنجامەکەیشی بۆشایی دەبێت، (هەر لەسەر ئەم بنەمایەش ئەو سیما سەرەکییەی کە توێژینەوە زانستییەکان جودا دەکەنەوە، بریتین لەوەی کە گرفتێکی دیاریکراو هەبێت و پێویستی بەوە هەبێت یەکێك بە توێژینەوە و شیکاریی لایەنە جۆراوجۆرەکانی بەرەنگاریی ببێتەوە).(حسین. ١٩٩٨. ١١١). کێشەی ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە دەستنیشانکردنی شێوازەکانی نووسینی چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانی لە گۆڤاری راماندا لە ژمارە ٢٠١٨/١/٥ تا ٢٠١٨/١٢/٥.

**٢- ئامانجی توێژینەوەکە:**

هەموو توێژینەوەیەکی زانستی کە ئەنجام دەدرێت، بە مەبەستی دەستخستنی چەند ئامانجێکە، کە توێژەر بە درێژایی توێژینەوەکەی هەوڵی بۆ داوە، ئامانجەکانی ئەم توێژینەوەیەش بریتین لە:

أ- گۆڤاری ڕامان چۆن سوودی لە ژانرە ڕۆژنامەوانییەکان وەرگرتووە.

ب- بایەخپێدانی گۆڤاری ڕامان بە بڵاوکردنەوەی ژانری چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی.

ت- چۆنیەتی شێوازی نووسینی چاوپێکەوتن لە گۆڤاری ڕاماندا.

**٣- پرسیارەکانی توێژینەوەکە:**

بۆ ئەنجامدانی هەر توێژینەوەیەکی زانستی، پێویستە توێژەر وەڵامی کۆمەڵێك پرسیاری بابەتییانە بداتەوە. ئەویش لە ڕێگەی گەڕان و ماندووبوون و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان و دەستخستنی زانیارییەکاندا دەبێت، ئەو پرسیارانەش تایبەتن بە چاوپێکەوتن و تایبەتمەندی و شێوازی نووسینی چاوپێکەوتن، وەك:

أ- گۆڤاری ڕامان چ جۆرە چاوپێکەوتنێکی بڵاوکردۆتەوە؟

ب- چاوپێکەوتنەکانی گۆڤاری ڕامان، گرنگییان بە چ جۆرە کەسایەتییەك داوە؟

ت- چاوپێکەوتنەکانی گۆڤاری ڕامان، بە چ قاڵبێکی هونەری نووسینی ڕۆژنامەوانی نووسراوەتەوە؟

پ- شێوازی نووسینی چاوپێکەوتن لە گۆڤاری ڕاماندا بە چ شێوازێك بووە؟

**٤- گرنگی توێژینەوەکە:**

گرنگی و پێویستی ئەم توێژینەوەیە لەوەدا دەردەکەوێ، کە پێناسەی چاوپێکەوتن، بە تایبەت شێوازەکانی نووسین و لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی ڕوونکردنەوەی چەمکی چاوپێکەوتن و پاشانیش پەردە لەسەر جۆرەکانی و شێوازی ئەنجامدانی لادەدات، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە بزانین تایبەتمەندییەکانی و بنەماکانی و نووسینی چاوپێکەوتن چییە. بۆ ئەوەی کاتێك هەر کەسێکی

ڕۆشنفکر، یاخود هەر کادیرێکی بواری ڕۆژنامەوانی یان پسپۆڕێك بتوانێت سوود لەم توێژینەوە وەربگرێت و ئاگاداری لایەنەکانی ژانرە ڕۆژنامەوانییەکان بێت. هەڵبژاردنی گۆڤار بۆ توێژینەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو جۆرە گۆڤارانە جێگای بایەخ پێدانی ڕۆشنبیران و خوێنەرانن.

**٥- جۆری توێژینەوە:**

جۆری توێژینەوە توێژینەوەیەکی وەسفیی شیکارییە. "توێژینەوەی وەسفییەکان ئەو کاتە ئەنجام دەدرێت کە پێکهاتەی ڕێبازی یان زانستی لە بارەی بابەتەکە لەبەر دەستدا بێت"(کەرکووکی. ٢٠١٠. ١٤٤).

**٦- ڕێبازی توێژینەوەکە:**

ڕێبازی توێژینەوە " ئەو ڕیگەیە کە مرۆڤ پێی دەگاتە ڕاستی، یان ئەو ڕێبازەیە کە لە لێکۆڵینەوە و پشکنیندا بەکار دەهێنرێت ".(تالیب. ٢٠٠٧. ١٠) ئەو ڕێبازەی کە لەو توێژینەوەیەدا بەکارهاتووە میتۆدی شیکارییە بۆ زانینی شێوازی نووسینی چاوپێکەوتن لە نێو گۆڤارەکاندا، دەتوانین بەشێوەیەکی کرداری بگەین بە دەرئەنجامە زانستییەکان.

**٧- کۆمەڵگای توێژینەوە :**

"کۆمەلگای توێژینەوە تاکەکان، یان بابەتەکان، یاخود ئەو هونەرانەن کە دەچنە ژێر باری لێکۆڵینەوەوە"(کەرکووکی. ٢٠١٠. ١٤٥). ژانری چاوپێکەوتن لە گۆڤاری ڕاماندا وەك گۆمەلگای توێژینەوە دیاریکراوە لە لایەن توێژەر، توێژەر بۆیە ئەم گۆڤارەی هەڵبژاردووە، تا بتوانێت لە چاوپێکەوتنی گۆڤارە ڕۆشنبیرییەکان تێبگات، چونکە یەکێکە لەو گۆڤارانەی کە بەردەوام گرنگی بە چاوپێکەوتن داوە.

**٨-نموونە (سامپڵی) توێژینەوە:**

عەینەی توێژینەوە کە بەپێی بۆچوونی پسپۆڕانی بواری توێژینەوەی زانستی " بەشێکە لە کۆمەلگا یان ژمارەیەك حاڵەتە لە کۆمەلگای توێژینەوەکە وەردەگرێت و داتاکانی لێ کۆ دەکرێتەوە بە مەبەستی توێژینەوە تایبەتمەندییەکانی کۆمەلگای توێژینەوەکە، بەم ڕێگایەش دەتوانرێ لە ڕێگای

لێکۆڵینەوەی بەشەوە لە گشتی بکۆڵدرێتەوە، بە مەرجێك نموونەکە لە خودی کۆمەڵگاکەوە وەرگیرابێت ".(عصمت. ۲۰۰۱. ۱٥). توێژەر بۆ سامپڵی توێژینەوەکە، نموونەیەکی ڕووماڵی گشتی وەرگرتووە لە چاوپێکەوتنەکانی گۆڤاری ڕامان لە نێوان٥/١/٢٠١٨ تا ٥/١٢/٢٠١٨ کە لەم ماوەیەدا ١٢ ژمارەی لێدەرچووە.

**٩- کەرستەکانی توێژینەوە :**

فۆرمی شیکردنەوەی ناوەڕۆك.

**١٠- پلانی توێژینەوە:**

لە دوای دیاریکردنی کێشەی توێژینەوەکە و کۆکردنەوەی سەرچاوەکان، پلانی ئەم توێژینەوەیە لە شیکردنەوەی چاوپێکەوتن و جۆرەکانی، دیاریکردنی قۆناغەکانی چاوپێکەوتن. دواتر دروستکردنی خشتەی شیکاری بۆ شێوازی خستنە ڕووی ژانرە ڕۆژنامەوانییەکان، بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنەکانی گۆڤاری ڕامان وەك سامپڵی توێژینەوەی دیاریکراو شیبکەینەوە و ئاستی شێوازی نووسین و تایبەتمەندی چاوپێکەوتن دەربکەوێت.

**ئاستەنگەکانی توێژینەوە:**

هەموو توێژینەوەیەك کۆمەڵێك ئاستەنگی دێتە پێش، لەم توێژینەوەیەدا یەکێك لەو ئاستەنگانەی بەهۆی ئەوەی ژمارەکانی خولی یەکەم بە شێوەیەکی خراپ مجەلەد کرابوو، کە ببووە هۆی بڕینی پەراوێزەکانی گۆڤارەکە.

## بەشی دووەم: پێناسە و جۆرەکانی چاوپێکەوتن و شێوازەکانی نووسینی

### باسی یەکەم: چەمك و پێناسەی چاوپێکەوتن و جۆرەکانی:

#### أ– چەمك و پێناسەکانی چاوپێکەوتن:

چاوپێکەوتن بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی بواری ڕۆژنامەوانی دادەنرێت. لە زۆربەی بوارەکانی کاری ڕۆژنامەگەریدا، شارەزایی لە هونەری چاوپێکەوتندا شتێکە چاوپۆشی لێناکرێ.(شرف.٢٠٠٠. ٢٠٩). "بە پێشکەوتووترین و گرنگترین شێوەکانی ڕۆژنامەنووسی دادەنرێت و لەگەڵ دۆزینەوەی ڕۆژنامەنووسیدا، بە شێوەیەك لە شێوەکان چاوپێکەوتن دۆزراوەتەوە ".(بشیر.٢٠٠٩. ٩). ئەم هونەرە بەردەوام لە لایەن ڕۆژنامەنووسانەوە بۆ دەستکەوتنی هەواڵ و زانیاری، یان خستنە ڕووی بۆچوونێك لەبارەی بابەتێکی دیارکراودا پشتی پێدەبەسترێ.(عەلی. ٢٠٠٤. ٧٩) بە ڕای د. نسیم چاوپێکەوتن " وەك پرنسیپێکی ئەخلاقی لە پیشەی ڕۆژنامەگەریدا لە بەرژەوەندی جەماوەر یان خوێنەردایە".(الخوري.٢٠٠٩. ١٠٣). لە رووی زاراوەوە، لە زمانی کوردیدا زیاتر لە دەستەواژەیەك بەرامبەر بە چاوپێکەوتن بەکارهاتووە. ژانری چاوپێکەوتن زۆربەی جار لە ڕۆژنامەگەری کوردی بە چاوپێکەوتن، دیدار، هەڤپەیڤین، گفتوگۆ یان ئینتەرڤیو ناوی دەبرێ ئەم زاراوانە لە ڕووی بەکارهێنانەوە هەمان تایبەتمەندی و خەسڵەتیان هەیە. (سەپان. ٢٠١٢. ١٦٥). "چاوپێکەوتن، هەڤپەیڤین، گفتوگۆ، دیدار، وتووێژ، یەکێکی ترە لە هونەرە گرنگەکانی ڕۆژنامەگەری، هەندێ بنەما و خەسڵەتی تایبەت لە هونەرەکانی تری جیای دەکەنەوە. هاوکات لە ڕووی تەکنیکی کارکردندا، فۆڕم و شێوازێکی جیاواز لە هونەرەکانی تری هەیە".(بێخاڵی. ٢٠٠٦. ٧٠). وشەی چاوپێکەوتن لە ( المقابلة )ی زمانی عەرەبی، (Interview) ئینتەرڤیوی زمانی ئینگلیزییەوە هاتووە. لە زمانی عەرەبیدا چەندین زاراوە لە بەرامبەر ئەم هونەرە بەکارهاتووە، وەك ( المقابلة الصحفية). (دوملی.٢٠١٢. ١١). (الحديث الصحفي، المقابلة أو الاستجواب، أو الحوار– كما يسميه البعض – هو الشكل الصحفي) (علم الدين.٢٠٠٤. ١٩٢).لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (Interview) بەکاردێت (Potter. ٢٠٠٦. ١٧).

لە رووی واتاییەوە پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ چاوپێکەوتن نییە، بەڵکو پێناسەی جۆراوجۆری هەیە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە هەریەکە لە توێژەران و پسپۆرانی بواری رۆژنامەوانی بە جۆرێك دەڕواننە چاوپێکەوتن و لە گۆشەنیگای ئاست و تێگەیشتنی خۆی پێناسەیەکی بۆ ئەم هونەرە کردووە. بۆ نموونە چاوپێکەوتن وا پێناسە دەکرێت کە " ئەو هونەرە رۆژنامەنووسییەیە، کەوا هەڵدەستێت بە دروستکردنی ئاخافتن لە نێوان رۆژنامەنووس وکەسایەتییەك، بۆ دەستکەوتنی هەواڵ و زانیاریی نوێ، یان لێکدانەوەی گۆشەنیگایەکی دیاریکراو، یان لایەنی دانسقە و دەگمەن".(کەرکووکی،٢٠٠٨، ٧٢). یاخود چاوپێکەوتن وا پێناسە دەکەن کە جۆرێکە لە پەیوەندی بۆ خستنەڕووی بیروڕا، یان راگەیاندنی هەواڵێك بە بەڵگە و زانیاریی دیاریکراو کە رۆژنامەنووس زۆربەی جار لە رێگای گەیشتن بە کەسایەتییەکان بە دەستی دەهێنێ، یان ئەو بابەتانەی کە بیروڕای گشتی کاری لەسەر دەکات.(خزعل،٢٠١٠، ٩٣). پێناسەیەکی تر دەڵێ "چاوپێکەوتن گفتوگۆی نێوان رۆژنامەنووس و کەسایەتییەکە، ئامانج لێی دەسکەوتنی هەواڵ و زانیاریی نوێیە، یان شرۆڤەکردنی تێڕوانینێکی دیاریکراوە، یاخود نیشاندانی هەندێ لایەنی سەیر و سەمەرە و خۆشە لە ژیانی ئەو کەسایەتییە " (ابوزید، ١٩٩٠، ١٣). هەروەها (کریستین گیلەر)ی خانمە رۆژنامەوانی ئەمریکایی، چاوپێکەوتن بەوە پێناسە دەکات کە " ئەو زانیاری و بۆچوون و ئەزموونانەیە کە سەرچاوەکە لە کاتی لێدوانیدا لەگەڵ رۆژنامەوان دەیخاتە روو".(بوتر، ٢٠١٢، ٥١). دەتوانین بڵێین کە چاوپێکەوتن پەیوەندییەکە لە نێوان رۆژنامەنووسێك و کەسایەتییەك، یان چەند کەسایەتییەك، لە پێناو گواستنەوەی هەواڵ و زانیاری لە بارەی بابەتێکی دیاریکراو، لە کاتێکی دیاریکراودا کە بە لای جەماوەر جێگای بایەخە ، یان گواستنەوەی بۆچوون و ئەزموونی هەندێ لایەن و بەسەرهاتی ئەو کەسایەتییەیە بۆ خوێنەر بە مەبەستی سوود پێگەیاندنی. چاوپێکەوتن لە ڕۆژنامەگەریدا، ڕۆڵێکی گرنگ و خوێنەرێکی زۆری هەیە، زۆرجار بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی پێویست بۆ نووسینی گوتار، ریپۆرتاژ یان هەواڵ ئەنجام دەدرێ و لەزۆرکاتدا، لەشێوەی خۆشی بڵاودەکرێتەوە و دەخرێتە بەردەم خوێنەر. گەلێ جار ناوەڕۆکی ئەم چاوپێکەوتنانە، هەواڵی گرنگی لێدەکەوێتەوە و دواتر مشتومڕی زۆری لەسەر دەکرێ، بۆیە بە ناوبانگە بە ژانرێکی هەواڵی. (سەپان، ٢٠١٢، ١٦٥).

**ب- جۆرەکانی چاوپێکەوتن :**

چاوپێکەوتن بۆ چەندین جۆری جیاواز دابەشدەکرێ و هەریەك لەم جۆرانە بۆ مەبەستێك بەکار دێت. هەندێك لە توێژەران چاوپێکەوتن بە گوێرەی بابەتەکە بۆ چەندین جۆر دابەش دەکەن وەك "چاوپێکەوتنی ڕامیاری، وەرزشی، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، زانستی، ڕۆشنبیری و هونەری" (همام.١٩٨٨. ٦٥). هەندێکی تر لە توێژەرانی بواری ڕۆژنامەوانی چاوپێکەوتن بەپێی شێوەی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە یان ناوەڕۆکەکەی، دابەشی چەندان جۆری جیاواز دەکەن:

**١- لە ڕووی ناوەڕۆکەوە:**

پسپۆڕانی بواری ڕۆژنامەگەری، چاوپێکەوتن بە گوێرەی ناوەڕۆکەکەی بۆ چەندین جۆر دابەش دەکەن وەك :

أ- **چاوپێکەوتنی هەواڵی:** هەندێجار بە چاوپێکەوتنی هەواڵی و زانیاری، یان بە چاوپێکەوتنی هەواڵ و ڕاستییەکانیش ناو دەبرێت.(ادهم. ١٥٦). مەبەستی سەرەکی لە ئەنجامدانی ئەم چاوپێکەوتنە (بەدەستهێنان، وەرگرتن و دەستخستنی زانیارییە لەمەڕ هەواڵ و ڕووداوێك، ئەویش لە ڕێگەی کەسێك، یان پەیڤدەرێکی ناو ڕووداوەکە، یاخود نزیك لە ڕووداوەکە) .(بێخاڵی.٢٠٠٦. ٧٩). ئامانج لەو چاوپێکەوتنانە کۆکردنەوەی هەواڵ و زۆرترین زانیاری لەبارەی ڕووداوێکی دیاریکراو لەڕێی گەڕانەوە بۆ ئەو کەسانەی لە ڕووداوەکەدا بەشداربوونە، یان ئەو ڕووداوەیان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە چاو بینیوە.(عوض الله.١٩٩٦. ٢٠).

ب- **چاوپێکەوتن لەبارەی بیروڕا:** هەروەها بە چاوپێکەوتن لە بارەی سەرنج، یان بیروڕا، یاخود دیدو بۆچوون ناوی دەبردرێت.(ادهم.١٥٧). ئەو جۆرەی چاوپێکەوتن لایەنێکی بەرفراوانی بابەتەکە و ئەو ڕاستییانەی کە ڕۆژنامەنووس بە دوایدا دەگەڕێت دەخاتەڕوو، لە ڕۆژنامەگەری بایەخ بەو جۆرە چاوپێکەوتنانە دەدرێت، بۆ ئەوەی هەندێ بیروڕا بە دەست بهێنرێت، لە شارەزایان و پسپۆڕانی بابەتەکەوە، ئەو بابەتەش بایەخی خۆی هەیە لە لای وەرگر. (حمزة. ١٩٥٦. ٤٠١). بیروڕای ئەو کەسایەتییانە لە لایەن ڕۆژنامەنووسەکەوە بە گرنگ دەزانرێت بۆ وەرگر. ئامانج لەو چاوپێکەوتنانە (ڕاڤەکردنی ڕاستییەکان و شیکردنەوە و

سەرنجە لە بارەیانەوە و خستنەڕووی ئەو دیدەیە کە جەماوەر پێی ئاراستە دەکرێت).(ادهم،١٥٧).

ت- **چاوپێکەوتنی کەسایەتییەکان:** ئەو چاوپێکەوتنانە بە کەسایەتییەکانەوە پەیوەستن. ڕۆژنامەنووس بۆ ئەو جۆرەی چاوپێکەوتن، لە ڕێگەی دراسەکردنی جەماوەرەکەیەوە دەزانێت کە ئەوەی لەو کەسایەتییە داوا دەکرێ دەبێ چیبێ، کەسەکە کێیە چ بارودۆخێك ئەوە دەخوازێ، گرفتی ئەو هەڵوێستەی ڕۆژنامەنووس دەبێ ئاشکرای بکات لە چیدایە.(عوض الله، ١٩٩٦، ٢٦). بە ڕای د. عەبدلعەزیز شەریف ( ڕۆژنامەنووسان هەوڵ دەدەن هەمیشە لەگەڵ ناسراوترین کەسایەتی کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، یاخود سیاسیدا چاوپێکەوتن ئەنجام بدەن ).(سەیاد و ئەکبەر،٢٠١١، ١٢٢). دەشێ یەکێك لە کۆی پرسیار و وەڵامەکان لەگەڵ دەوروبەری ئەو کەسایەتییە بێت، بۆ ئەوەی ڕۆشنایی زێدەتری بخرێتە سەر. ئەم جۆرەی چاوپێکەوتن بە لایەنێکی گرنگی گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری لە گواستنەوەی هزر و ڕۆشنبیری لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دادەنرێت. (شرف، ٢٠٠٠، ٢٤٨).

پ- **چاوپێکەوتنی (تەرفیهی) خۆشی و کات بەسەربردن:** ئەو جۆرە، زۆر جار بە چاوپێکەوتنی کەسی (تایبەتی)، پرۆفایل ناوی دەبەن، هەوڵ دەدات ڕۆشنایی بخاتە سەر کەسایەتی دەستنیشانکراو و ژیانی تایبەتی ئەو کەسە، کە چیرۆکی خۆیان هەیە، چیرۆکەکەیان ورووژێنەرە.(خلیل، ٢٠١٠، ١٦٥). ئەم چاوپێکەوتنانە چێژ بە خوێنەران دەبەخشن و ئامانجی ئەو بەدواداگەڕانە لە کەسایەتی بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامبدرێ، مەسەلەی مێژووی ژیان و بەرجەستەترین لایەنی ئەو کەسایەتییە پاشان چۆن بیردەکاتەوە، چۆن ممارسەی ژیان دەکات، چی خۆشدەوێت و خەونەکانی چین، بەرچاو دەخرێت. (عوض الله، ١٩٩٦، ٤٧). ئامانج لێی خۆشی و کات بەسەر بردن و شۆخیکردنە، گرنگ نییە (چی دەوترێت)، بەڵکو گرنگ ئەوەیە (چۆن دەوترێت)، خوێنەران بۆ ڕاکردن لە بێزاری و ماندوویێتی و پەنا بۆ خوێندنەوەی ئەو جۆرە چاوپێکەوتنانە دەبەن.(ئیبراهیم و ڕەحمان، ٢٠١٠، ١٤٦).

ج– **چاوپێکەوتنی کۆمەڵی:** کە ناوی دیکەشی لێنراوە وەك چاوپێکەوتنی کۆئامێز ـ جەماعی ـ کۆڕ، ئەو جۆرە لەگەڵ یەك کەس نییە، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکە، (ادهم. ١٥٨). ڕۆژنامەنووسێك یان چەند ڕۆژنامەنووسێك چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەنجام دەدەن. ئامانج لەو چاوپێکەوتنانە ئەوەیە کە ڕۆژنامەنووس کۆمەڵێکی دیاریکراو هەڵئەبژێرێ و پرسیاریان ئاراستە دەکات، بۆ ئەوەی بگاتە وێنەیەکی ڕاست، بۆ ئەو کۆمەڵە کە لە توێژێکی دیاریکراو دەستنیشانکراون. (عوض الله. ٤١). چونکە تاکە کەس نوێنەرایەتی بیروڕای جەماوەر ناکات، بۆیە ڕۆژنامەنووسان هەوڵدەدەن پەی بە بیروڕای کۆمەڵێ کەس ببەن. (خلیل. ١٥٨).

**٢– لە ڕووی شێوەکانی سازدانی چاوپێکەوتن:**

**أ– شێوەی ڕاستەوخۆ– قووڵ:**

ئەم چاوپێکەوتنە بەشێوەی ڕووبەڕوو ئەنجام دەدرێت لە نێوان ڕۆژنامەنووس و ئەو کەسایەتییەی کە دەستنیشانکراوە، بە بێ ئەوەی هیچ هۆکارێك لەنێوانیاندا بە مەبەستی بەیەکگەیشتنیان بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە هەبێت. (عەلی. ٨٦–٨٧). " ئەم جۆرە چاوپێکەوتنانە، لە جۆرەکانی تر زەحمەتترن، چونکە پێویستە ڕۆژنامەڤان ڕووبەڕوو پرسیارەکانی ئاراستە بکات و تۆن و ئاوازی پرسیارەکان و ڕوانین و تێفکرین، هەمووی گرینگی تایبەتیی خۆیان هەیە، چونکە ئەمانە ڕێخۆشکەر دەبن بۆ ئەوەی زانیاریی پتر لە کەسی دەستنیشانکراو وەرگرێت ". (بارزانی. ٢٠١٠. ١٥٩).

**ب– شێوەی ناڕاستەوخۆ– سادە:**

ئەم چاوپێکەوتنانە بە هۆی لێك دووری لە نێوان ڕۆژنامەنووس و ئەو کەسایەتییەی کە دەستنیشانکراوە، پرۆسەکە لە ڕێگەی یەکێك لە هۆکارەکانی پەیوەندی ئەنجام دەدرێت:

١– **تەلەفۆن:** ئەو چاوپێکەوتنانە زۆرتر لە کاتی تەنگانە و لەبەر دەست نەبوونی کەسایەتییەکان ئەنجام دەدرێت. خاوەن تایبەتمەندی تایبەتە، ئامادەبوونی هەردوولا تێگەیشتنیان سەبارەت بە تەوەری چاوپێکەوتنەکە گرنگە (سدقی. ٢٠٠٨. ٢٠١).

٢- **نامە یان نووسراو:** ئەم جۆرەی چاوپێکەوتن بەشێوەی نووسراو یان شێوەی پرسیارنامە، ڕۆژنامەنووس لە ڕێگەی نامەیەکەوە پرسیارەکان بۆ ئەوکەسەی یان ئەو کەسانەی دەستنیشانکراون ڕەوانە دەکات، ئەوانیش بە نووسین وەڵامی پرسیارەکان دەدەنەوە. (بێخاڵی.٧٧). واتە چاوپێکەوتنەکە لە ڕێگای پۆستەوە، یان فاکس، یاخود نامەی ئەلکترۆنی لە لایەن ڕۆژنامەنووسەکە و ئەو کەسەی دەستنیشانکراوە ئەنجامدەدرێت. هەروەها ئێستا سوود لە پرۆگرامەکانی چات دەبیندرێت بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن .

## باسی دووەم: ئامادەکردنی چاوپێکەوتن و شێوازەکانی نووسینی:

### أ- ئامادەکردنی چاوپێکەوتن :

ئامادەکردنی چاوپێکەوتن بە سێ قۆناغی یەك بە دوای یەکدا تێدەپەڕێت تا بڵاودەبێتەوە، هەر قۆناغێك گرنگی و تایبەتمەندیی خۆی هەیە، بەپێی شێوەی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە. ((بە تاکتیکی کاری سازدانی چاوپێکەوتن دەژمێردرێن و هەر یەکەیان لە شوێنی خۆی و بە گوێرەی سەنگ و ڕەهەندەکانی ڕۆڵ و کاریگەرییان لە هونەری چاوپێکەوتن بە هەردوو دیوی ئەرێنی و نەرێنی هەیە)). (بێخاڵی. ٧٦).

**١- قۆناغی یەکەم: قۆناغی پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتن، یان ئامادەکاری بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن:**

بەرمەك بەهرەمەند رای وایە " خۆئامادەکردن مەرجی یەکەمی چاوپێکەوتنێکی باشە ".(بەهرەمەند. ٢٠١١. ٢٠٣). سەرکەوتنی ڕۆژنامەنووس لە کاتی چاوپێکەوتندا بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ شارەزایی، لێهاتوویی، ڕۆشنبیریی گشتی و ئاگاداری ڕۆژنامە نووسەکە لەسەر بابەتەکە و ئەو زانیارییانەی کۆیکردۆتەوە.(ڕۆستی. ٢٠٠٨. ١٦). بەر لە ئەنجامدانی چاوپێکەوتن ئەو کەسەی هەڵیدەبژێرین، دەبێ زانیاریی وردی سەبارەت بەو بابەت و ڕووداوانە هەبێت کە دەیانکەینە تەوەری چاوپێکەوتنەکە، یان لە نزیکەوە ئاگاداری بابەتی چاوپێکەوتنەکە بێت. (قانع. ٢٠١٢. ١١٠)" دوای وەرگرتنی کاتی چاوپێکەوتنەکە پێویستە ڕۆژنامەنووس خۆی ئامادە بکات، خوێندنەوەی خۆی بکات لەو بابەتەی بە نیازە لە بارەیەوە چاوپێکەوتنەکە ساز بکات".(عەبدولرەحمان. ٢٠٠٩. ١٢٦)

کۆکردنەوەی زانیاریی تەواو و پێویست لە بارەی بابەتەکە و ئەوکەسایەتییەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدەدرێت، رۆژنامەنووس ئاشنا دەکات بە سەرجەم گۆشە و رەهەندەکانی پەیوەست بە چاوپێکەوتنەکە و، یارمەتی دەدات لە ئامادەکردنی پرسیارەکان و جێبەجێکردنی هەنگاوەکانی داهاتووی چاوپێکەوتنەکە. (ابراهیم. ٢٠٠٥. ٦٦) ئامادەکاری رۆژنامەنووس پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتن خاڵێکی گرنگە پێویستە لە بەر چاو بگیرێت. میزوری گرووپ دەڵێ: ((رۆژنامەنووسێك کە بە بێ ئامادەکاری، چاوپێکەوتن دەست پێدەکات، وەکو فرۆکەوانێکە بەبێ رێدۆزەرەوە (جی پی ئێس) دەفرێ، لەوانەیە هەردووکیان بگەنە شوێنی مەبەست، بەڵام فرین بە کوێری، باشترین رێ نییە بۆ گەیشتن بە ئامانج)). (بارزانی.١٥٥) رۆژنامەنووس پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی وردی ئەو بابەتە بکات کە دەیەوێت چاوپێکەوتنی لەبارەوە ئەنجامبدات، لێکۆڵینەوەی پێش وەختی بابەتەکە دەبێتە هۆی ئەوەی رۆژنامەنووس بە شارەزایی و زانیارییەکی زۆرەوە رووبەڕووی کەسایەتییەکە بێتەوە، کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدەدات و سەرکەوتووتریش دەبێت لە کارەکەیدا. (رۆستی. ١٨). هەروەها ئامادەکردنی پرسیارەکان گرنگە بۆ رۆژنامەنووس، چونکە پرسیار بەردی بناغەی چاوپێکەوتنە. (دان. ٢٠٠١. ١٠٠).

ئەو رۆژنامەنووسەی کە بۆ چاوپێکەوتن دەچێ بە بێ پرسیاری ئامادەکراو، رەنگە لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا، ئەو بابەتە سەرەکییەی کە بۆی چووە ون بکات، یان ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدا، لە بابەتە ئەسڵییەکە دەربچێ، زۆر پرسیاری گرنگ لە بارەی بابەتەکە لەبیر بکرێت. (سەپان. ١٧٤). ئەوکاتانە نەبێت بە هۆی کەمیی کات دەرفەتی ئامادەکردنی پرسیار نابێت. "لە هەندێ حاڵەتدا، بوار نارەخسێ پرسیارەکان بنووسرێن، سەبارەت بە بابەتەکە و ئەو کەسەی کە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵدا ئەنجامدەدرێت، لەم حاڵەتانەدا دەبێت رۆژنامەنووسەکە پشت بە زانیاریی گشتی و ئەزموون و توانای خۆی لە کاری رۆژنامەنووسیدا ببەستێ" (قانع. ١١٢). بۆ پرسیارکردن.

**٢- قۆناغی دووەم : قۆناغی کاتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن:**

ئەم قۆناغە بەپێی شێوەی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن دەگۆڕێت (لە باسی ئامادەکارییەکانی ئەم قۆناغەدا زیاتر مەبەست لە کاتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی راستەوخۆیە ( رووبەڕوو).) ( ڕێزگرتن لە کاتی چاوپێکەوتن بە بنچینەی سەرکەوتنی ئەم هونەرە دادەنرێت).(الخوري. ١٢٣). ئامادەبوون لە کاتی دیاریکراودا یەکێك لە بنەما سەرەتاییەکانی چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانییە، رۆژنامەنووس بەم کارە لەلایەك رێز لەو کەسە دەگرێت کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجامدەدات، لەلایەکی تر خۆی تووشی شڵەژان نابێت بەهۆی دواکەوتنیەوە، دەبێ رۆژنامەنووس بە چاوێکی کراوە تەواوی گۆشە وکەنار و شێوازی رەفتار و تەرزی و وەڵامدانەوەکان لەبەرچاو بگرێت، ئەمەش هاوکاری دەکات بۆ پرسیارکردن لە کەسایەتییەکەدا. (ئابادی. ٢٠٠٥. ٨١) دڵنیابوون لە کارکردنی ریکۆردەر و کامێرا بۆ وێنەگرتنی کەسایەتییەکە. ماوەی چاوپێکەوتنەکە و مەسەلەی نووسینەوەی چاوپێکەوتنەکە بۆ کەسایەتییەکە روون بکرێتەوە، کە ڕەنگە لە لایەن ستافی نووسین لە دەزگاکەوە، چاوپێکەوتنەکە تەحریر بکرێت، بۆ ئەوەی تووشی ئیحراجبوون نەبێت، کاتێ کە بەهەر هۆیەك بوو بەشێك لە چاوپێکەوتنەکە تەحریرکرا. (عەبدولرەحمان. ١٢٧). پێش مەرجەکان رەچاوبکات و رێز لە بڕیارەکانی کەسایەتییەکە بگیرێت، گەر خوازیار بوو هەندێ زانیاری کە لە وەڵامی پرسیارەکاندا دەریدەبڕێت بڵاو نەکرێتەوە. (بارزانی. ١٦٠). "رۆژنامەنووس بۆ ئەوەی کاری چاوپێکەوتنەکەی بە باشی ئەنجام بدات، پێویستە بە وردی پلان بۆ سەرەتای چاوپێکەوتنەکە دابڕێژێت، دەستپێکی گونجاو هەڵبژێرێت بۆ بابەتەکەی و کەسایەتی بەرامبەری، بە ڕەچاوکردنی ڕەگەز، تەمەن، ناسنامە". (رۆستی. ٢١). ئەزموون و لێهاتوویی و شارەزایی رۆژنامەنووس ڕۆڵی گرنگی هەیە لە چاوپێکەوتندا.

رۆژنامەنووس بەپێی لێهاتوویی خۆی و باروذۆخ و، کەشوهەوای چاوپێکەوتنەکە و سروشتی ئەو بابەتەی دەخرێتە ڕوو، دەبێ شێوازی گونجاو بە کاربێنێ بۆ بەڕێوەبردنی دانیشتنەکە و ئاراستەکردنی پرسیارەکان، شێوازێك بێ کە ببێتە مایەی گەرموگوڕی چاوپێکەوتنەکە و دروستکردنی ورووژان و

سەرنجڕاکێشانی خەڵك . (سعيد. ٢٠٠٥. ٢٦٧) پرسیارەکان بە ڕووخۆشی ئاراستەی کەسەکە بکات، بە پرسیاری ئاسان و سادە دەستپێبکات بۆ ئەوەی زیاتر متمانە دروستبێت و ئامانجی چاوپێکەوتنەکەی بێنێتەدی، پرسیارەکان ئیجابی بن و سلبی نەبن، بەردەوام تەرکیزی لەسەر بابەتە سەرەکییەکە بێت. کاتێ هەستکرا کەسایەتییەکە لە تەوەری چاوپێکەوتنەکەدا لایداوە، بەسوودە بەشێوەکی لە ناکاو لە قسەکردن نەیپچڕێنێت، بە تەواوی گوێ لە وەڵامەکان بگرێت و ئینجا پرسیارێکی تر بکەیت، وەسەرەڕای تۆمارکردنی چاوپێکەوتنەکە بە ریکۆردەر، لە هەمانکاتدا قەڵەم و کاغەزیش بەکار بهێنرێت، بۆئەوەی تێبینی و سەرنجەکان لە وەڵامی پرسیارەکان تۆمار بکرێت، تا بتوانێت پرسیار لە وەڵامی پرسیارەکان بە دەست بهێنێت، کاتێ وەڵامەکەی پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتربوو. (عەبدولرەحمان. ١٢٨). وەکاتێ هەستکرا کەسایەتییەکە لە وەڵامی پرسیارێك خۆی دەدزێتەوە، کە وەڵامەکەی گرنگە هەوڵدرێ بە شێوەیەکی تر ئەم پرسیارە بکرێت، بەڵام بێزارکەر نەبێت. (ناسر. ٢٠٠٦. ٥٢).

**٣- قۆناغی سێیەم: دوای ئەنجامدانی چاوپێکەوتن:**

دوای ئەنجامدانی چاوپێکەوتن قۆناغێکی گرنك دەستپێدەکات ئەویش ڕێکخستنی چاوپێکەوتنەکەیە، ڕۆژنامەنووس لە ژینگەیەکی ئارامدا ئەوەی بینیویە و بیستووە دەنووسێتەوە، خوێنەر تێکەڵاوی ڕووداوەکانی چاوپێکەوتنەکە دەکات لە ڕێگەی پێشەکییەکی ئەدەبی لە شوێنی ژیانی کەسایەتییەکە یان بابەتی چاوپێکەوتنەکە، هەروەها پرسیار و وەڵامەکانی چاوپێکەوتنەکە بەپێی ئامانجی خستنەڕوو ڕێکدەخات. (ئابادی. ٨٢-٨٣). بەر لە نووسینەوەی چاوپێکەوتنەکە پێویستە ڕۆژنامەنووس دڵنیابێت لە ڕاستی و دروستیی ژمارە و ئامار و ئەو داتایانەی لە کەسایەتییەکە وەرگیراوە. (دوملی. ٦١). (دوای تەواوبوونی چاوپێکەوتنەکە، وا چاکە ڕۆژنامەنووس بە تەواوی پرسیار و وەڵامەکانی چاوپێکەوتنەکە و یاداشتەکانیدا بچێتەوە، تا دڵنیابێت کە پرسە سەرەکییەکان و زانیارییە گرنگەکان لە بیرنەکراون). (سدقی.٢١٣). بە ئاگاییەوە چاو بەدەقی ئەو چاوپێکەوتنەدا بخشێنێتەوە کە ئەنجامیداوە، تەواوی ئەو زانیارییانەی تێدا هاتووە وەربگرێت و دڵنیابێت لەوەی کە ڕوومالّی سەرجەم لایەنەکانی بابەتەکەی

کـردووە، وەڵامـی پرسـیارە جـۆراو جۆرەکـان دراوەتـەوە، وە ئەگـەر هـەر هەڵەوکەموکورییەکی تیا بینی پێویستە پەیوەندی بە کەسایەتییەکەوە بکات و تەواوی بکات. (ابراهیم.٧٤).

**ب- پرسیارەکانی چاوپێکەوتن:.**

پرسـیار بـەردی بناغـەی چـاوپێکەوتنە، وەك سـووکانی کەشـتی وایـە، کـە چاوپێکەوتنەکە بە ئاراستەی دروستدا دەبات، پرسیاری باش ڕەنگە یارمـەتیت بدات بۆ بە دەست خستنی وەڵامی چاوەڕواننەکراو، زانیاری ورد و کتوپڕ، کە پێشتر پێشبینی نەکرابێت، بەڵام پرسیاری خراپ لەوانەیە ببێتە هۆی بە فـیڕۆ چوونی ئـەو کاتـەی کـە چاوپێکەوتنەکە لەگـەڵ کەسـی دیاریکراو ئەنجامدراوە. (Potter.17) پرسیارەکان پێویستە پرسیاری ئیجابی بن نەوەك پرسیاری سلبی، پرسیارەکان بەپێی جۆری چاوپێکەوتنەکە و ئەو کەسایەتییەی دەستنیشانکراوە، لەگـەڵ جیاوازی هۆکارەکـانیش گۆڕانیـان بەسـەردادێت، پراکتیزەکردنـی بـەپێی ڕۆژنامـەنووس دەگـۆڕێ، دەکەوێتـە سـەر شـارەزایی و توانـا و بـەهرەی ڕۆژنامەنووسەکان. (ادهم.١٧٢-١٧٣). دابەشـکردنی جـۆری ئـەو پرسـیارانەی کـە ڕۆژنامەنووس ئاراستەی ئەو کەسەی دەکات کە چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازدەکات، لـە لای پسـپۆڕانی بـواری ڕۆژنامـەوانی جیـاوازن، بـەپێی ئاسـتی بیرکردنـەوە و شارەزاییان. بەشێك لـە جـۆری ئـەو پرسیارانەی لـە چاوپێکەوتنی ڕۆژنامـەوانی دەخرێنەڕوو بریتین لە:

١- **پرسیاری دەستپێك:** ئەو پرسیارەی کـە لـە سـەرەتای چـاوپێکەوتنەکە ئاراسـتەی کەسـایەتییەکە دەکرێـت، گرنگیـی زۆری هەیـە و توانـا و زیرەکـی وکەسایەتی ڕۆژنامەنووس بـۆ کەسـی بەرامبـەر بـەدیاردەخات، پرسـیاری یەکـەم گرنگە، هەروەها کەشوهەوای پرسیارەکانی تر دیاریدەکات. (ئیبراهیم و رەحمان.١٩٦).

٢- **پرسیاری ژمارەیی:** ئەو پرسیارانەیە کـە ڕۆژنامـەنووس بـە ئامـانجی بـە دەست خستنی ژمارە و داتـا، ئاراسـتەی ئـەو کەسـەی دەکـات کـە چـاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەنجام دەدات.(کەرکووکی.٨٠).

٣- **پرسـیاری وەرگرتنـی بـیروڕا:** ئـەو پرسـیارانە بەرجەسـتەترین و پـڕ بایەخترین هۆکارن، بۆ بەیەکگەیشتن و ئاراستەکردن و ڕابەریکردنی ڕۆژنامەنووس،

بۆ بەدیهێنان و دەستکەوتنی راوبۆچوونی دیاریکراوی کەسایەتییەکە لە بارەی بابەتێکی دیاریکراودا.(ادهم.٢٠٤).

٤- **پرسیاری زانیاری:** ئەو پرسیارانەن رۆژنامەنووس لە کەسایەتییەکەی دەکات، بە مەبەستی دەستکەوتنی زانیاری گشتی، سەبارەت بەو بابەتەی چاوپێکەوتنی لە بارەوە ئەنجامدراوە، یان زۆر جار بە ئامانجی وەرگرتنی هەندێ زانیاری تایبەتی و کەسی لە کەسایەتییەکە دەکرێت. (کەرکووکی.٨٠).

٥- **پرسیاری شێوە:** ئەم جۆرە پرسیارانەن لە کەسی بەرامبەردا دەکرێن لەکاتی وەڵامدانەوەیان (داخراون) واتە بەپێی ئەو هەڵبژاردنانەی کە بۆی دانراوە وەڵامەکەیان بداتەوە یان بە کراوەیی بۆی بەجێی بهێڵرێت بۆ وەڵامدانەوە.

**ت- نووسینی چاوپێکەوتن (قاڵبە هونەرییەکان):**

جۆری چاوپێکەوتن رۆڵی سەرەکی هەیە لە نووسینەوەی چاوپێکەوتن، پێویستە رۆژنامەنووس بە رێساکانی پیشەیی و ئێتیکیەوە پابەند بێت، لە خستنە رووی زانیاری، لە رووی پێویستی، راستگۆیی، دڵسۆزی و بابەتیبوونەوە. چاوپێکەوتن بە گوێرەی جۆرەکەی بە شێوەیەك دەنووسرێتەوە، وەك بڵاوکردنەوەی چاوپێکەوتنەکە (پرسیار و وەڵامەکە) بە شێوەیەکی حەرفی لەگەڵ پێشەکییەکدا، واتە بڵاوکردنەوەی وەڵامی پرسیارەکان وەکو خۆی و بە بێ هیچ دەستکاریکردنێك. (ئیبراهیم و رەحمان.٢١٧-٢١٩). یان دووردەکەوێتەوە لە شێوەی پرسیار و وەڵام، رۆژنامەنووس پشت بە زانیارییەکانی چاوپێکەوتنەکە دەبەستێت وەك بابەتێکی رۆژنامەگەری قسەکانی کەسایەتییەکە بەبێ دەستکاریکردنی مانا و مەدلولی قسەکان بۆ خوێنەر دەخرێتەڕوو، یاخود وەك تێکەڵییەك لە نێوان ئەو دوو شێوەیە زانیارییەکان لە رێی گێڕانەوەی رۆژنامەنووسیانە کە نزیك بێت لە گێڕانەوەی چیرۆکئامێز دەخرێنەڕوو، و ناوە ناوە پرسیار و وەڵامێك ئاوێتەی نووسینەکە دەبێت بۆ زیندوویتی و جووڵەی چاوپێکەوتنەکە. (قانع. ١٣٤-١٣٥). بەشێوەیەکی گشتی چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانی بە یەکێك لەم قاڵبە هونەرییانەی خوارەوە دەنووسرێتەوە .

**قاڵبی یەکەم: هەرەمی هەڵگەڕاو:** ئەم جۆرەی قاڵبی نووسینی چاوپێکەوتن، تەنها لە پێشەکی و جەستەوە پێکدێت. گرنگترین زانیاری لە پێشەکییەکەدا یان لە سەرەتادا دەخرێتەڕوو، پاشان پرسیار و وەڵامەکان لە ناوەڕۆکی چاوپێکەوتنەکە لە سەرەوە دێنە خوارەوە. (الفهد.١٩٩٢. ١١٤). دەکرێ پێشەکییەکە پێناسەیەکی پێشینەی بابەتی چاوپێکەوتنەکە و گرنگترین ئەو تەوەرانەی کە باسی دەکات لە خۆ بگرێت، یان کورتەیەك لە ژیانی کەسایەتییەکە و تایبەتمەندی پیشە و کار و بەرهەمەکانی بێت، یاخود ژمارەیەك پرسیار کە لە ناوەڕۆکی چاوپێکەوتنەکە کەسی بەرامبەر وەڵامی داوەتەوە. جەستەی چاوپێکەوتنەکەش زانیاری لە خۆدەگرێت، دەتوانرێ لەسەرەتادا ژمارە و ئاماری گرنگ بێت پاشان ئەو وەڵامانە بێت کە بۆچوونی تێدایە. (کەرکووکی. ٨١-٨٢).

**قاڵبی دووەم: هەرەمی هەڵگەڕاوی پلەیی ((متدرج)):** ئەو قاڵبەش قاڵبی هەرەمی هەڵگەڕاوی پلەیی، وەك قاڵبی هەرەمی هەڵگەڕاو لە دوو بەش پێکدێت، کە ئەویش بریتییە لە پێشەکی و جەستە. (فهمی. ١٩٦٤. ١١١). پێشەکی چاوپێکەوتنەکە گرنگترین هەواڵ و زانیاری و بیروڕا لە خۆ دەگرێت، جەستەی چاوپێکەوتنەکەش بە شێوەی بڕگەبڕگەی جۆراوجۆر دەنووسرێ و هەر بڕگەیەك کە دەخرێتە ڕوو،کورتەی لایەنێك لە لایەنەکانی چاوپێکەوتنەکەیە. (ابراهیم. ٧٨). بەپێی ڕادەی گرنگی پرسیار و وەڵامەکان ڕیزبەند دەکرێن، پرسیار و وەڵامەکان لەم قاڵبەی هونەرییەی نووسینی چاوپێکەوتن گرنگی تایبەتی خۆیان هەیە، چونکە دەبێ ئەو پرسیار و وەڵامانە بەشێوەیەك بن کە هەموو پلەکانی هەرەمە هەڵگەڕاوە پلەییەکە بگرنەوە، بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەو پرسیار و وەڵامانە، بۆ دانانی هەر بڕگەیەکی قسەکان کورتەیەکیش بخرێتە ڕوو، جا ئەو بڕگەیە و کورتەکەش لە گرنگترینەوە دەست پێدەکات تا کەمتریین گرنکی لە رووی زانیاری و بایەخپێدانەوە. (قانع.١١٧).

**قاڵبی سێیەم: هەرەمی ڕێك (ستوری):** قاڵبی هەرەمی ڕێك کە یەکێکە لە قاڵبە هونەرییەکانی نووسینی رۆژنامەنووسی، زۆرجار چاوپێکەوتنەکان بەپێی بنەماکانی ئەم هەرەمە دەنووسرێنەوە. ئەو جۆرە قاڵبە لە سێ بەش پێکدێت، سەرەتا یاخود دەستپێك کە لووتکەی هەرەمەکە پێکدێنێت، کە تێیدا وەرگر

دەخرێتــە ئامادەباشـیيەوە بـۆ خوێندنـەوەی چـاوپێكەوتنەكە، پاشـان نـاوەڕۆكی چاوپێكەوتنەكە دەنووسرێتەوە، كە لـە ئـەنجامی پرسـيار و وەڵامـەكان بەدەسـت هاتووە، دواتر بەشی كۆتـايی دەنووسـرێت، كـە گـرنگترين زانيـاری و بۆچـوون لـە چــاوپێكەوتنەكە كورتدەكرێتــەوە و دەخرێتــە ڕوو. (فـەتاح.١٧. ١٤٦). زۆر جــار خوێنەر لە سەرەتادا وا دەخرێتە ئامادەباشييەوە كە پێناسەيەكی كەسايەتييەكە، يــان تايبەتمەنديــيەكانی كەســايەتييەكە دەنووســرێت، بــەر لــەوەی پرســيار و وەڵامەكان بخرێتەڕوو لە ناوەڕۆكەكەيدا، وەك زانراوە كە ناوەڕۆكەكـەی پرسـيار و وەڵامەكان لەخۆدەگرێت. (محمد.٢٠١١. ٤٩٦).

**قـاڵبی چـوارەم: هـەرەمی ڕێكـی (سـتوری) پلـەیی:** دوايـن قـاڵبی هونـەری ڕۆژنامەنووسـی لـە نووسـينەوەی چـاوپێكەوتندا، كـە لێـرە باسـی دەكـەين قـاڵبی هەرەمی ڕێكی (ستوری) پلەييە. پێكهاتەی ئەم قاڵبەش وەك ئـەوەی پێشـوو لـە سێ بەش پێكدێت كە ئـەوانيش لـە سـەرەتا، ناوەڕۆكەكـەی و كۆتـايی پێكـدێت، دەشێت لە سەرەتادا ناساندنی كەسايەتييەكە، يان چاوپێكەوتنەكە، يان جێگاكـە بێت، يان زۆرجاريش باس لە ژيانی تايبەتی كەسايەتييەكە و بەرهەم و بابەتەكانی يـان دەسـكەوت و خەڵاتـەكانی دەكرێت. پاشـان دەقـی چـاوپێكەوتنەكە كـە بـە شێوەی برگە برگەی جۆراوجۆر دەنووسـرێ، لـە كۆتاييـدا گـرنگترين زانيارييـەكان بــاس دەكرێــت، وە زۆرجــار هەڵســەنگاندنی ڕۆژنامەنووســی بــۆ قســەكانی كەسايەتييەكە دەخرێتە ڕوو. (قانع. ١١٩–١٢٠).

## بەشی سێیەم: لایەنی شیكاری لە گۆڤاری ڕامان ٢٠١٨

### باســی يەكــەم: كورتــە مێژوويــەكی دەرچــوونی گۆڤــاری ڕامــان و تايبەتمەندييەكانی:

**أ– دەرچوونی گۆڤاری ڕامان و قۆناغەكانی:** ڕاپەڕينی بەهاری سـاڵی ١٩٩١ لەگەڵ خۆيدا چەندان ڕێكخراو و دەزگـای چـاپ و ڕۆژنامـەوانی حزبـی و حكـومی و ئەهلی هێنايە ئاراوە، بەمەش دەرگايەكی نوێ بە ڕووی ڕۆژنامـەوانی لـە باشـووری كوردستاندا كرايەوە. بـارودۆخێكی تـازە هاتـە ئـاراوە كـە بـە "دابينكردنـی مـافی ئازاديی ڕادەربڕين، بيروباوەڕی سياسی، ئاينی، نەتەوەيی، ڕۆژنامـەوانی" (لـەتيف.

٢٠٠٠. ٢٣٣). ڕەنگیداوە. دوای ڕاپەڕین کاری ڕۆژنامەوانی بەشێوەیەکی بەرفراوان بە دیارکەوت وگۆڕانکارییەکی زۆری بەسەرداهات، بەتایبەتی لەسەر ئاستی ڕۆژنامەنووسی لە ڕووی ئامێر و دەرکردن و نووسین و چاپکردن و کاری هونەری ڕۆژنامە و گۆڤاردا. ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لەو سەردەمەدا گرنگییان بە سەرجەم بوارەکان دەدا، هەروەها بەهۆی پێشکەوتنی شارستانی، ئاڵۆزبوون و فراوانبوونی ژیانی خەڵکی کوردستان، هەبوونی توانای مرۆیی و دارایی باشتر لە جاران، وایکرد ڕۆژنامەوانی هەنگاوەکانی بەرەو جۆرێك لە تایبەتمەندبوون دەست پێبکات و گرنگی تەنها بە بوارێك بدات، بۆ ئەوەی زیاتر جەماوەر تێر بکات بە بابەتەکانی. (ئەحمەد.٢٠١٠. ٥٩) چونکە ڕۆژنامەوانی گشتی نەیدەتوانی لە ئاست داخوازی سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا بێت و بتوانێت ویستی هەمووان بەدیبهێنێت. لەم نێوەدا گۆڤاری رامان وەك مانگنامەیەکی ڕۆشنبیری گشتی دەستی بە بڵاوکردنەوە کرد. یەکەمین ژمارەی بە ناوی تێڕامان لە ١١ی تەمموزی ١٩٩٦ بڵاوکراوەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ناوچەی بادینان ناوەکەی مانایەکی تری دەبەخشی بۆیە لە ژمارە دوو بەدواوە ناوەکەی بۆتە رامان. (زەنگەنە. ١٩٩٨. ٢٣٠) گۆڤاری رامان مانگنامەیەکی ڕۆشنبیری گشتییە، دەزگای ڕاگەیاندنی گوڵان لە باشووری کوردستان دەریکردووە. بە زمانی کوردی، ژمارە یەکی بە قەبارەی (٢١×٢٩،٨)سم، سەرجەم لاپەڕەکانی لە بەرگەوە بۆ بەرگ (٦٠) لاپەڕەیە.

بابەتەکانی ئەم ژمارەیە بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە فایلێکی تایبەت بە شیعری نوێی کوردی، سێ چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی (هونەری، ئەدەبی)، نۆ دەقی ئەدەبی (چیرۆك، شیعر) هەروەها حەوت ڕاپۆرتی ڕۆشنبیری، لەگەڵ مەلەفی ئافرەتان و شەش وتاری هونەری و ئەدەبی، کاریکاتێری تێدا بڵاوکراوەتەوە. لە بابەتە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری رامان دەبینین کە گرنگی تەنیا بە بوارێك دراوە، زیاتر بابەتەکانی ڕۆشنبیری، ئەدەبی و هونەرییە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە گۆڤاری رامان گۆڤارێکی تایبەتمەندە، بەپێی پۆلێنبەندی ڕۆژنامەوانی تایبەتمەند دەچێتە خانەی ئاستی دووەمی ڕۆژنامەوانی تایبەتمەند، کە ئەویش "ڕۆژنامەی تایبەتمەندی جۆرییە، پەیامەکەی ئاراستەی جەماوەرێکی دیاریکراو دەکرێت، چارەسەرکردنی ئەو بابەت و کێشانەی کە پەیوەستن بە

کەرتێکی دیاریکراوەوە." (جومعە. ٢٠١٠. ٦٥). گۆڤاری رامان کە تا ئێستاش مانگانە ژمارەیەکی تازەی بڵاودەبێتەوە، بە سێ خولی جیاواز تێپەڕیوە.

**خولی یەکەم: (١١/٧/١٩٩٦–١/٣/٢٠٠٣):** خولی یەکەمی گۆڤاری ڕامان لە ژمارە یەکەوە دەست پێدەکات و تا ژمارە هەشتاویەك بەردەوام دەبێتن، لەم خولەدا هەنگاوەکانی لە پێناو بەرەوپێشبردنی گۆڤارەکەدا بە ژمارەکانیدا دیارە. گۆڕانکاری لە شوینی چاپ و شوێنی گۆڤارەکە، بەرگ و ژمارەی لاپەڕەکانی بەرچاو دەکەوێتن، کە ئەمەش لە لایەك بە هۆی بارودۆخی ئەوکاتی کوردستان بووە، لەلایەکی تر بۆ بەرەوپێشبردنی گۆڤارەکە بووە. لە ژمارە یەکەوە گۆڤاری ڕامان خۆی وەك مانگنامەیەکی رۆشنبیری ئازاد ناساندووە. ناونیشانی گۆڤارەکە لە ژمارە دوو بە دواوە، بە بەردەوامی نووسراوە لە سەرەتادا، هاوینەهەواری سەلاحەدین، بارەگای ناوەندی راگەیاندنی گولان، ژ.ت (٧٢٨٣٥، ٧٢٢١٧ ). پاشان لە ژمارە شەشدا ناونیشانی گۆڤارەکە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. هەولێر، گەڕەکی مامۆستایان، دەزگای راگەیاندنی گولان، ژ.ت ٢١٢٢٠ هەولێر، ٧٢٩٣٠ پیرمام. لە ژمارە حەفتەوە بۆ یەکەم جار ناوی سەرنووسەر و بەڕێوەبەری نووسین نووسراوە، نرخی گۆڤارەکەش بە (١٥) دینار دیاریکراوە، وەبەم شێوەیە خۆی پێناس کردووە.

گۆڤاری ڕامان مانگنامەیەکی رۆشنبیری ئازادە. لەم هەشتاویەك ژمارەیەدا جیاوازی لە رووی قەبارە و ژمارەی لاپەڕەکانیدا لە نێوان ژمارەکانیدا بەدیدەکرێت. قەبارەی گۆڤارەکە بەشێوەیەکی گشتی (٢١×٢٩،٨)سم بووە، جگە لە چەند ژمارەیەك نەبێت (حەفتاوسێ) کە (٢٢×٣١)سم بووە. ژمارەی لاپەڕەکانیش لە بەرگەوە بۆ بەرگ لە ژمارەیەك بۆ ژمارەیەکی تر گۆڕانی بەسەر داهاتوو، وەك ژمارە دوو ١٠٢ لاپەڕە، لەکاتێکدا ژمارە نۆ ١٣٢ لاپەڕەیە، ژمارە دە ١٢٨ لاپەڕەیە، وە ژمارە سێزدە ٢٢٤ لاپەڕەیە، ژمارە بیست ٢٠٨ لاپەڕەیە، ژمارە سی ٢٥٢ لاپەڕەیە، ژمارە چل ٣٨٠ لاپەڕەیە، ژمارە پەنجا ٣٤٠ لاپەڕەیە، بەڵام لە ژمارە شێست و یەك بەدواوە ژمارەی لاپەڕەکانی بۆتە ٣٠٨ لاپەڕە تا ژمارە هەشتاو یەك، بەردەوام بووە، جگە لە ژمارە حەفتا نەبێت کە ٣٢٤ لاپەڕە بووە. ژمارەی لاپەڕەکان وەنەبێت هەر لە بەرزبوونەوەدا بێت بەڵکو زۆر جار

ژمارەی لاپەڕەكانی ژمارەیەك، كەمتر بووە لە ژمارەی لاپەڕەكانی مانگی پێشووتر. بۆ بەدیهێنانی خەون و پرۆژە ئەدەبییەكان بەردەوام ستافی گۆڤارەكە چاویان بڕیوەتە ئاسۆیەكی گەش بەردەوام دەبن لە هەنگاونان ئەگەر هیچ كۆسپێك نێتە ڕێگایان.(( ئێمە چاومان بڕیوەتە ئاسۆیەكی گەش بۆ گۆڤاری رامان، بەدیهێنانی زۆر لە خەون و پرۆژەكانمان، ئەگەر دەرفەت و هەلی گونجاو لەبارتر بڕەخسێ و كەرستە و ئیمكانیاتی زیاترمان بۆ دەستەبەر بكرێ، چونكە ئێستا نەك هەر هاوكاری ناكرێین، بگرە زۆر لە توانا مالی و ئیدارییمان كەمكراوەتەوە كە جاران كارمان پێدەكرد، ئەوەش لەگەڵ گەورەیی و قەبارەی كاركردنمان بۆ سیاسەتێكی رۆشنبیری چالاك و نیشتمانی ناگونجێ كە بیەوێ فەرهەنگی ولاتێك ببووژێنێتەوە كە گۆڤارێكی وەك رامان كاری بۆ دەكات)).(عەبدلواحید. ٦١. ٣).

**خولی دووەم: (١/٣/٢٠٠٤– ٥/٣/ ٢٠٠٥)**: لە دوای ژمارە هەشتاویەك گۆڤاری ڕامان، بە هۆی گۆڕانكاری ڕیشەیی و پرۆسەی ئازادكردنی عێراق نزیكەی ساڵێك گۆڤارەكە لە دەرچوون وەستا، ئەمەش كارێكی نەخوازراو بوو، واتە لە ئیرادە و دەسەلاتی ئێمە بە دەر بوو"(عەبدولواحید. ٢٠٠٤. ٣). لە ئاداری ساڵی ٢٠٠٤ ژمارە هەشتاودوو– هەشتاوسێ، دەرچوو كە یەكەم ژمارەی خولی دووەمی گۆڤارەكەیە، تا ژمارە سەد بەردەوام بووە. سەرەتای دەركردنی گۆڤاری ڕامان لەم خولەدا، بە ژمارەی دووانەیی دەستپێكرد، ئەمەش جیاوازە لەگەڵ خولەكانی تر، هەر دوو مانگ جارێك ژمارەیەكی دووانەیی لێدەرچووە. لەم خولەدا گۆڤارەكە وا خۆی دەناسێنێ: مانگانەیەكی رۆشنبیری گشتی ئازادە. بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ڕامان دەری دەكات. خاوەنی ئیمتیاز شەوكەت شێخ یەزدین سەرنووسەر ئازاد عەبدولواحید، سەبارەت بە ناونیشانی گۆڤارەكە لە سەرجەم ژمارەكانی ئەم خولەدا نووسراوە هەولێر– تەنیشت سینەما سەلاحەدین. پۆستی ئەلكترۆنی و ژمارە تەلەفۆنی گۆڤارەكە و سەرنووسەری گۆڤارەكە نووسراوە. جیاوازییەكی تری ئەم خولە لەگەڵ خولی پێشووتر ئەوەیە كە سوودی زیاتری لە میدیایی ئەلكترۆنی وەرگرتووە، بۆ یەكەم جار گۆڤاری رامان لە ژمارە ٩٣و٩٤دا، ئەدرەسی ئەلكترۆنی گۆڤارەكەی بلاوكردۆتەوە. گۆڤاری ڕامان وەك یەكەمین گۆڤاری رۆشنبیری لە باشووری كوردستان، هەمان ژمارەی گۆڤارە كاغەزییەكەی لە

ژێرناونیشانی (www.raman-media.net) وەك گۆڤارێکی ئەلکترۆنی بڵاوکردۆتەوە. سەبارەت بە ژمارەی لاپەڕەکانی، ژمارەکانی سەرەتای ئەم خولە ٣٢٤ لاپەڕە بووە، وەك ژمارەکانی هەشتاودوو- هەشتاوسێ، ژمارەی هەشتاوچوار- هەشتاوپێنج، پاشان لە ژمارە هەشتاوشەش- هەشتاوحەوت بۆتە ٢٠٨ لاپەڕە بەردەوام بووە تا کۆتایی خولی دووەم.

**خولی سێیەم: (٢٠٠٥/١٠/٥- تائێستا بەردەوامە):** ئەم خولە لە ژمارە سەدویەك دەست پێدەکات و تا ئێستاش بەردەوامە. لەم ژمارەیەدا کە لە ٢٠٠٥/١٠/٥ دەرچووە، لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر چاپکراوە، گۆڤارەکە مانگانەیەکی رۆشنبیری گشتییە. بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری دەریدەکات. خاوەنی ئیمتیازی شەوکەت شێخ یەزدین. سەرنووسەر: ئازاد عەبدولواحید. بابەتەکانی ئەم ژمارەیە هەروەك ژمارەکانی پێشووتر، بابەتی ئەدەبی و هونەری و رۆشنبیری تێدا بڵاوکراوەتەوە. لەم خولەدا بۆ یەکەم جار لەسەر بەرگی گۆڤارەکە مانگ و ساڵی کوردی دەنووسرێت و بەردەوام دەبێت. وەك نەریتێك ژمارە و بەرواری دەرچوون لە سەرجەم لاپەڕەکانی ناوەوەی گۆڤاری ڕامان لە هەموو ژمارەکاندا نووسراوە. سەبارەت بە ژمارەی لاپەڕەکان لەم خولەدا رێکخستن و بەردەوامبوونی رێکە، تا ژمارە سەدوپازدە ژمارەی لاپەڕەکانی ٢٠٨ لاپەڕەیە، پاشان بۆتە ٢٠٠ لاپەڕە تا ژمارە سەدوبیست و چوار. ژمارە سەدوبیست و پێنج بۆتە ١٩٢ لاپەڕە و دواتر بە شێوەیەکی جێگیر لە ژمارە سەدوبیست و شەشدا بۆتە ١٦٠ لاپەڕە، بە قەبارەی (٢١,٦×٢٨,٥)سم، و تا ئێستا بەم شێوەیە بەردەوامە. لەم خولەدا زیاتر بایەخ بە ناوەڕۆکی گۆڤارەکە و تۆکمەکردن و بەهێزکردنی دەدەن و هەوڵی چارەسەرکردنی گرفتی دابەشکردن و کێشەی چاپخانە دەدەن. لە ژمارە سەدو چل و حەفت مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان وەرگرتووە، بە ژمارە ٦٤ لە ٢٠٠٩/٦/٢٢، وە لە بەرگی ناوەوەی دواوەوە بڵاویکردۆتەوە. ئێستا گۆڤارەکە مانگانەیەکی رۆشنبیری گشتییە بەردەوامە لە دەرچوون.

**باسی دووەم: لایەنی شیکاری چاوپێکەوتنەکانی گۆڤاری ڕامان.**

چاوپێکەوتن بە یەکێك لە گرنگترین بابەتە رۆژنامەوانییەکان دادەنرێت. لە گۆڤاری ڕامان وەك یەکێك لە بابەتە رۆژنامەوانییە سەرەکییەکاندا گرنگی پێدراوە، لە سەرجەم ژمارەکاندا بوونی هەیە، بەهیچ شێوەیەك فەرامۆش نەکراوە، هەردەم وەك یەکێك لە بابەتە سەرەکییەکانی گۆڤارەکە سەیرکراوە و پانتایی بۆ تەرخانکراوە. لە سەرجەم ئەو ژمارانەی کە بڵاوکراوەتەوە، لە ماوەی ئەو حەڤدە ساڵەدا، ژمارەیەك نابینیت ( بە ژمارە تایبەتەکانیشەوە ) کە چاوپێکەوتنی تێدا بڵاو نەکرابێتەوە. لەم توێژینەوەیەدا لە ژمارەکانی نێوان ٢٠١٨/١/٥ تا ٢٠١٨/١٢/٥ بڵاوکراوەتەوە، وەك سامپڵی توێژینەوەکە وەرگیراوە بۆ شیکردنەوەی چاوپێکەوتنەکانی گۆڤارەکە لە ماوەی ئەو ساڵەدا.

خشتەی ژمارە (١): دەرخەری ژانرە رۆژنامەوانییەکان لە سامپڵی توێژینەوەدا

| جۆری سەدی بابەت دووبارە، رێژەی | دووبارە | رێژەی سەدی | ریزبەندی |
|---|---|---|---|
| لێکۆڵینەوە، بەدواداچوون | ٥٦ | ٪٤٣,٧٥ | یەکەم |
| وتار | ٥٠ | ٪٣٩,٠٦ | دووەم |
| چاوپێکەوتن | ١٧ | ٪١٣,٢٨ | سێیەم |
| نامە | ٤ | ٪٣,١٢ | چوارەم |
| راپۆرت | ١ | ٪٠,٧٨ | پێنجەم |
| هەواڵ | ٠ | ٠ | |
| کۆی گشتی | ١٢٨ | ٪١٠٠ | |

لە کۆی (١٢) ژمارەی گۆڤاری ڕامان لە ماوەی ئەم ساڵەدا، ژانری لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون زۆرترین تەرکیزی لە سەر کراوە و گرنگیی زۆری پێدراوە، پانتایی گۆڤارەکەی بە رێژەی (٪٤٣,٧٥ ) گرتووە، لە ریزبەندی یەکەم دێت. بەڵام گۆڤاری ڕامان کەمترین بایەخ و پانتایی داوە بە ژانری هەواڵ و بە رێژەی (٪٠٠). لە کاتێکدا ژانری چاوپێکەوتن جێگای خۆی کردۆتەوە، لە

ریزبەندی سێیەم دێت بە ڕێژەی (١٣,٢٨٪) پانتایی گۆڤاری ڕامانی گرتووە، لە ماوەی سامپڵی توێژینەوەکەدا.

خشتەی ژمارە (٢): دەرخستنی چاوپێکەوتن لە سامپڵی توێژینەوە

| دووبارە، ڕێژەی ژمارەی سەدی گۆڤار | دووبارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| 248 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| 249 | ٢ | ٪١١,٧٦ |
| 250 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| 251 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| 252 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| 253 | ٣ | ٪١٧,٦٤ |
| 254 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| 255 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| 256 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| 257 | ٢ | ٪١١,٧٦ |
| 258 | ٢ | ٪١١,٧٦ |
| 259 | ١ | ٪٥,٨٨ |
| کۆی گشتی | ١٧ | ٪١٠٠ |

لەو (١٢) ژمارەیەی گۆڤاری ڕامان چاوپێکەوتن بە شێوەیەکی بەردەوام و تا ڕادەیەک جێگیر بڵاو بۆتەوە.

لە هەر ژمارەیەکدا پانتاییەکی بۆ تەرخانکراوە، ئەم چاوپێکەوتنانە لە خشتەی ژمارە (٤)دا باشتر دەرکەوتووە، بۆیە دەتوانین بڵێین کە ژانری چاوپێکەوتن لە گۆڤاری ڕامان لە رووی گرنگی و بایەخ پێدانیەوە لە ریزی پێشەوە دێت. لە سەرجەم ژمارەکاندا تا ڕادەیەک لێک نزیکییەک هەیە لە رووی بڵاوکردنەوەدا .

خشتەی ژمارە (٣): جۆری چاوپێکەوتنەکان لە گۆڤاری ڕامان

| دووبارە، ڕێژەی جۆری سەدی چاوپێکەوتن | دووبارە | ڕێژەی سەدی | ریزبەندی |
|---|---|---|---|
| چاوپێکەوتنی گۆڤار | ١٤ | ٪٨٢,٣٦ | ریزبەندی یەکەم |
| چاوپێکەوتنی وەرگێراو | ٣ | ٪١٧,٦٤ | ریزبەندی دووەم |
| کۆی گشتی | ١٧ | ٪١٠٠ | |

لە کۆی ١٢ ژمارەی گۆڤاری ڕامان لە رووی چەندییەوە (١٧) چاوپێکەوتن تیایدا بڵاو کراوەتەوە، بەڵام زۆربەی چاوپێکەوتنەکان لە لایەن گۆڤارەکە، یاخود بۆ گۆڤارەکە ئەنجامدراوە . گرنگییەکی زۆریان پێدراوە و زۆرترین تەرکیزیان خراوەتەسەر و پانتایی زۆری بۆ تەرخانکراوە، بە ڕێژەی (٪٨٢,٣٦)ی سەرجەم چاوپێکەوتنە بڵاوکراوەکان پێکدەهێنێت و لە ریزبەندی یەکەم دێت. لە کاتێکدا چاوپێکەوتنە وەرگێراوەکان، کە لە زمانی بێگانەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، لە ریزبەندی دووەم دێت بە ڕێژەی (٪١٧,٦٤)ی پانتایی چاوپێکەوتنە بڵاوکراوەکان گرتووە.

خشتەی ژمارە (٤): جۆری چاوپێکەوتنەکانی گۆڤار لە رووی بابەتەوە

| دووبارە، ڕێژەی جۆری سەدی چاوپێکەوتن | دووبارە | ڕێژەی سەدی | ریزبەندی |
|---|---|---|---|
| چاوپێکەوتنی ئەدەبی | ٧ | ٪٥٠ | ریزبەندی یەکەم |
| چاوپێکەوتنی هونەری | ٦ | ٪٤٢,٨٦ | ریزبەندی دووەم |
| چاوپێکەوتنی مێژوویی | ١ | ٧,١٤ | ریزبەندی سێیەم |
| کۆی گشتی | ١٤ | ٪١٠٠ | |

لە کۆی (١٤) چاوپێکەوتنی کە گۆڤارەکە ئەنجامی داوە، چاوپێکەوتنی ئەدەبی لە ریزی پێشەوە دێت و گرنگیی زۆر و تەرکیزی زۆری خراوەتە سەر، هێندەی نیوەی چاوپێکەوتنە ئەنجامدراوەکانی گۆڤاری ڕامان پێکدەهێنێت و بە ڕێژەی (٪٥٠) چاوپێکەوتنی ئەدەبییە. چاوپێکەوتنی مێژوویی کەمترین بایەخی

پێدراوە، بەڵام چاوپێکەوتنی هونەری شان لە شانی چاوپێکەوتنی ئەدەبی دەدات و بە ڕێژەی (٤٢,٨٦٪)ی سەرجەم چاوپێکەوتنەکانی گۆڤار پێکدەهێنێت.

خشتەی ژمارە (٥): جۆری چاوپێکەوتنی ئەدەبی لە رووی کەسایەتییەوە

| دووبارە، ڕێژەی جۆری سەدی کەسایەتی | دووبارە | ڕێژەی سەدی | ریزبەندی |
|---|---|---|---|
| چیرۆك نووس | ٢ | ٢٨,٥٧٪ | ریزبەندی یەکەم |
| شاعیر | ٢ | ٢٨,٥٧٪ | ریزبەندی دووەم |
| وەرگێر | ٢ | ٢٨,٥٧٪ | ریزبەندی سێیەم |
| ڕۆماننووس | ١ | ١٤,٢٩٪ | ریزبەندی چوارەم |
| کۆی گشتی | ٧ | ١٠٠٪ | |

لەنێو ئەو چاوپێکەوتنە ئەدەبییانەدا، تا ڕادەیەکی باش کەسایەتییەکان بە یەك چاو سەیرکراوە، ئەمیش لە خشتەی ژمارە (٧) بە تەواوی بە دیار کەوتووە، کە هەر یەك لە شاعیران و چیرۆك نووسان و وەرگێڕەکان بە یەك ڕێژە دەرکەوتوون کە ڕێژەی (٢٨,٥٧٪) پێکدێنن. بەڵام تەرکیزی کەمتر خراوەتە سەر ڕۆماننووسەکان و ڕێژەی (١٤.٢٩٪) سەرجەم چاوپێکەوتنە ئەدەبییەکانی بۆ تەرخانکراوە.

خشتەی ژمارە (٦): جۆری چاوپێکەوتنی هونەری لە رووی کەسایەتییەوە

| دووبارە، ڕێژەی جۆری سەدی کەسایەتی | دووبارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| شێوەکار | ٣ | ٥٠٪ |
| گۆرانیبێژ | ٣ | ٥٠٪ |
| کۆی گشتی | ٦ | ١٠٠٪ |

لەو (٦) چاوپێکەوتنە هونەرییەی کە بڵاوکراوەتەوە لە گۆڤاری ڕامان کە تەنها گرنگی بە هونەرمەندانی شێوەکاری وگۆرانیبێژان دراوە، بە شێوەیەکی یەکسان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەمجامداوە، هەر یەکەیان ڕێژەی (٥٠٪)ی چاوپێکەوتنە هونەرییەکانی بەرکەوتووە. بەڵام لە هەمانکاتدا گۆڤاری ڕامان کەمترین بایەخی بە بوارەکانی تری وەك سینەما و شانۆ داوە، بە ڕێژەی (٠٠٪)ی پانتایی چاوپێکەوتنە هونەرییەکانی بەرکەوتووە.

خشتەی ژمارە (٧) شێوازی نووسینی چاوپێکەوتنە ئەدەبییەکان

| دووبارە، رێژەی شێوازی سەدی نووسین | دووبارە | رێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| هەرەمی رێك | ٧ | ١٠٠٪ |
| هەرەمی رێکی پلەیی | – | – |
| هەرەمی هەڵگەراوە | – | – |
| هەرەمی هەڵگەڕاوەیی پلەیی | – | – |
| کۆی گشتی | ٧ | ١٠٠٪ |

لە کۆی (٧) چاوپێکەوتنی ئەدەبی لە گۆڤاری ڕامان، دەرکەوتووە کە سەرجەم چاوپێکەوتنەکان یەك شێوازی نووسینی هونەری چاوپێکەوتنەکان ڕەچاوکراوە، ئەویش هەرەمی ڕێك (story)یە، گرنگی و بایەخێکی زۆر بەو شێوازەی نووسین دراوە، سەرجەم شێوازەکانی تری نووسینی چاوپێکەوتن تەرکیز و گرنگی پێنەدراوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە چاوپێکەوتنە ئەدەبییەکانی گۆڤاری ڕامان تەنها بە یەك شێوە نووسراوە. چونکە چاوپێکەوتنەکان زیاتر چاوپێکەوتنی کەسین و لەگەڵ کەسانی تا ڕادەیەك ناسراو لە نێو دونیای رۆشنبیری و ئەدەبیدا. شێوازی نووسینی ئەدەبیش خۆی فەرز کردووە بە سەر نووسینەوەی چاوپێکەوتنەکان.

خشتەی ژمارە (٨): شێوازی نووسینی چاوپێکەوتنە هونەرییەکان

| دووبارە، رێژەی شێوازی سەدی نووسین | دووبارە | رێژەی سەدی |
| --- | --- | --- |
| هەرەمی رێك | ٣ | ٥٠٪ |
| هەرەمی هەڵگەڕاوە | ٣ | ٥٠٪ |
| هەرەمی رێکی پلەیی | – | – |
| هەرەمی هەڵگەڕاوەیی پلەیی | – | – |
| کۆی گشتی | ٦ | ١٠٠٪ |

چاوپێکەوتنە هونەرییەکانی گۆڤاری ڕامان، بە هەر دوو شێوازی هەرەمی ڕێك، هەرەمی هەڵگەڕاوە نووسراون.

لەکۆی ئەو (٦) چاوپێکەوتنە هونەرییانەی بڵاو بۆتەوە، دەرکەوتووە کە هەردوو شێوازی هونەریی نووسینی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی، هەرەمی ڕێك و هەڵگەڕاوەیی، بە ڕێژەی ٥٠٪ چاوپێکەوتنە هونەرییەکانیان پێ نووسراوەتەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لەگەڵ شێوازی ئەدەبی، شێوازێکی تریش پانتایی بۆ تەرخانکراوە.

**ئەنجامەکان:**

لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە توێژەر گەیشتە چەند ئەنجامێك ئەوانیش:

١- چاوپێکەوتنە ئەدەبییەکان بە شێوازی نووسینی هەرەمی ڕێك (story) نووسراون.

٢- هەرەمی ڕێك و هەرەمی هەڵگەڕاوەیی لە چاوپێکەوتنی هونەری زیاتر بایەخیان پێدراوە.

٣- شێوازی نووسینی ئەدەبی زاڵە بە سەر نووسینی چاوپێکەوتنەکاندا.

٤- چیرۆکنووس، وەرگێڕ و شاعیرەکان زۆرترین بەسەرکردنەوە و چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ئەنجامدراوە.

٥- چاوپێکەوتنی هونەری لە گۆڤارەکەدا بڵاوکراوەتەوە، کە لەگەڵ هونەرمەندانی تەشکیلی و گۆرانی و مۆسیقا ئەنجامدراوە.

٦- ئەنجامدانی چاوپێکەوتنە ئەدەبی و هونەرییەکان جێگای پڕبایەخی گۆڤارەکەیە.

٧- کەسایەتی جیا جیا بۆ چاوپێکەوتنەکان دەستنیشان کراون.

**ڕاسپاردە**

بۆزیاتر بەرەو پێشەوەبردنی چاوپێکەوتن و شێوازی نووسینی لە گۆڤارەکەدا، توێژەر چەند ڕاسپاردەیەکی خستۆتەڕوو:

١- گرنگیدانی زیاتر بە چاوپێکەوتنە وەرگێڕدراوەکان، لە پێناو بڵاوکردنەوەی زیاتری زانیاری و ڕۆشنبیری هونەرمەندان و ئەدیبان و ڕۆشنبیرانی بێگانە. ئاشنابوونی خوێنەران بە شێوازی نووسینی چاوپێکەوتنی بێگانە.

٢- دانانی پلانی ساڵانە بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکان و بڵاوکردنەوەیان.

٣- هەوڵدرێت شێوازە هونەرییەکانی نووسینی چاوپێکەوتن بە خوێنەران ئاشنا بکرێت، بە پەیڕەوکردنی قاڵبە هونەرییەکانی نووسینی چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی.

٤- چاوپێکەوتنەکان سەرجەم کەسایەتییەکانی بوار و لایەنەکانی ئەدەبی و هونەری بگرێتەوە.

٥- بیرو بۆچوون و زانیاریی ڕەخنەگران، جێگای گرنگی خوێنەران و ڕۆشنبیرانە، بۆیە وا پێویست دەکات چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو توێژە لەیاد نەکرێت.

**سەرچاوەکان:**

**یەکەم: کتێبەکان/ کوردی**

١- سەعید، ئیسماعیل ئیبراهیم، ئەدەبی ڕۆژنامەنووسی کوردی بەغدا ١٩٧٠ ـ ١٩٧٤: قۆناغێکی نوێ، چاپخانەی ئیلاف، بەغدا، ٢٠٠٥.

٢- محەمەد، ئاریانا ئیبراهیم، شێوازە ئەدەبییەکانی ڕۆژنامەی خەبات: ٢٠٠٣ ـ ٢٠٠٦، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١١.

٣- کەرکووکی، حەبیب ابراهیم، هونەری ڕۆژنامەنووسی، وەرگێڕانی سەمیرە ئەحمەد، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٨.

٤- نوری بێخاڵی، ڕاگەیاندن و کاری ڕۆژنامەگەری، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦.

٥- نەجات ڕۆستی، دیمانەی ڕۆژنامەنووسی: ڕۆژنامە ـ تەلەفزیۆن ـ رادیۆ، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٦- مەنسوور سدقی، هەواڵ، ڕاپۆرت و وتووێژ، چاپخانەی دهۆك، ٢٠٠٨.

٧–مەم بورهان قانع، لە بارەی ڕاگەیاندنەوە: لێکۆڵینەوە و کۆمەڵە وتار و چاوپێکەوتنە لە بارەی ڕاگەیاندن ـ ئیتیك ـ تیۆر و ژانرەکان، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوار چرا، سلێمانی، ٢٠١.

٨–مەغدید سەپان (د.)، ئەوانەی ڕۆژنامەنووس پێویستە بیانزانێ، بەشی دووەم، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، کەرکوك، ٢٠١٢.

٩–عیماد بەشیر (د.) چاوپێکەوتن و بەدواداچوون: تەکنیکەکانی کاری مەیدانی ڕۆژنامەنووسی، وەرگێڕانی مەم بورهان قانع، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی، ٢٠٠٩.

١٠– عەبدوڵڵا زەنگەنە، ڕۆژنامەنووسی کوردی لە کوردستانی دوای ڕاپەڕین: بەدواداچوونێکی مەیدانییە، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨.

١١– عەبدولخالق ئیبراهیم ـ ئەرسەلان ڕەحمان، کارامەییەکانی نووسین: لە ڕۆژنامەگەری چاپکراو و ئەلیکترۆنیدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٠.

١٢– فریبا سەیاد ـ عەلی ئەکبەر فەرهەنگی (د.)، نەریتی ڕۆژنامەوانی، وەرگێڕانی کارزان محەمەد، چاپی سێیەم، ڕێکخراوی هەتاو، سلێمانی، ٢٠١١.

١٣–فرمان عەبدولڕەحمان، ستۆری و بنەما نێو دەوڵەتییەکانی کاری ڕۆژنامەگەری، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٩.

١٤– کاروان عەلی، هونەری ڕۆژنامەنووسی: هەواڵ ـ ریپۆرتاژ ـ گفتوگۆ ـ وتار، چاپخانە و ئۆفیسی بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٥– سوزان دان، شێوازەکانی هەڤپەیڤینی ڕۆژنامەوانی، وەرگێڕانی بەدرەدین ساڵح ـ فاتیمە حوسێن پەناهی، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

١٦–ساقی بارزانی، جۆرنالیزم: دەروازەیەك بۆ جۆرنالیزمی بەرپرسانە و ئەکادیمی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.

١٧–ڕەزا حاجی ئابادی، دەروازەی ڕۆژنامەنووسی، وەرگێڕانی کارزان محەمەد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١٨–دێبرا پۆتەر، ڕێنوێنی بۆ ڕۆژنامەوانی سەربەخۆ، وەرگێڕانی فاروق جەمیل کەریم، خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠١٢.

١٩– تالیب حوسێن (د.)، ڕێبازی لێکۆڵینەوە: ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی زانستی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٧.

٢٠- هـەڤاڵ ناسـر، ڕۆژنامـەڤان: هنـدەك پرنسـیپ و بۆچـوونێن سـەرەكی د واری ڕۆژنامەڤانیێ دا، چاپخانەیا حەجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٦.

**عەرەبییەكان:**

٢١- ظاهر، أحمد جمال (د.)، البحث العلمي الحديث، عمـان، دار الفكـر للنشـر والتوزيـع، الطبعة الثالثة، ١٩٨٣.

٢٢- اسماعيل إبراهيم (د.)، فن التحرير الصحفي: بين النظرية والتطبيق، دار الفجر للنشر والتوزيع، ط:٤، القاهرة، ٢٠٠٥.

٢٣- خضر دوملي، المقابلة الصحفية فن يتجدد، مطبعة خانى، دهوك، ٢٠١٢.

٢٤- سمير محمد حسين (د.)، تحليل المضمون، عالم الكتب، القاهرة، ١٩٩٨.

٢٥- طلعت همام، مائة سؤال عن الصحافة، الطبعة الثانية، دار الفرقان، عمان، ١٩٨٨.

٢٦- عبـدالعزيز شـرف (د.)، الأسـاليب في التحريـر الصـحفي، دار قبـاء للطباعـة والنشـر والتوزيع، القاهرة، ٢٠٠٠.

٢٧- عبـداللطيف حمـزة، المـدخل في فـن التحريـر الصـحفي، دار الفكـر العربـي، القـاهرة، ١٩٥٦.

٢٨- عبدالنبي خزعـل، فـن تحريـر الأخبـار والـبرامج في الفضـائيات التلفزيونيـة والقنـوات الإذاعية، دار النهضة العربية و بيت الحكمة، ٢٠١٠.

٢٩- عصمت عبدالمجيد، المدخل الى البحث العلمي، دار الشؤون الثقافي، بغداد، ٢٠٠١.

٣٠- غازى زين عوض الله (د.)، الأسس الفنية للحديث الصحفي، مطـابع الهيئـة المصـرية العامة للكتاب، ١٩٩٦ .

٣١- فاروق ابوزيد (د.)، فن الكتابة الصحفية، الطبعة الرابعة، الناشر عالم الكتب، القاهرة، ١٩٩٠.

٣٢- لؤى خليل (د.)، الإعلام الصحفي، دار أسامة للنشر والتوزيع الأردن، عمان، ٢٠١٠.

٣٣- محمود علم الدين (د.)، الفن الصحفي، دار أخبار اليوم قطاع الثقافة جمهورية مصـر العربية، القاهرة، ٢٠٠٤.

٣٤- محمود فهمى (د.)، فن الصحفي في العالم، دار المعارف، القاهرة، ١٩٦٤.

٣٥- محمود أدهم (د.)، الأسس الفنيـة للتحريـر الصـحفي العـام، بـدون دار النشـر وسـنة النشر.

٣٦- نسيم الخوري (د.)، المقابلة الصـحافية: فـن ـ تواصـل ـ إعـلام، الطبعـة الثانيـة، دار المنهل اللبنانى، بيروت، ٢٠٠٩.

٣٧- ياسر الفهد، مجلاتنا العربية وفن التحرير الصحفى، دمشق، ١٩٩٢.

**ئینگلیزییەکان:**

(38) Deborah Potter, Hand book of Independent Journalism, 2006.

**دووەم تێزەکان:**

٣٩- محەمەد کەریم ئەحمەد، ڕۆژنامەنووسی کوردیی تایبەتمەند، نامەی ماستەر، زانکۆی سلێمانی، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان، ٢٠١٠.

**سێیەم گۆڤار و ڕۆژنامەکان:**

٤٠- ئازاد لەتیف، چەند دێڕێك لە مێژووی نەنگینی سانسۆر لە عێراقدا، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە ٨١، سلێمانی، ٢٠٠٠.

٤١- ئازاد عەبدولواحید، گۆڤاری ڕامان...مۆمی شەشەم، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٦١، هەولێر، ٢٠٠٠.

٤٢- بەرمەك بەهرەمەند، سەبارەت بە وتووێژ و دیمانە، و. ڕەسوول سولْتانی، گۆڤاری ڕۆژنامەنووس، ژمارە ٢٣-٢٤، هەولێر، ٢٠١١.

٤٣- حەسەن فەتاح، دیدارا ڕۆژنامەڤانی، گۆڤاری ڕۆژنامەنووس، ژمارە ١٧، هەولێر، هاوینی ٢٠٠٩.

٣٩- حەبیب کەرکووکی (د.)، توێژینەوەی زانستی لە بواری ڕاگەیاندندا، گۆڤاری ڕۆژنامەنووس، ژمارە ٢٢، هەولێر، ٢٠١٠.

٤٠- سەرنووسەر، (ڕامان)ێ لە ئێستا و ئایندەدا، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٨٤-٥٨، هەولێر، ١ی مایس - حوزەیران ٢٠٠٤

٤١- سەرۆ قادر، لە ناو تەنگژەدا پەل دەکوتین، گۆڤاری تێڕامان، ژمارە ١، هاوینەهەواری سەلاحەددین، ١٩٩٦.

٤٢- سەرۆ قادر، ڕامان ڕێبازێکە لە خزمەتی ڕۆشنبیریدا، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٣٨، هەولێر، ئابی ١٩٩٨.

٤٣- سەرنووسەر، لە پەراوێزی کولتوورەوە: ڕامان ژمارە ١٠٠ی دەرچوو..کاروانەکەش هەر بەردەوامە، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ١٠٠، هەولێر، ئەیلوولی ٢٠٠٥.

٤٤- عەباس جومعە، سەرەتایەك لە بارەی ڕاگەیاندنی تایبەتمەند، گۆڤاری ڕۆژنامەنووس، ژمارە ٢١، هەولێر، هاوینی٢٠١٠.

# اساليب كتابة المقابلة في الصحافة الكوردية

## دراسة تحليلية لمجلة رامان الادبية – ٢٠١٨

أ. م. د. ئاريانا ابراهيم محمد

قسم الاعلام/ كلية الاداب /جامعة صلاح الدين– اربيل

**ملخص:** هذا البحث هو محاولة لعرض اساليب الكتابة للمقابلة الصحفية في الصحافة الكوردية وخاصة في المجلات الكوردية حيث كان لها دور كبير في تنمية وتطوير لغة الكتابة واساليبها الكتابية وفنونها التحريرية. من هذا المنطلق حاول الباحث تعريف القارئ بأهم اساليب الكتابة للمقابلة الصحفية في مجلة رامان الادبية والقاء الضوء عليها من خلال تحديد الاعداد الصادرة من المجلة خلال سنة ٢٠١٨ لتحليل اهم الاساليب الفنية المستخدمة فيها. وهذا العمل لم يكن بالسهل والبسيط لان مجلة رامان كانت احدى اهم المجلات التي اهتمت بنشر الكثير من المقابلات الصحفية الادبية.

يتضمن هذا البحث على مقدمة وثلاث اقسام او فصول، يتكون الفصل الاول من الاطار العلمي العام للبحث لكي يستطيع الباحث ان يقوم بخطوات البحث بشكل مخطط علمي ودقيق، والذي يحتوي على الجانب المنهجي للبحث من مشكلة البحث واهمية واهداف البحث واسئلة البحث وعينة البحث والعراقيل التي واجهها الباحث.

في الفصل الثاني من هذا البحث يحتوي على تعريف عام للمقابلة الصحفية بمنظور المختصين و ذوو الخبرة في هذا المجال وكذلك عرض اهم انواعها، كما بحث الباحث عن اهم الخطوات في اجراء المقابلة وكيفية اعداد الصحفي للاسئلة قبل الذهاب لمقابلة الضيف واهم الاجراءات التي يجب ان يتبعها الصحفي اثناء المقابلة. كما وضح الباحث اهم القوالب الرئيسية في كتابة المقابلة الصحفية. الفصل الثالث والاخير يتضمن الجانب التحليلي المسحي من البحث بعد عرض مقدمة تاريخية حول صدور المجلة والاشخاص العاملين فيها ورئيس تحريرها واهم المواضيع المنشورة فيها وخصائصها، قام الباحث بتحليل المقابلات فيها عن طريق اعداد جداول تحليلية حسب العينة المحددة فيها. في الختام توصل الباحث الى نتيجة البحث وهو انه اغلب المقابلات المنشورة في المجلة مكتوبة بطريقة الهرم المعتدل التقنية (القصصية) لعرض المقابلة والاسلوب الادبي طاغي على مضمونها اثناء صياغة النص. ثم يقوم الباحث بعرض اهم المقترحات والتوصيات التي تساعد على تحسين من جودة كتابة المقابلات الصحفية وكيفية كتابتها.

